# وتەکانی ژیان

گۆڕین و ئامادەکردنی
محەمەد عبدولڕەحمان زەنگنە

# بەشی یەكەم

## پێشەكی

خوێنەرە بەڕێزەكان — ئەم پەرتووكەی كە لە بەردەمی ئێوەی خۆشەویستدایە بەرهەمی گەورە پیاوانی ئەم جیهانە فراوانەیە،دەربارەی ژیانی كۆمەلاّیەتی و ئابوری وڕامیاری و هەموو لایەنەكانی ژیانە.

ووتەیەكی ئیتالّی هەیە دەلّێ ((وەرگێڕ ناپاكە)) ئەم ووتەیە ڕاستی یەكی تێدایە،چونكە وەرگێڕ زۆر جار مەبەستە ڕاستیّ كە نادات دەستەوە،بەلاّم ئەوەی كە گرنگە لە لای ئێمە بتوانین لە مەبەستەكانیان نزیك ببینەوەو گەنجینەیەكتان پێشكەش بكەین و سوودی لیّ وەرگرین.

مامۆستا محەمەد بەدری بەرنامەیەكی لە ئێستگەی كوردی بەغاوە هەبوو منیش بەشداریم دەكرد بە قسەی نەستەق و قسەی گەورە پیاوان،ئەمە وای لیّ كردم كە زۆربەی قسەبەنرخەكانی كتێبەكەی سمیر شێخانی كە بەناوی ((من حصادالفكر العالمی)) یەوەیە وەرگێڕم و لە گەلّ كۆكردنەوەی چەندەها ووتەی كە. ئەگەر چی لە گەلّ هەندیّ ڕادا نین.

لەم كاتەدا عبدالله — ی برام دەفتەرێكی هەبوو زۆر ووتەی گەورە — پیاوانی تێدا كۆ كردبووە،بەلاّم بە داخەوە ناوی سەرچاوەكانی تێدا تۆمار نەكردبوو.

بڕیارمان دا بە دوو قۆڵی ئەم بەرهەمە بچوکەتان بخەینە بەر دەستی ئێوەی بەڕێز. هیوا دارین جێ ی ڕەزامەندیتان بێت و لێمانیش ببورن ئەگەر ناتەواوی یەکی تێدا هەبوو. ئەگەر توانیمان و بۆمان لووا لە داهاتودا بتوانین ئەوەی ماوە بکەوێتە ژێر چاپەوەو ڕووناکی ببینێ و لە گەڵ کورتە ژیانێکی پیاوە گەورەکاندا.

**محەمەد عبدولڕەحمان زەنگنە**

**کەرکوك**

**١٩٨٢/٨/١**

## - ئا -

❖ ئافرەت گیرو گرفتێکە لەو گیرو گرفتانەی کە پیاو ئەبێت زۆرانیان لە گەڵدا بگرێت.

❖ ئافرەت لە هیچ مشتو مڕێکا بوار نادات، واتێ ئەگات کە نەیتوانیوە ئەوەی ئەیەوێت بۆ بەرامبەرەکەی ڕوونی بکاتەوە.

❖ ئازادی بۆ مرۆڤ نایەتە خوارەوە پێویستە مرۆڤ بۆی سەر کەوێ. ((هۆگۆ))

❖ ئادەمیزاد تاکە گیاندارێکە کە شەرم دەکا چونکە هەر ئەوە کاری وا ئەکا، جێ ی شەرمەزاری بێت.

❖ ئافرەتی ژیر ئەزانێ چۆن ئەهێڵێ ماچ کرێ، بێ ئەوەی بهێڵێ چێژی ئەو ماچە بە فیڕۆ بڕوا.

❖ ئازا ئەو کەسەیە کە لە تەنگ و چەڵەمەدا خۆی بگرێ.((ئەفلاتوون))

❖ ئادەمیزاد هەر دەمرێ تەنیا کرداری چاکەیە کەوا نامرێ.

❖ ئارام گوڵێکە لە باخی هەموو کەسێك دا ناڕوێ ((ئینگلین)).

❖ ئافرەت دوو جار لای مێردەکەی خۆشەویستە، کاتێك کە دەیخوازێ و کاتێك ○ کە دەینێژێ.

❖ ئافرەت تەنگو چەڵەمەی نی یە... چونکی ئافرەتە.

❖ ئیش کردنە بونی خۆش بە ژیان دەدا.. ((ئامیبل))

❖ ئەگەر ڕەخنە و لۆمەی دوژمنانم نەبایە، لە گەڵێ کار سەر نەدە – کەوتم و ئەگەر ڕق و کینەی ئەوان نەبایە نەم دەبردەوە. ((ریشیلیو))

❖ ئەوکەسانەی ناتوانن هوشیاری بگۆڕن لە پێشکەوتن دوور دەبن ((برناردشو))

❖ ئەوەی باوەڕی بە خۆی هەبێ،پێویستی بەوە نیە ئێمە بە شان و باڵیا هەڵبدەین. ئەویش بی یەوێ بەشان باڵیا هەڵبدەین،دیارە گومانی لە دەسەلآت و توانای خۆی هەیە. ((گۆستاو لۆبۆن))

❖ ئەگەر میللەت بەشتێ بدا زیاتر لە ئازادی،ئازادی لە کیس دەچێ.. خۆ ئەگەر ئەو شتە سامان و گوزەران بێ ئەوە پاش لە کیس چوونی ئازادی هیچی کەی بۆ نامێنێتەوە. ((سۆمەر ست مۆم))

❖ ئاشتی ڕاستەقینە لەسەر بە خۆیی وئازادی نیشتمان جیا ناکرێتەوە((هوشی منە))

❖ ئافرەتان هەمیشە نووسەرن،بەلآم کاتێك وەك نووسینەکەیان نین.. هەموو نامەیەکی دلداری کە ئەینووسن، ناگاتە ئەوەی لە کاتی دلداری و خیانەت و خۆ فرۆشتناو کامەرانیدا، بێزاریان دەری ئەبڕن.. ((مۆریس دونای))

❖ ئافرەت زۆر جار جووتێ پێلآو بە باشتر ئەزانێ لە جووتێ پیاو.

❖ ئافرەت دوو جۆرە پیاوی دەوێت، جۆرێکی ئەتوانێ بکاتە ئەو پیاوەی خۆشی ئەوێت، جۆرەکەی تری ئەتوانێ ئەو پیاوەی خۆشی بوێت دەستی بکەوێت.

❖ ئافرەت وەکو پارە وایە، پێویستە هەرگیز نەیەڵی بوەستێ، ئەگەر وەستا سوودی نامێنێ...

❖ ئافرەت لە ژیانی هونەرمەندا وەکو مۆمێکە ئەسوتێ و ڕێگای بۆ ڕووناك ئەکاتەوە. ((جۆرج ساندەر))

❖ ئافرەت بە تورە بوون چوار یەکی جوانی نامێنێ و نیوەی ژنێتی و هەموو خۆشەویستەکەیشی ئەدۆڕێنێ.

❖ ئاوانەی لە سەر شتی هیچ و پووچ ئافرەت تەلآق ئەدەن، ژن هێنانیشیان هیچ و پووچ بووە.

❖ ئافرەت بە بێ پیاو وەکو کێڵگەی بێ تووە.

❖ ئەی ئافرەتی گران بەها،وا ناڕە زایی دەر ئەبڕی بەرامبەر تاریکی هەوڵ بدە مۆمێك داگیرسێنی.
❖ ئافرەت چەند کامەرانە، چونکە شوو بە ئافرەتێکی تر ناکات.
❖ ئافرەت جەنگ (شەڕ) بە دوژمنێکی خۆی ئەزانێ.
❖ ئافرەت لە سەر خۆ قسە بۆ دەستە خوشکەکەی ئەکات،کە هیچ مرۆڤێك ناتوانێ بەو جۆرە لە گەڵیا بدوێ، ئافرەت هەموو کاتێ ووتەی ئافرەتی تر وەرئەگرێ و ئەیەوێت لە خەڵکی بشارێتەوە، بەڵام ئەگەر دیتان ئافرەتێك ئاوێنەیەکی شکاند، ئەوە بزانن تەمەنی لاوێتی بە سەر چووە.
❖ ئافرەتی جوان گەوهەرێکی بە نرخە.٠٠ بەڵام هی چاك سامانێکی گەورەیە.٠
❖ ئافرەتی ڕەوشت چاك ئەڵێت نە ٠٠ ئافرەتی سۆزدار ئەڵێت بەڵێ.٠٠ ئافرەتی یاریزان ((اللعوبة)) بەڵێ و نە ځه هەمان کاتدا ئەڵێت.
❖ ئافرەت ئەڵێ خوا ئیلهامی داوە بە ئێمە لە گەڵ زۆر پرسیار کردن.
❖ ئافرەت پیاوی بێدەنگی خۆش ئەوێت چونکی شتی شاراوەی تێدا ئەبینێ.٠٠ وا ئەزانێ کە خۆی قسەی کرد پیاوەکەی گوێ ی لێ ئەگرێ.
❖ ئافرەتی چاك قەڵایەکی گرنگە. ((ناپلیۆن))
❖ ئەو پیاوەی ئەڵێ من ئارەزووم لە ئافرەت نیە.٠
- تەنها ئارەزووی لە یەك ئافرەت نیە.٠
- ئاواز هی هەموو مرۆڤە، ئاوازیش ئەو زمانەیە، کە تەنها مۆسیقا ژەن دەتوانێ قسە لە گەڵ هەموو دڵێکا بکا.
- ئارام گرتن کلیلی بەهەشتە. ((تورکی))
- ئەوەی وولاتەکەی خۆش نەوێ، هیچ شتێکی خۆش ناوێ.((ئەللۆرد بایەرۆن))
- ئەوە کەسەی وولاتەکەی خۆش دەوێ، خوێنەکەی تۆی ئازادی یە.

■ ((تۆماس كامبڵ))

❖ ئەگەر هەموو ڕێگایەك تاقی كەیتەوە بۆ كامەرانی، لە هەمووی چاكترو باشتر و سەلامەت تر ڕێگەی ماڵەوەیە.

❖ ئەندێشە بە بێ زانیاری، باڵە بە بێ پێ. ((فەرەنسی))

❖ ئەگەر تەمەنت بە ساڵ بژمێریت زۆر كورتە، بەڵام ئەگەر بە چركە بیژمێری زۆر درێژە.

❖ ئەگەر نووسەرەكان نەخوێننەوە و خوێنەرەكان نەنووسن، ئیش و كاری ڕۆشنبیری باشتربەرەو پێشەوە دەڕوا. ((جیۆفانی باپینی))

❖ ئەگەر خۆشی، خۆشی و ژیان و ڕابواردنت دەیەوێ، ئاگاداری ئاینت بكە.

❖ ئافرەت بە تاڵایی بەر، بەرەكانی ژیان پڕ ئەكەنەوە وەكوو پووشی نەرم كە سنووقی پێ پڕ ئەكەنەوە بەڵكو ئەو شوشانەی تێدا ئەگوێزرێتەوە نەشكێ،پووش زۆر بێ نرخە هەموو شتێكیش بە بێ ئەو ئەشكێ.

❖ ئافرەت ناتوانێ پیاوی گەوج بكاتە زانا، بەڵام هەموو ئافرەتێك ئەتوانێ پیاو گەوج بكات.

❖ ئافرەت ئەو پیاوەی خۆش ئەوێت كە ئەیهێنێ و لێ ی تێ ناگا،نەك ئەو پیاوەی كە لێ ی تێ ئەگا و نایهێنێ.

❖ ئافرەت تاوانی پیاوە. ((بیلیتان))

❖ ئافرەت دوژمنی دوژمنترین ئافرەتە. ((هۆڵمن))

❖ ئافرەت پێئەكەنێ ئەگەر بتوانێ بەڵام هەر كاتێ ویستی ئەگرێ.

❖ ئافرەت پرچی درێژە بەڵام بیری زۆر كورتە. ((ڕۆسۆ))

❖ ئافرەت وەكو مناڵ وایە ئەگەر بكەویتە شوێنی ڕائەكا، ئەگەر خۆتی لێ دوور خەیتەوە ئەكەوێتە شوێنت. ((فۆلتێر))

❖ ئازایەتی ڕاستەقینە ئەوەیە چاویان لێ نەبێ و بیکەی، نەکوو بیکەی بۆ ئەوەی چاویان لێ بێ.  ((لارشیفۆ کۆڵد))

❖ ئاگات لەو پیاوە بێ کە پیاوەو چاو تێرە ئەگەر ((ئیهانە))ت کرد، ئاگات لە ناکەس بەچەبێ ئەگەر ڕێزت لێ گرت، ئاگات لە پیاوی ژیر بێت ئەگەر بێ بەشت کرد، ئاگاشت لە پیاوی کەر بێ ئەگەر گاڵتەت لە گەڵیا کرد.

❖ ئافرەت وەکو سێو وایە ئەگەر ئاگاداری خۆی نەبێ بۆگەن ئەکا.

❖ ئای ئەگەر گەنجەکان بزانن و ئای ئەگەر پیرە کان بیانتووانایە

■ ((هەنری ئەشبین))

❖ ئازادی دارێکە ئەینێژین زۆر جار خۆمان لە بەرەکەی ناخۆین.

■ ((جورج ساندەر))

❖ ئافرە ت هەڵەیەکی جوانی سروشتە

❖ ئافرەت دروست کرا بۆ توانای داحوازی یەکانی پیاو

❖ ئافرەت هەر کاتێ ویستی چاکە ئەکاو هەر کاتێکیش ویستی خرایە ئەکا.

❖ ئافرەتی ڕەوشت بەرز هەرگیز نامرێت،ئەگەر مردیش کردەوەکانی لەپاش خۆی ئەدوێن  ((فۆڵتێر))

❖ ئافرەت لە ڕێوی فێڵبازترە..  ((بەلز اك))

❖ ئافرەت وەکو کولێرەی هەویر وایە ئەبێ لە پێشا بیشێلی چونکی ناخورێ تا نەخرێتە نێو ئاگرەوە.

❖ ئافرەتی جوان و ناشیرین نی یە، بەڵام ئەوە هەیە ئافرەتێ ئەتوانێ بە باشی ئارایشت بکات ئەوی تریان ناتوانێ.

- ئافرەت  بۆ ئەوە دروست كراوە كە هەست بە واتای ژیان بكات.. چونكی ئەوە نموونەی تەواوی ناسكی یە
- ئافرەت زنجیرێكی گرنگە لە بازنەی ژیان دا.
- ئافرەت ئاوێنەیە.· هەموو پیاوێك وێنەی دڵی خۆی تێدا ئەبینێ.
- ئافرەت ناتوانێ بە جوانی پیاو بخاتە ژێر ڕكێفی خۆیەوە هەر چەندە جوانیش بێ.بەڵام ئەتوانێ بە ڕەوشتی باش و هێمن و ڕێز گرتنی، هەموو ڕوو داوێك، داگیری بكا.
- ئافرەت دڵداری ((٤٠)) ساڵ ئەشارێتەوە بەڵام كینەی یەك كات ژمێر ناتوانێ بشارێتەوە.
- ئافرەت وكو شوشەی تەنك وایە ئاگادار بە لە دەستت نەكەوێ.
- ئافرەتی بەڕێز زیاتر ئەچێتە دڵی پیاوەوە لە هی جوان.
- ئافرەت وەكو میوە وایە كە ((كەوت)) واتا كەس لە كاتی خۆیدا نەهاتووە بۆ لێكردنەوەی.
- ئافرەتی پێشكەوتوو نایەوێ كەس شتی پێ بڵێ كەچی هەمووشیان ئەبنە
- ((سكرتیرە)).
- ئافرەت ئەگەر پەرتوكێكی خوێندەوە وا بزانە مێردەكەی و كوڕەكەی خوێندۆتەوە.
- ئافرەت نهێنی یەكانی ئافرەت ئەشارێتەوە.·· چونكە ئەو لە هەموو كەس باشتر نهێنی یەكانی ئەزانێ.
- ئافرەت پردە هەموو كەس بە سەریا تێ ئەپەڕێ.

## - ئە -

❖ ئەوەی وولآت ئەفرۆشێت و خیانەت لە نیشتمانی ئەکات.٠ لەو کەسە ئەچێت لە ماڵی باوکی و برای ئەدزێ و دەرخواردی دزی ئەدا.٠٠ نە باوکی لێ ی خۆش ئەبێت و نە دزیش پاداشتی ئەداتەوە.

❖ ئەگەر جارێك لە کارێك سەر نەکەوتی مەیەڵە ئەم سەر نەکەوتنە ئامانجەکەت لە بیر بباتەوە کە هەوڵی بۆ ئەدەی.

❖ ئەموستیلەی ژن هێنان گرانترین ئەموستیلەیە لە جیهانا، چونکی خاوەنەکەی قەرزار ئەکات هەتا ماوە هەموو مانگێ ((قسط)) بدا.

❖ ئەگەر ویستت دڵداری یەکەت لە یاد بڕوا تیماری مەکە بە ((دڵداری)) یەکی تازە، تیمارکە بە شارێکی تازە.

❖ ئەگەر نەزان هۆی نەزانینی خۆی بزانیایە ئەبوو بە زانا. ((کۆنفۆشیۆس)).

❖ ئەو پیاوانەم خۆش ئەوێ کە داهاتوویان هەیە، ئەو ژنانەیشم خۆش ئەوێ کە ڕابوردوویان هەیە. (( ئۆسکار وایلد))

❖ ئیش کردن گەورەترین شتە لە جیهاندا، لە بەر ئەوە پێویستە هەندێك لە پارەی ئەو ئیشەمان کۆبکەینەوە بۆ پاشە ڕۆژ.٠

❖ ئەوەی پشتی ناهەق ئەگرێ نۆکەری زاڵمە.٠

❖ ئەو مرۆڤەی باش گوێ نەگرێ.٠ هەمیشە بیر لە شتی تر ئەکاتەوە.

❖ ئەو هۆیەی کەوا لە مێژوو ئەکا خۆیی بگێڕێتەوە بۆ زۆربەی خەڵکی چونکی یەکەم جار گوێیان لێ نەگرتبوو.

❖ ئەی ئافرەت لە گەڵما وەرە بۆ ماڵمان و ببە بە میوانم خۆشحاڵیم پێ ئەبەخشێ و ئەوەی لە تواناما هەبێ ئەیکەم بۆ ڕێز گرتنت. ((شیللی))

❖ ئەوەی ئامۆژگاری وەرنەگریٚ ناتوانریٚ یارمەتی بدریٚ. ((بنیامین فرانكلین))

❖ ئەو كەسە بەختیارە كە خاوەن سامان و بیرە. ((منیاندر))

❖ ئـەو كەسـەی چـرا لەپـشتی یـەوە داگیرسێنیٚ،سـێبەرەكەی لـە پێـشەوە ئەبیٚ. ((تاغور ))

❖ ئەگەر ژیانم وەكو بەردێكی بەنرخ بووایە ئـەمكرد بـە سـەرد پارچـەوە مـرواری یـەكم لیٚ ی دروسـت ئـەكرد و ئـەمكردە ملـت و ئەگـەر ژیـانم گـوڵێكی جـوانی بچكۆلانە بووایە ئەمپچڕاندو قژتم پیٚ ی ئەڕازاندەوە. ((تاغور ))

❖ ئەگەر بمانەویٚ نامەیەكی دڵداری بنووسین،ئەبیٚ لە ویٚ وە دەستی پێبكەین كە نازانین چی ئەڵێین و كۆتایەكەشی ئەوە بیٚ نەزانین چیمان نووسیوە.((رۆسۆ))

❖ ئەو پیاوەی شارەزایی نەبیٚ لە زمانی بێگانەدا هیچ لە زمانەكەی خۆی نازانیٚ.

❖ ئەو كسەی خۆی ئەكا بە پێشڕەوی خەڵك ئەبیٚ لە پێشا خۆی فێركات ئـەویش بە چاككردنی ڕەوشتی پێش زمانی و ببێتە مامۆستای خۆی بۆ چاك كردنی.

❖ ئەو پارەیەی كە ئێستە لە دەستایە ڕێگایە بۆ سەربەستی، بەڵام ئەو پارەیـەی كە هەوڵی بۆ ئەدەی ڕێگایە بۆ دیلێتی.

❖ ئەگەر دەوڵەمەند بووی هەموو كەس كەستە،ئەگەر كەوتی كەس ناتناسیٚ.

■ ((ئیمام عەلی))

❖ ئەگەر هەژار بووی بیر بكەرەوە كیٚ لە خۆت هەژار ترە، ئەگـەر دەوڵەمەنـدیش بووی بیر بكەرەوە كیٚ لە تۆ شایان ترە. ((چینی))

❖ ئەگەر گەوجی پێشكەوت، ژیری ئەگەڕێتەوە ((یابانی))

❖ ئەتوانی بە بەختیاری لە گەڵ هەموو ئافرەتێكدا بژیت مادام خۆشیت ناویٚ.

❖ ئەی ئافرەت یا بەیانی وەرە یا ئێوارە، ئەو كاتە وەرە كە چاوەڕوانتم، یـا ئـەو كاتە وەرە كـە چـاوەڕوانت نـیم، ئـەبینی پێـشوازی مـاچ لـە بـەر دەمتایە،بـەو جۆرەی كە دێت خۆشەویستیم بۆت زیاد ئەكا. ((تۆماس دافید))

❖ ئەوەی لە لەشمایە دروستی دەستی دایکمە و ئەوەیش ئەیزانم هونەرەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ دایکم. ((جۆن کونیسی ئادمز))

❖ ئەوەی شیعر ئەنووسێ ڕاستی هەڵدەمژێ لە دوو لێوی ژەهراوی یەوە

■ ((ولیام رۆزبنێت))

❖ ئەو ئافرەتەی دڵی بە پارەی مێردەکەی نەسوتێ، دڵیشی بە دڵداری یەکەی ناسووتێ.

❖ ئەگەر بڕوای ئافرەت بە پیاو کەل بوو، هەموو دڵداری یەکەیشی کەل ئەبێت.

❖ ئەو کەسەی کە بە پەلە هەواڵی ناخۆشی ئەگەیەنێ شتی وای پێ ئەڵێن خۆشیان نایزانین.

❖ ئەو کەسەی نەزانەو نازانێ، نەزانە ژیر نی یە لێ ی دوورکەوە بەلآم ئەو کەسەی نەزانەو ئەزانێ، نەزانە، نەفامە فێریکەن، بەلآم ئەو کەسەی کە زانایە و نازانێ زانایە، نووستووە هەڵی سێنن... بەلآم ئەو کەسەی دەزانێت کە زانایە، ژیرە دووای کەون.

❖ ئەگەر ویستت خەڵکی هەڵەکانت ببینن، وا دەست بکە بە تەمێ کردنیان.

❖ ئەگەر خوا تەنها شتێکم پێ بدا... ئەوا من سەر لە نوێ بەهارێکی تازە دەخوازم.

❖ ئازا خۆشەویستە تەنانەت لای ئەو کەسەیش کە شەڕی لە گەڵدا دەکا، ترسنۆك بێزارەو تەنانەت لای ئەو کەسەش کە دۆستایەتی لە گەڵدا دەکا.

❖ ئاگاداری فلسێ بکە، دینار ئاگاداری خۆی دەکا.

❖ ئەگەر ویستت لە پاش مردنت ناوت بمێنێ،ئەوا لەم دووانەیەکێکیان بکە، کارێکی وا بکە شایانی نووسین بێ،یان بنووسە بۆ ئەوەی شایانی مانەوە بێ.

■ ((فرانکلی))

❖ ئەگەر ناچار بووی گویٚ بە جل و بەرگ مەدە، بەلاٚم با دەرونت پاك بیٚ.

■ ((مارك تۆین))

❖ ئەگەر هەموو كەس دەوروبەری ماڵەكەی خۆی پاك كاتەوە، وا هەموو شارەكە پاك دەبیٚتەوە. ((یۆنانی))

❖ ئەوەی لە دایك دەبیٚ بۆ ئەوەی بە سكە خشیٚ بڕوا، ناتوانیٚ بفڕیٚت.((ڕوسی))

❖ ئەو دڵە خەمگینە چەند بە نرخە كە خەم ڕیٚی ئەوەی لیٚ ناگریٚ گۆرانی لە گەڵ دڵخۆشانا بڵیٚ. ((گۆتە))

❖ ئەبیٚ دایكە حەوا چەند گەلاٚ تووی لیٚ كردبیٚتەوە لە پیٚش ئەوە دا بڵیٚ ئەم گەلاٚیەم دەویٚ.

❖ ئەگەر نیشتمانم بوایە، ئەمووت نیشتمان بیٚ ئازادی و سەربەستی دانامەزریٚ ئەگینا ئەوە نیشتمان نی یە بەندینخانەیە. ((مەحمود دەرویش))

❖ ئەگەر ئەتەویٚ هەرگیز ژن نەهیٚنی قەرزار بە.

❖ ئەو دڵداریەی ئەگەر ڕۆژیٚ لە ڕۆژان كۆتایی هات ئەوە لە هیچ كاتیٚكا خۆشەویستی نەبووە. ((ئەرستۆ))

❖ ئەی بیٚ هیٚز، ناوت ئافرەتە. ((شكسپیر))

❖ ئەو ئافرەتەی ڕابووردووی هەبیٚ، پاشە ڕۆژی نی یە. ((وایلد))

❖ ئەو ئافرەتەی بە ماڵەكەی و پارەی میٚردەكەی ڕازی یە زۆر كامەرانە.

❖ ئەگەر پاویٚك ئافرەتیٚكی خۆشویست ئەڵیٚن دڵدارە... بەلاٚم ئەگەر ئارتیٚستیٚكی خۆشویست ئەڵیٚن كەرە.

❖ ئەو ئافرەتەی میٚردەكەی خۆش ئەویٚت بەشداری هەموو ئیشو كاریٚكی ئەكا.

❖ ئەو ژنە نی یە تا ئیٚستا كە ڕازی بیٚ بە مافی خۆی.

❖ ئەو پیاوەی ستایشی ئافرەت ئەكات زۆر كەمی لیٚ ئەبینیٚ : ئەویش كە ئافرەت بە جیٚ ئەهیٚڵیٚ هیچی لیٚ نازانیٚ.

❖ ئەوەندە گەوج نیم باوەڕ بکەم کە ئافرەت لێوی هەر پێشکەش تاقە یەك پیاو دەکا. ((شکسپیر))

❖ ئەو کەسەی کە ووتی ناتوانم پیێ ی بڵێ هەوڵدە، ئەو کەسەیش ووتی نازانم بڵێ فێر بە، ئەو کەسەیش ووتی ئەمە ستەمە پیێ ی بڵێ تاقی کەرەوە.

❖ ئەگەر جارێك توانیت لە کاتی ڕق هەڵساندا هێمن بیت.ئەوا ڕزگار ئەبی لە سەد ڕۆژ پەشیمانی.

❖ ئەو ڕۆژەی کە ئیش ناکەین ماندوومان ئەکا وەکو ئەو شەوەی کە تێدا ناخەوین.

❖ ئەو هونەرەی کە چەندەها ساڵە ئافرەت تێدا پێشکەوتووە، ناخۆشی ئەو پیاوەیە کە ژنەکەی پشتی پیێ بەستووە.

❖ ئەڕۆی بۆ لای ئافرەت کەواتە قەمچیەکەت لە یاد نەچیێ. ((نیێتشە))

❖ ئەڵێن ئافرەت وەکو(قماش)وایە لە بەر ڕوناکی مۆم باشتر ئەبینریێ.

■ ((جۆناثان سوینت))

❖ ئەگەر ژن نەیتوانی تۆڵە بسێنیێ وەك منالٚ ئەگریێ.

❖ ئەگەر پارە زۆر بوو چاکە کەم ئەبیێ. ((هەنری سۆرۆ))

❖ ئەو کەسانەی مردوون جێگای دڕکاوی وەکو فەرشە بۆیان.((تیۆجنیس))

❖ ئامۆژگاری کردن وەکو یارمەتی دان وایە. ((بلوتۆس))

❖ ئەو کاتەی کە بەختیارین هەمیشە باشین، بەلاٚم کە باش بین هەموو کاتێك بەختیار نین. ((ئۆسکار وایڵد))

❖ ئەوەی شانازی بە زانینی خۆیەوە بکا نەزانی خۆی دەر دەخا. ((ئینگلین))

❖ ئەو کەسەی چاکە لە گەلٚ پیاو خراپدا دەکا، دوو جار تووشی ئازار دەبیێ، یەکەم جار کە پارەکەی خەرج دەکا.٠ دووەمین جار کە هیچ سوپاس ناکریێ دەربارەی پیاوەتێکەی. ((تیۆجنیس))

- ئەگەر نەتوانی دۆست بۆ خۆت پەیدا بکەی دوژمن بۆخۆت زیاد مەکە((یۆنانی))
- ئەو شنەیەی مۆمێك دەكوژێنێتەوە، هەر ئەو شنەیەیە،کە ئاگرێ خۆش دەکا، هەروا دووری خۆشەویستی درۆ دەمرێنیّ و بەلاّم خۆشەویستی ڕاست دەژێنێ. ((راشفۆ كۆلْد))
- ئەگەر پزیشك باشی دەرمان بۆ تیمار کەران باس نەکات، کەس نایکرێت.
  - ((جاحظ))
- ئەرز بە ترسنۆکەکان خواردن دەدات، مەسلەحەت، سەرۆکایەتی هەموویانە، مرۆڤ هاو بەشی ناکات، تەنها لە کاتی ترسا یا تەماعا نەبێ.
- ئێمە برادەرو دوژمن دروست دەکەین، بەلاّم خوا هاوسێ دروست دەکا.
  - ((ج. ك. تشترتۆن))
- ئەوەی مرۆڤ کۆی کاتەوە،سروشت ناتوانێ بلاّوی کاتەوە.((ئەلدۆس هەکسلی))
- ئەگەر ئازاری سك نەبوایە، هیچ مەلێك نەدەکەوتە دوای ڕاوکەرەوە،بەلْکو خۆی داوی ندەنایەوە.
- ئەی سەربەستی هەزاران خراپە بە ناوتۆوە دەکرێ. ((مەدام رۆلاّند))
- ئەوەی بە پەلە ژن بهێنێ بە شێنەیی پەشیمان دەبێتەوە. ((گوتگریف))
- ئەگەر خۆت بوخرێنی، دەبێ نینۆکت هەبێ. ((تورك))
- ئەوەی زیاتر تێ دەکۆشێ بۆ ئەوەی وولاّتەکەی باشتر بێت،زیاتر وولاّتەکەی لە یەکێکی کە خۆشتر دەوێ. ((ڕۆبەرت ج. ئەنفەرسۆلّ))
- ئێمە لە سەدەی ئامێرداین.. بەم زوانەش هیچ نامێنێ بە دەس بیکەین تەنها خوراننی پشتمان نەبێ، بەلاّم کێ ئەمەمان بۆ موسۆگەر دەکات، ها ئەوەندەمان زانی ئامێردێك لە بەردەممانە دەبێ بۆ خورانن((مەرسیل نێمیە))
- ئەگەر من هەلّەم کرد، من هەم.
- ئافرەت وەك پەنجەی دەست وانە هەر بە ناو لە یەك ئەکەن.

❖ ئافرەت خوشكی شەیتانە.

❖ ئافرەت ئەو پیاوەی خۆش ئەوێ كە ئەیپەرستێ و ئەو پیاوەش ئەپەرستێ كە خۆشی ئەوێت.

❖ ئافرەتی جوان كامەرانی یە بۆ چاو، دۆزەخە بۆ گیان، پاك كەرەوەیە بۆ گیرفان.

❖ ئافرەت هیچ چەكێكی نیە تەنها زمانیو گریان نەبێ. ((تۆلستۆی))

❖ ئافرەت لە كاتێكا حەفتاو حەوت ڕای هەیە. ((برنارد شۆ))

❖ ئافرەت شەمەندفەرە، بە هێزی سۆز ئەڕواو ناوەستێ تەنها لە ئێستگەی دڵ نەبێ.

❖ ئافرەت خەفەت ناخوا كە نی یەتی، بەڵام خەفەت لە بونی كەسانی تر ئەخوا.

❖ ئافرەت بەر لە شوو كردن بەرخێكی هەژارە... لە پاش شوو كردن گورگەو ئەو بەرخە ئەخوا.

❖ ئافرەت ئافرەتە لە هەموو كات و شوێنێكا.

❖ ئەو كەسەی دوور دەخرێتەوە هاوڕێ ی نی یە. ((تیۆگنیس))

❖ ئەو كەسەی هەژار بێت زمان بەستراوە. ((تیۆگنیس))

❖ ئاوو ئاگر یەك ناگرن. ((تیۆگنیس))

❖ ئەی ئاسمان لێ ی گەڕێ ئەوەی چی ئیشێ دەزانێ با ئەو ئیشە بكا.

■ ((ئەرستۆ فایس))

❖ ئەو شتەی كە لە برادەر كانمانا خۆش دەوێ ئەوەیە كە ڕێزمان لێ دەگرن.

■ ((تریستان برنار))

❖ ئیتاڵیا، ئاە ئیتاڵیا، تۆ جوانی شوومیان داویتێ.

■ ((لۆرد بایەرۆن))

❖ ئەگەر چاكە لێت تێپەڕ بوو شوێنی كەوە، ئەگەر خراپە بەرەو رووت هات پێشی كەوە.

❖ ئەگەر لە یاداشت كردنا دەستت كورت بوو با لە سوپاس كردنا زمانت درێژ بێت.

❖ ئەوانەی كە ڕازین بەوەی لە قوتابخانە فێری ئەبن وەكوو ئەو منالآنەن لە گەڵ لەلە كانیانا ئەتوانن تەنها قسەبكەن.

❖ ئەوەی هەست بە سەرما بكا خۆی بە خەفەت داناپۆ شی بەڵكو بەو كەلو پەلەی كە لە بەری ئەكات، ئەو كەسەی كە باران تەڕی ئەكات خۆی بە ئەندێشە ووشك ناكاتەوە بەڵكو بە ئاگر.·· تۆیش ئەگەر توشی دەردێك یاخەفەتێك هاتی نابێ بگری و فرمێسك بڕ ێژی، بەڵكو ئەبێ بە ژیری بێ، چونكی ژیری تیماری هەموو برینێكە.

❖ ئەو كات ژمێرانەی كە چاوەڕوانی بەختیارین، گەلێك لەوە خۆشترە كە دەبینیین. ((ئۆلیفەر گلۆڵد سمیث))

❖ ئەوەی شێر بكوژێ دەیخوا، ئەوەیش نەیكوژێت دەخورێت.

❖ ئەوەی دوو بەرەكی لە گەڵ كەرە كەیدا بكات، دەبێتە كەر.

❖ ئەو بشیلە یەی دەمیاوێنێ، زۆر ڕاو ناكا. ((ئەسپانی))

❖ ئەو دارەی میوەی گرتبێ، بەردی تێ ناگیرێ· ((توركی))

❖ ئەوەی زۆر پێكەنی، زۆریش دەگری.

❖ ئەو شتەی بیكڕیت و پێویستیت پێ ی نەبێ وەكو دزی لە خۆت بكەی وایە.

❖ ئەكەر ڕێكەو تن نەبێ با جیا بوو نەوە هەبێ.

❖ ئەوماڵەی دڵ ڕەقی تێدا هەبێ، ئایا هەموو كات بای سارد لەوێ نیە ؟

○ ((ئۆسكار وایڵد))

❖ ئەوەی چاكە یكات، سوپاس دەدورێتەوە.

- ئەم جیهانە هیچ تەواو نی یە، پارە دەداتە نەزان، زنیاری دەداتە ژیر، لە کاتێکانە نە نەزان بەو پارەیەی سوودبە مۆڤ دەگەیەنێ و نە ژیریش، مرۆڤ بە شوێن زانیاری یە کەیا دەکەوێ.
- ئێمە تەواویمان لا گرنگ نی یە، ئەوەی لامان گرنگە، رێگەی کەیشتن بە تەواوی یە.
- ئەو خەڵکە دایکیان بە ئازادی هێناو نیەتەدونیا، ئیتر ئێوە چۆنتان بە کۆیلەی خۆتان کردن. ((عومەری کوڕی خەتاب))
- ئەگەر سەر پشك بم بۆ هەڵبژاردنی جوانی و ڕاستی، سێ و دووی لێ ناکەم و جوانی هەڵدەبژێرم، باوەڕیشم وایە کە جوانی خۆی زیاتر دەڕۆم و دەڵێم لەم جیهانەدا شتێکی ڕاست نیە تەنها جوانی نەبێ.
- ئەو کاتەی کتێب کۆدەکەینەوە،واتە بەختیاری کۆدەکەینەوە.

■ ((فنسنت ستاریت))

- ئەوەی هەر ڕۆژەی ڕۆژنامەیەك نەخوێنێتەوە، بە نەزانی دائەنێم.((غاندی))
- ئەو ئافرەتەی دوێنێ لە بەر دەمتا ئەگریا، سبەینێ وات لێ ئەکات لە بەردەمیا بگری.
- ئەی دڵدارەکان مەدووێن با ماچەکانتان دووان بێت.
- ئەگەر خۆشەویستەکەت لە کاتی خۆیدا هات بۆ لات ئەوا ڕاست گۆیە...بەڵام ئەگەر لە پێشدا هات ئەوا شێت بووە.. ئەگەر دووا کەوت ئەوە زۆرزانە.
- ئەو گەنجانەی کە پەلەی ژن هێنانیانە وەك ئەو ماسیانەن کە بە بەر تۆڕی ماسی گردا هاتو چۆ ئەکەن... ئەمیان هەر خەریکی هاتوچۆیە، بەڵام ئەوماسی یەی کە بە تۆڕەکەوەیە پەلە قاژێی ڕزگار بوون ئەکات

■ ((سوقرات))

❖ ئەو پیاوەی کە لە ناکاوا ئافرەت ماچ ئەکات و داوای لێ بووردنی لێ ئەکات، وەکو ئەوەیە سرکەی باتێ لە جێ ی شەمپانیا.

❖ ئەوەی کە ئەیزانم و وەرم گرت، بەڵێنی خۆشەویستە، کە بە ((وەفایە))بۆ خۆشەویستەکەی، تەنکترە لە تەونی جاڵجاڵۆکە.

❖ ئەو پیاوانەم خۆش ئەوێ کە پاشە ڕۆژیان هەیە، ئەو ئافرەتانەش کە ڕابوردویان هەیە..

❖ ئەگەر وتمان ئافرەت هێزە.. هێزی سروشتی کە واتە باوەڕ بەوە ئەکەین لە پیاو بەرزترە..

❖ ئەگەر ویستت گڕی دڵداری لە دڵی مرۆڤێکا بکوژێنیتەوە، پاڵی پێوەنێ بۆ قومار کردن.

❖ ئەو میللەتە ناژی کە ناوی گەورەکانی نەژێنێ.

❖ ئەگەر فێڵباز ڕەوشتی باش کات ئەبێتە، گەورەترین ڕامیاری جیهان.

■ ((ئەرستالیس))

❖ ئافرەتی جوان ئەندێشەیە و ئافرەتی نابووت ڕاستی یە. ((شوبنهاور))

❖ ئافرەتی ڕاستەقینە ئەتوانێ جوانی دروست کات لە دڵی پیاودا ئەگەر جوانیش نەبێ...

❖ ئەگەر پیاو دەستی خستە ئیشی ئافرەتەوە، تاوانباری ئەکات بە دکتاتۆریەت و سەلماندنی ئارەزووی، ئەگەر دەستیشی نەخستە ئیشی یەوەو پرسیاری لێ نەکرد، تاوانباری ئەکا بەوەی فەرامۆشی ئەکاو بەشداری خۆشی و ناخۆشی ناکات.

❖ ئەگەر ئەتەوێ خێر لە گیانت ببینی لە پێناوی خەڵکدا ببەخشە، دەنکە گەنمێك ئەگەر لە زەویدا نەهاوێژێ هەر دەنکە گەنمێکە و هەرگیز ناڕوێ تا سوود بە کۆمەڵ بگەیەنێ. ((هیگڵ))

❖ ئەو کەسەی لێ بووردنی نیە لە گەڵ خەڵکدا، بە دەستی خۆی ئەو پردە ئەڕوخێنێ کە ئەبێ ڕۆژێ لە ڕۆژان بە سەری دا بپەڕێتەوە. ((گۆتە))

❖ ئەو پیاوە زۆر نەفامە کە هەموو شتێکی خۆی لای ژنەکەی ئەدرکێنێ..

- ب -

❖ بای ئەجل هات و لە ناكاو دەفتەری ژینی دڕیم تاكو دوێنێ خونچە بووم ئەمڕۆ بە ناحەق هەڵ وەریم وەك بروسكە نەونەمامێ داڕنێ وەختێ چڕۆ هات و گوڵلەی وێڵ لە ناكاو بێ گوناە جەرگی بڕیم ((هەردی))

❖ بە پارە دەتوانین هەموو شتێكمان دەس كەوێ، تەنها ئەخلاق و جەماوەر نەبێ

((جان جاك رۆسۆ))

❖ بۆ یەكەم جار كە كتێبێك دەخوێنمەوە واتە هاوڕێ یەكی تازەم گرتووە، ئەگەر ڕێكەوت بۆ جارێكی تر كتێبێكم خوێندبێتەوە، واتە بۆ جاری دووەم چاوم بە هاوڕێ كەم كەوتووە. ((ئۆلیڤەر گۆڵد سمیس))

❖ بە درۆی پیاوی گەرە دەڵێن سیاسەت.

❖ بڕوام كرد هیچ شتێك نیە بە قەد یاد كردنەوە ئازار كێش بێ. ((ئارا گۆن))

❖ بیر لە پاشە ڕۆژ كردنەوە ئافرەت بێزار دەكات تا شوو دەكات، پیاویش لە پاش ئەوەی ژن ئەهێنێ.

❖ بە هێزترین خۆشەویستی، خۆشەویستی نیشتمانە. ((ئەبڕاهام لینكۆڵن))

❖ بێگانە بكە بە دۆست چاكترە لە وەی دۆست بكەی بە بێگانە. ((ئینگلیز))

❖ بایی بوو، وەك ئەو كەڵەشێرە وایە، وا دەزانێ ڕۆژ هەڵنایە تا گوێ ی لە دەنگی خوێندنی ئەو نەبێ (بایكۆن).

❖ باوەڕ كردن بەوەی كە شتێكی تر هەبێ جگە لە چاكە كردن كە مرۆڤ لە خواوە نزیك بخاتەوە شتێكە درۆیە. ((كانت - ی ئەلمانی))

❖ بایی بوون ئەو دەرما نەیە كە ئازاری گەوج كەم دەكاتەوە.

❖ بایی بوون و تڕ زلی هۆی سووك بوونە. ((جۆنسۆن))

❖ بێ دەنگی جۆریکە لە هونەری گفتو گۆ.

❖ برسێتی لە پێاوی ئازادی دا گەڵێ چاکترە لە تێری بەرسێبەری بەندێتیدا.

❖ بڕوانە،گوێ بگرە، بێ دەنگك بە، لە ئاشتی و ئارام دا دەژیت ((ئینگلیز))

❖ بە درێژایی ژیانم لە تەلەفزیۆندا پرۆگرامی خراپم نەبینیوە، چونکی حوا باڵێکی پێ داوم، دەتوانم بیکوژێنمەوە.((جاك بار))

❖ باشی و چاکە لە پارەوە نایەت، بەڵکو چاکەو باشە پارە پەیدا دەکا..

((سو قرات))

❖ باوەڕ هێنان بە ڕەوای چەك خۆ بردنە بەرەو وێران. ((کرۆنن))

❖ بە قەد ئەوەی زانایەتی مرۆڤ گەورەیەو بە هێزە، زیاتر بە هێزتر دەبێ بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی.

❖ بە هاوڕێتی پیاو خراپان، تۆش دەبی بە پیاو خراپ.

❖ بە ئەرستۆیان ووت : جوانیمان بۆ لێکدەرەوە

ووتی :ـ لەم مەسەلەیە گەڕێن بۆ کوێرەکان.

❖ بە تەنها ڕێ بکەی چاترە لەوە ی هاوڕێتی هاوڕێ ی بەد بکەی.((ئەفریقی))

❖ بۆیە، پەند، ناوی تراوە پەند، لەبەر راستی یەتی.((ئینگلیز))

❖ بۆیە دوو گوێ و یەك زمانمن دراوەتێ، تاکو دوو ببیستین و یەك بڵێین.

((دیۆگینیس))

❖ بوون دۆست پەیدا دەکا، نەبوون تاقییان دەکاتەوە.((بیلیس))

❖ بەڕەوشتی دایك کچت بۆ دەردەکەوێ. ((نەرەنسی))

❖ بمرەو ماچێك بە نا بە دڵی مەدە. ((جرتیشفکی))

❖ بەد ناو کودن و سووك کردنی خەڵکی چەکی نامەردانە.((فەرەنسی))

❖ با پاشاش بم، هەر نیشمان پەروەرم. ((ناپلیۆن))

برۆن بەرەو مردن، ڕەنگە چاو نەترسێك رزگاری بێت لە مـردن و رەنگـە ترسـتۆكێك لە ماڵی خۆیدا بمرێ، پێشمەرگەكان گیانی خۆیان فرۆشت بۆ كڕینی بەهەشت.

((ئیمامی عەلی))

❖ بیر كەرەوە ئەوەیە، كە لە جیهانی بێ دووابیدا مەلەوانی دەكات.

❖ بێدەنگی لە چەنە بازەوە فێر بـووم و هەوڵـدان لـە تەمەڵـەوە، هێمنـی لـە لووت بەرزەوە، زۆر سەیرە من رێزی ئەم مامۆستایانە ناگرم.

❖ بیر كردنەوە لە یەزدان، ئیشە. ((جوزێف جۆبێر))

❖ باوكە ئادەم و دایكە حەوا، سێویان خـوارد كـە چـی ئێمـە داوای لیـستەی پارەكەی دەكەین ((ئەڵەمان)).

❖ بلیمەت، ئەو پیاوەیە هەموو شتێك دەتوانێ بكـات، تـەنها پەیـدا ـ كردنـی مووچەكەی نەبێت.

❖ بە عارەبانە ناتوانین سەر كەوینە ئاسمان. ((ئەسپان))

❖ بیرو باوەڕ، هەر بیرو باوەڕە، گەر چی خوێنیش وەكـو جۆگـە لـە رێ بكـا ((ردیارد گبانگك))

❖ بۆ شێت هەموو رۆژێك جەژنە. ((تورك))

❖ بیر لە هەموو قسەیە قووڵ ترە، هەست كردنیش لە هەموو بیرێ قووڵترە.

((نیێتشە))

❖ با ئامانجی هەمووومان وولاتەكەمان بێت و هیچی كە نەبێت لە وولات بەولاوە. ((دانییل وبستەر))

❖ بەرخ زۆر لە پباو بە وەفاترە چونكی زۆر كەم بە شەو كۆزەكەی بەجێ ئەهێڵێ. ((ژنێك))

❖ بە لامەوە گرنك نی یە كەبیرو باوەڕی تۆم بە دڵ بیٚ بۆ ئەوەی لە سەرت هەڵدەمیٚ، بەڵام تا مردن پارێز گاری ئەو مافەت دەكەم كە بتوانی بیرو باوەڕی خۆت بەسەرستی دەربڕی. ((فۆڵتێر))

❖ برین لە پڕێكا ڕوو دەدا.‥ سارێژ بوو نەوەی لە چەند مانگێكا.

❖ بیر كردنەوە لە ژیانا گرانترین ئیشە، لە بەر ئەوەیە كە كەم كەس بە كاری دەهێنیٚ. ((هەنری فۆرد))

❖ بـزنیش سـێبەری هەیـە. ((بوبیلـۆس سیرۆس))

❖ بە سەر هات كاتی تاقی كردنەوەی دەروونی پیاوە.

❖ بڕوا شاخەكان دێنێتە لەرزە. ((ئینگلیز))

❖ بۆ پیاوی گەورە تەنیا دژمنێك زۆرە و سەدان دۆست كەمە. ((ئیتالی))

❖ پیاوی چاك وەكو داری گەلاٚ زۆر وایە، ئەگەر هەتاو لیٚ ی دا هەست بە فێنكی لە ژێریا دەكەیت.

❖ پارچە نانێك شتێكی گرنگ نیە، لە گەڵ ئەوەشدا، هەموو شتێكە بۆ سـوالكەرێك كـە زۆر برسـی یـەتی. ((جـۆرج میریدێت))

❖ پیسكە دەڵیٚ ئازا لای من عەنتەرو خالیدی كوڕی وەلید نیە، ئازا ئەو كەسەیە لە پێش چاوی خواردنی بخورێت و دان بە خۆیدا بگرێت.

❖ پێكەنین ناتوانیٚ ئەوەی تورە بوون بردویەتی بیگەڕێنێتەوە. ((یابانی))

❖ پێویستە تەماشای ژێر هەموو بەردێك بكەین.

❖ پیاو دەبیٚ هەموو كات خەمی قەوم و وولاٚتی خۆی هەبیٚ.

❖ پیاوی دڕ بیٚ دراوسیٚ یە. ((ئینگلیز))

- ❖ پزیشکی نەزان نەخۆش دەکوژێ و داوای نرخی ئەو کوشتنە دەکا. ((ئینگلیز))
- ❖ پەندی پێشینان درۆ ناکا. ((ئینگلیز))
- ❖ پێشڕەوی چاك چاکترین ئامۆژگاری یە ((سالیس))
- ❖ پیاو بە چاوی خۆشەویستی دەکاو، ئافرەت بە گوێ ی.

## - پ -

❖ پێکەنە هەموو جیهان بۆت پێدەکەنێ.. بگری.. تەنها خۆت دەگری.

❖ پیاو کە درۆی کرد باش بزانە کە خۆی بە هیچ دەزانێ. ((جاحظ))

❖ پیاو و ژن دوو گوڵی دەم پشکوتوون، ئەگەر یەکێکیان سیس بێتەوە ئەوی کەشیان ڕەنگی ناشرین دەبێ.

❖ پێویستە هەموو ئافرەتێك مێردێکی هەبێ، بەشداری خۆشی و ناخۆشی نهێنی هاوڕێکانی بکات.

❖ خەڵکی دەژین بۆ ئەوەی بخۆن، من دەخۆم بۆ ئەوەی بژیم. ((سوکرات))

❖ پیاو کوشتن ڕێگای مێژووی جیهان ناگۆڕێ. ((ئینگلین))

❖ پیاو فڕۆکەیەو ئافرەت پەروانەکەیەتی.

❖ پێویستە لە هەڵەی کەسانی تر فێر بین،.. تا کات بە فیڕۆ نەدەین بۆ دوو بارە کردنەوەی.

❖ پیاوی بێ شەرم هەموو شتێ دەکات.

❖ پارە جۆرێکە لە بیر کردنەوە. ((ئۆزوالد شبنگلر))

❖ پارە جۆرێکی تازەیە لە کۆیلایەتی. ((تولسۆن))

❖ پارە هەموو دەم هەیە بەڵام گیرفان ئەگۆڕێ. ((جیرۆ ترود شتاین))

❖ پێویستە لە سەر وولاتە گەورەکان خزمەت بکەن نەك جیهان داگیر بکەن. ((ترۆمان))

❖ پیاو لێت خۆش بوو لە یادی ئەچێ. بەڵام ئافرەت ئەگەر لێت خۆش بوو لە یادی ناچێ.

❖ پیاوی ئازا ئەوەیە کە ئەتوانێ لە ڕووخاندن سەرکەوتن ببچڕێنێ.

❖ پێڵاوی پاژنە بەرز ئافرەتیٚ دروستی كرد، نەیویست لە ناو چاوانەوە ماچ كریٚ ((ئەفریقی))

❖ پیاوی ئەیەویٚ یەكەم كەس بیٚ لە ژیانی ئافرەتا.٠٠ بەلاٚم ئافرەت بە پێچەوانەوە ئەیەویٚ دوواترین ئافرەت بیٚ لە ژیانی پیاو دا.

❖ پیاو سیٚ شتی لە ئافرەت ئەویٚ چاكی لە دلٚداو پاكی لە ڕوودار زەردەخەنە لە سەر لێوان.

❖ پرسیار كرا لە ((ملتن)) بۆچی زمانێكی تر فێری كچەكەت ناكەیت ؟ ووتی: ئافرەت زمانێكی بەسە٠

❖ پیاو ناتوانیٚ باوەڕ بە كەس بكا تەنها بە خۆی نەبیٚ٠ بەلاٚم بە داخەوە.

❖ ((تریستان برنار))

❖ پێم دەلٚێت كە دیلێكی نووستوت بینی لە خەوی مەكە،لە وانەیە خەون بە سەربەستی یەوە دەبینی،منیش پێیان دەلٚێم،نەخێر كە دیلێكم دی نووستوە ڕاستی دەكەمەوە و باسی سەربەستی بۆ دەكەم ((ئەبڕاهام لنكۆلٚن))

❖ پێنوس چاكترین چەكە. ((بیتهۆڤن))

❖ پرسیار ئەكەن شارستانیەت چی یە ؟ وەلاٚم هێزی ئافرەتی ڕەوشت بەرزە.

❖ پێویستە پیاو ژنەكەی ئاگادار كا لەو شتانەی كەوا ئەزانیٚ و هەستی پیٚ كردووە بەر لە وەی یەكێكی كە تیٚ ی بگەیەنیٚ.

❖ پیاو هەموو شتێك ئەكات بۆ ڕاكێشانی ئافرەتی جوان.٠ ئافرەتیش هەموو شتێك ئەكات بۆ ڕاكێشانی پیاوی بیٚ ژن.

❖ پیاوی زانا ئەو كەسەیە لە گەلٚ ڕۆژگار خۆی بگونجێنیٚ، بەلاٚم پیاوی نەزان ئەو كەسەیە كە دەیەویٚ ڕۆژگار لە گەلٚ خۆی بگونجێنیٚ. ((بەرنارد شۆ))

❖ پرسیار هەرگیز ناقۆلاّ نیە، بەلاّم وەلاّم هەندیّ جار ناقۆلاّیە.((ئۆسكار وایلّد))

❖ پیاوی ژیر ئەو كەسەیە كە كەلّك لە بەسەر هاتی خەلّكی وەرگریّ نەك تەنیا بەسەر هاتی خۆی.

❖ پیاو بۆ ئەوەی ببیّ بە شاعیر، یا دەبیّ دلّی لە ئافرەتیّكی جوان بچیّ، یا زۆر كلّۆلّ و سیا چارە بیّ. ((لۆرد بایرۆن))

❖ پیاو تەنها یەك جار دەگری،ئەو جارەش خوێن فرمیّسكی یەتی.((بیكسفیلّد))

❖ پیّداویستی گەل بۆ زانیاری، لە پیّداویستی بۆ نان كەمتر نیە. ((دانتی))

❖ پیّویستە تەماشای ژیّر هەموو بەردیّك بكەین نەوەك دوو پشك پیّمانەوە بدا

❖ ((هیرودۆتس))

❖ پەند دەنگی خوایە. ((ئینگلیز))

❖ پیاوی قەرزار تیژ بە بازاڕدا تیّ دەپەڕیّ. ((سویدی))

❖ پیاو وەكو هەنگ وایە لە گولّیّكەوە دەچیّ بۆ گولّیّكی تر.

❖ پەندی هەر نەتەوەیەك پەرتووكیّكی گەورەیە، كە بە ئاسانی ڕەوشتیانی تیّدا دەخویّنیّتەوە. ((ئینگلیز))

❖ پیاوی هەژار بە زۆری زیرەكن بەلاّم بە دەگمەن پیاوی دەولّەمەند ژیر بیّت. ((ئەرستۆ))

❖ پیّم چاكتر بوو گەوجیّكی بەختیار بومایەنەك زانایەكی خەفەتبار ((شكسپیر))

❖ پیاوی بە فیز وەك كوندەی فڕیّدراو وایە، هەر كاتیّ كونی لیّ بوو فش دەبیّتەوە

((زەردەشت))

## - ج -

❖ جوانترین ئارایشت زەردە خەنەیە.

❖ جامی دەستم کە بەتالّ بو قایلم، بەلاّم کە نیوە بوو، بۆ پڕ نەبێت !

((جوبران خەلیل جوبران))

❖ جەژنی قوربانە بە قوربان، تۆبەتی قوربانیە

بۆ تۆ قوربانی،بە قوربان، گیانی من قوربانتە ((عارف قوربانی))

❖ جیهان وەكو شانۆیە، هەریەكە دەوری خۆی لە سەر دەبینیّ و پارەی خۆیشی وەر دەگریّ. ((پۆست فاندن فۆندیل))

❖ جیاوازی لە بیر و ڕادا نابیّ ببێتە هۆی ناكۆكی، چونكە ئەگەر وا بیّ، من وژنەكەم خوێنە خۆری یەكترین. ((غاندی))

❖ جوانی ئەو گۆرەپانە تاكە شەرعی یە، بۆ شیعر.

❖ جیهان پڕە لە گەوج،خۆ ئەگەر حەز دەكەی یەكێكیان ببینی دەبیّ نەك دەرگای ماڵەوە لە سەرخۆت دابخەی،بەڵكودەبیّ ئاوێنەكەشت بشكێنی((پوالۆری فەرەنسی))

❖ جلّەو بۆ تورە بونت بەر مەدە، چونكە تورەیی پێویستیسەرشانی ئادەمیزاد لە بیر دەباتەوە. ((زەردەشت))

❖ جارێك ڕۆژنامە نوسێك بە – ئەدیسۆن – گەیشت و خێرا چەند پرسیارێكی لیّ كرد، بەلاّم هیچ وەلاّمی چنگ نەكەوت، بۆ بەیانی بە خەتێكی گەورە (مانشێت) لە ڕۆژنامەكەدا نووسی – ئەدیسۆن گەورە ترین ڕاهێنەرە لە جیهان دا. كە ئەدیسۆن چاوی بە ڕۆژنامەكە كەوت بەم جۆرەی خوارەوە بروسكەیەكی بۆ

ڕۆژنامەکە لێ داو وتی :- تکایە هەڵەکەت ڕاست بکەوە، بەڕاستی گەورە ترین داهێنەر لە جیهانا تۆیت.

❖ جوانی ژن وەکو ماڵی پیاوە، بە هێزو دەسەڵات دارە. ((ئەکسیل مۆنتە))

❖ چاك وایە مرۆڤ ڕوو خۆش و ژیر بێ. ((جۆرج سنتایانا))

❖ چاك وایە پاك و ڕاست گۆ بێ. ((رۆبەرت بیرنز))

❖ چاکتر وایە قەرز بدەی نەك قەرز بکەی، چونکە ئاکامیان هەر یەکە.

❖ چواریەکی ناوداریێتی پیاوی گەورە، بۆ ئازایەتی یان دەگەڕێتەوە، دوو بەشی تری بۆ ڕێکەوت، بەشەکەی تریش بۆ تاوانەکانیان. ((ئۆگۆ فۆسکولۆ))

❖ چۆن دار دەتوانێ میوەی شرین و ترشی بدات،دایکیش دەتوانێ منداڵێکی چاك یا خراپ بدات.

❖ چاکترین بۆن، بۆنی نانە، چاکترین چێژ، چێژی خوێ یە، چاکترین خۆشەویستی خۆشەویستی منالە. ((گراهام گرین))

❖ چاکە لە گەڵ دۆست بکە چاکتر خۆشەویست دەبێ و لە گەڵ ناحەز بیکە دەبێ بە دۆست.

❖ چاك وایە بێدەنگ بیت لە وەی بە بێ سوود قسە بکەیت

❖ چ باکمە ئەگەر تاجێکم لە سەر نەبێ.. خۆ پێنوسێکی پاك و پیرۆزم بە دەستەوەیە کە لە هیچ دەسەلاتدارێك ناترسێت. ((فۆلتێر))

❖ چاکەی هەندێ دەوڵەمەند هەر ئەوەندەیە کە فێرمان ئەکا بیر لە سامان بکەینەوە. ((گوبران))

❖ چەند ناشرینە دیاری، ئەگەر داخوازی لە شوێن بێ.

❖ چوار شت ناگەڕێتەوە.٠ ووشە لە زار دەرچوو.٠ تیر لە کەوان.٠ ڕۆژگار کە ڕۆیشت.٠ هەل ئەگەر خستتە پشت گوێ.

❖ چەند زێڕ لە سەر ئەرز هەیە و چەندی لە ناو ئەرزدا، ئەوە ناهێنێ بیخەیتە تای ترازووەوە لە گەڵ پاکییدا. ((ئەفلاتون))

❖ چاکە لە گەڵ خراپاندا، وەکو چاندنی تۆو وایە لە دەریادا. ((تیوگینیس))

❖ چاکترین ڕێگا بۆ کۆکردنەوەی پارە ئەوەیە، ئەو پارانەی کە کاغەزن دوو قەدی کەو بیخەرە گیرفانتەوە. ((ف٠ ماکنلی هابارد))

❖ چاو برسێتی ئافرەت لە هیچ ڕادەیەکدا ناوەستێ ئەگەر زێڕی جیهانی بدەیتێ، چاو دەبڕێتە گەنجینەی ئاسمان. ((شکسپیر))

❖ چۆلەکەیەك لە چنگ دا بێ چاکترە لە دە چۆلەکە بەسەر دارەوە. ((سەرڤەنتس))

❖ چاکەی گشتی بدا بە سەر چاکەی تایبەتی دا. ((سوکرات))

❖ چاو تێری گەنجینەیەك لە ناو ناچێ. ((عەرەب))

❖ چاو دێری دوژمنت بکە ئەگەر چی مشکیش بێ. ((ئینگلیز))

❖ چەند ملیۆن کەس بە کوشت ڕۆیشت بۆ ئەوەی قەیسەر گەورە ببێ. ((کامبلێ))

❖ چەك ئەو خراپی یە کە هەموو خراپی یەکی گرتووەتە باوەشی. ((شکسپیر))

❖ چاك وایە کتێبخانەکەت پڕ کتێب بێت، نەك جزدانەکەت لە پارە. ((دیگۆن لایلی))

❖ چاکترین کەس ئەوەیە ئەگەر ستایشت کرد لە ڕوو، تەریق دەبێتەوە و بە خراپــە لێ ی دوای مــات دەبــێ. ((جــوبران خەلیل))

## - د -

❖ دوو ساڵ یەکێتیم بدەنێ بە دوو مانگ سەر بە خۆیتان دەست دەخەم((غاندی))

❖ داد پەروەری ئەو ڕاستیەیە کە ئیشی خۆی بە جێ دەهێنێ. ((دزرائیلی))

❖ درۆ ڕەنگە ئێستا ڕزگارت کا. بەلاّم پاشە ڕۆژی نیە.

❖ دڵداری دەمێنێ ئەگەر ڕۆژگاریش بەسەر دلّدارەکەدا سەر کەوێ، چونکە دلّداری ڕاستەقینە گیان و باوەڕە.

❖ دلّداری ئەگەر گڕی نەبێ خۆش نیە،ئەگەر زۆریش خۆشت نەوێ، دلّداری مەرامت نیە. ((باسکال))

❖ دلّداری تەنیا پارەیە، کە هەژارو دەولّەمەند، وەکو یەك دەتوانن بە کاری بهێنن.

❖ دلّداری ئەو زۆر دارەیە کە هیچ بەزەیی بە کەسا نایەت.

❖ دلّداری نازانی، چونکی بە شوێنیدا ڕادەکەی.

❖ دلّداری و وتار خوێندنەوە لە یەك دەچن، هەموو گەوجێك دەتوانێ دەستی پێ بکات، بەلاّم کۆتایی یەکەی بە جوانی، پێویستی بە زانایەکی بەرزە.

❖ دارِزێ ئەو پیاوەی کە لە پێناو وولاّتەکەیدا لە مردن ڕا دەکا، ئەوە لە ئاسودەیی هەتایی بۆ نەمان ڕا دەکا.

❖ دەتوانی چاوت بە چاویلکەی ڕەش بشاریتەوە، بەلاّم ئایا دەتوانی دەنگت بشاریتەوە کە ئاشکرات دەکات.

❖ دلّداری وەکو مانگ وایە ئەگەر زیاد نەکات، وا کەم دەکات.

❖ دەتوانی مرۆڤ بناسیت بەو پرسیارانەی کە دەیکات نەك بەو وەلاَمانەی دەیداتەوە.

❖ درۆزن دەبیَ بیری تیژ بیَ.

❖ دەتوانین هەموو شتێك فێر بین، تەنانەت چاکەو پاکی. ((جوزێف جۆبێر))

❖ دلَداری شتێکی سەیرە، نازانین لە کویَ وە دێت و کەی و لە کویَ وە تەواو دەبێت.

❖ دلَی دایك قوتابخانەی مندالَە. ((ئینگلیز))

❖ دراوسیَ ی بەهێز هەمیشە ترسناکە. ((میتەرنیخ))

❖ داگیر کەر نامریَ، هەتاکوو دەست بە سەر گرتن ـی گەلێك بە سەر گەلێکی تر بمێنیَ. ((ئەحمەد سوکارنۆ))

❖ داخم دەخوارد کە پێلاَوم نیە، بەلاَم کە دیم پیاوێك بیَ پیَ یە پەشیمان بوومەوە لە خەفەت خواردن. ((جوبران))

❖ دوو جۆر مرۆڤ هەرگیز سەر ناکەون، ئەوەی بەو کارە هەلَناسیَ کە پیَ دەسپێرن و ئەوەی هیچ شتێك ناکات لەوە زیاتر کە پیَ ی دەسپێرن. ((سیرۆس کروتیست))

❖ درك تیژە زمانی ئافرەت تیژ ترە. ((ئەلَمانی))

❖ دەروونی خۆت بە خەفەت ئازار مەدە، چونکە خەفەتبار هەست بە خۆشی ژیان و ئارامی گیان ناکا. ((زەردەشت))

❖ دوکەلَ لە پیری ئاگرەوە دێت. ((ئەرتۆرۆ کادیفیادی ئەرجەنتین))

❖ دەتوانی مرۆڤ لە وولاتەکەی بپچڕێنی، بەلآم ناتوانی وولات لە دلی دا دەربێنی.

❖ دووژمنی جەهالەت بن بە هەموو تواناتان.٠ شەڕی جەهالەت بکەن و دووای جەهالەت مەکەون.

❖ دلی گەوج لە زاریا، تا، زمانی ژیریش لە دلّیایەتی.

❖ دایکم دروستی کردم. ((ئەدیسۆن))

❖ درەختی ڕەگ پتەو، لە بای دژوار ناترسیّ. ((چینی))

❖ دەرگای چاك لە چەکوش ناترسیّ.

❖ دلّداری و بۆنی خۆش،ناتوانن خۆیان بشارنەوە.

❖ دلّداری وەك قومارە.٠ یا خاوەنەکەی بە تەواوی دەولّەمەند ئەکا.٠ یانیش بە تەواوی دای ئەڕزێنیّ.

❖ داد پەروەری چاك لە یاسا چاکترە.

❖ دەولّەمەندی پیسکە، وەکو کەرێك وایە زێڕ هەلّبگریّ و جۆ بخوا.

❖ دلّداری گەنجان وەك پریشکی ئاگری ئاسنە زوو دەکوژێتەوە، بەلآم دلّداری پیران وەکو ئەستێرەی گەشەو کوژانەوەی نییە.

❖ دەزانین ئێمە مرۆڤی سەدەی بیست و یەکەمین دروست دەکەین. ((گیڤارە))

❖ دلّداری، پڕە لە هەنگوین و ناخۆشی. ((بلوتۆس))

❖ دلّدار ئەگەر برسیشی بیّ ی دلّی نابا. ((بلوتۆس))

❖ دەم و قالّی خۆشەویستی، تازە کردنەوەی خۆشەویستی یە.((تێرنس))

❖ دلّداری وەکو جیوە ((زئبق)) وایە لە سەر لەپی دەست، دەستت پان کەیتەوە ڕا دەوەستی،بینووقێنی دەر دەپەڕیّ. ((دروسی پارکەر))

❖ داری ڕاست، ڕەگی چەوتی هەیە. ((ئینگلیز))

❖ درۆزن، دزە، چونکە دز شت و مەك دەدزیٚ، درۆزنیش هۆش.

❖ دە تاوانکار لە سزا ڕزگار بکەیت، چاکترە لەوەی بیٚ تاوانێك تووشی ئازار بکەیت.

((کاترین))

❖ دڵداری وەکو جەنگە.. زۆر ئاسانە دەستی پیٚ بکەیت.. زۆریش گرانە بتوانی کۆتایی پیٚ بێنی.

❖ دوو پلە لە ژیانی پیاو دا هەیە هیچ لە ئافرەت تیٚ ناگا، پلەی پێش ژن هێنانی و پلەی پاش ژن هێنانی.

❖ دڵداری وەکو شەپۆلە.

❖ دڵداری، مێژووی ژیانی ئافرەتە.

❖ دڵداری، شاری ئافرەتە.

❖ دڵداری،.. فرمێسکی درێژەو. زەردەخەنەی کورتە.

❖ دڵداری، دەرمانی هەموو خراپەیەکە.

❖ دوو جۆر ئافرەت هەیە، یەکێکیان ئەوەیە ئەیەویٚ هەڵەی پیاو چاك کاتەوە، ئەوی تریان ئەیەویٚ یەکێك بێت لە هەڵەی پیاو.

❖ دڵداری ئەوەیە، کە سەربەستی یەکێکی پیٚ بەند ئەکەی. ((سارتەر))

❖ دڵداری دان بە خۆدا گرتو، دڵداری ڕاستە قینەیە.

- ٥ -

❖ هەموو کەسێك ڕاستی هەیە. ((ئیتالی))

❖ هەوڵ بدە هەڵەی کۆنت لە یاد بچێت و تەماشای ڕۆژانی داهاتوو بکە.

❖ هەموو خواردنێکی زۆر مافێکی خوارو لە تەنشتیوەیەتی. ((ئیمامی عەلی))

❖ هاوڕێتی خراپ چاوگەی ئازارە. ((تیوجنیس))

❖ هەژاری بێ هێزت دەکا. ((تیوجنیس))

❖ هەرچی شتێك بخەینە سەر زانیاری، سەر خستنێکە بۆ هێزی مرۆڤایەتی.

((هوراس مان))

❖ هەموو بەیانی یەك لە ژنەکەت بدە، ئەگەر خۆت هۆیەکەت نەزانی، ئەو دەیزانێ.

❖ هەژارێکی بێ ئارام، وەکو چرایەکی بێ نەوتە.

❖ هیواکانم هەموو کاتێ نایەتە دی، بەلآم هەموو کات بە هیوام بە هیوام.((ئۆفند))

❖ هەموو جۆرە هیوایەك وتەماعێ ڕێدراوە تەنها ئەوە نەبێ کە دەتگەیەنێتە ئامانج لە ڕێگای ناخۆشی و نارەزایی مرۆڤایەتییەوەو نەزانێتییەوە.

❖ هەر جێگایەکی کۆن کە بتوانم شەبقەکەمی پێدا هەڵواسم، ئەو جێگایەماڵێکی جوانە بۆ من. ((دیکۆن رای))

❖ هەڵە وەکو پووش وایە دەکەوێتە سەر ئاو، ئەو کەسەی دەیەوێ بۆ مرواری بگەڕێت دەبێت بچێتە قووڵایی بنی ئاوەوە. ((درایدن))

❖ هاوڕێ لە بۆرسەی ژیان دا پارەی ئاڵتونن، هەژاریش ئەو کەسەیە کە هیچ هاوڕێ نی یە. ((سلمۆن))

❖ هێمنێکی درووست کراو، شتێکی ڕوو کەشە. ((فەرەنسی))

❖ هیچ شتێك لە ئامۆژگاری چاك باشتر نی یە. ((ئێرازمۆس))

❖ هەر كاتێك حەزكەین سوپایەك سەر كەوێ، پێویستە باوەڕی گەورەی خۆمانیان پێ ببەخشین و وایش باوەڕیان پێبكەین كە هیچ شتێك نی یە نەیەڵێ سەر كەون.

❖ هەتاوی زیندوو مردوو گەرم ناكات. ((لامارتین))

❖ هاوڕێ ئەو كەسەیی كە ئەتوانم لە بەر دەمیا بە دەنگی بەرز بیر كەمەوە. ((ئێمەر سۆن))

❖ هەل دەرگا نی یە لە بەردەمتا بۆت بكرێتەوە، بەڵكو بە هەنگاوێكی ئازانە بۆی هەڵسە.

❖ هاوڕێیەتی لای ئافرەت، دەرهاوسێ ی دڵداری یە. ((مۆر))

❖ هۆش وەكو چەترە ((پەرەشووت))ی فرۆكە وانانن، تا نەكرێتەوە سوودی نابێ. ((لورد توماس دبوار))

❖ هیچ مێشكی پێ ناوێ بۆ ئەوەی ببیت بە پارە دار تەنها تەماشای ئەوانەكە كە هەیانە. ((كلیدەس درۆ))

❖ هەموو ئافرەتێك خۆی بە ژیرو كوڕەكەی بە جوان دەزانێ. ((سەعدی))

❖ هونەر لەوە زیاتر نی یە، كە سێبەری مرۆڤایەتی یە. ((هانری جێمس))

❖ هەموو جولانەوەیەك هەر چۆنێ بێ،شتێكی دەس پێشكەری یە((ئەكار ئالەن بۆ))

❖ هەق بە هێزەو دەر دەكوێت و سەر دەكەوێت.

❖ هەر وتەیەك سەرۆك كۆمار بیكا قورسایی تەنێكە. ((ئەمەریكی))

❖ هەندێ كەس كاتیان دەكوژن لە پێناوی كۆكردنەوەی سامان داو سامانیان خەرج دەكەن لە پێناوی كوشتنی كاتیانا. ((ستاریلاد))

❖ هەرچەند ئافرەت بەهەشتی لە دەست داوین بەلآم هەر لە باوەشی ئەودا پێ دەگەینەوە.

❖ هەموو خۆشەویستەكان لە ژێر تریفەی مانگەشەوا دائەنیشن..بەلآم ئایا یەكجار تاقی یان كردۆتەوە لە ژێر گرمەی هەورە تریشقەدا لە شەوێكی ڕەهێڵە دا ؟ تاقی بكەنەوەو یادم كەن.

❖ هیچ شتێك نی یە لە جیهانا دڵی ئافرەت پێ ی بگەشێتەوە وەكو بیستنی ستایشی كردنی.

❖ هیچ دیمەنێك لە جیهاندا فرمێسك ڕاناكێشێ، وەكو دیمەنی دڵدارێكی دڵ شكاو.

❖ هەموو مشت و مڕێك دوو لای هەیە، بەلآم هەندێكی كۆتایی نی یە.

❖ هیچ شتێك لەوە خۆشتر نی یە كە لە ئاسوودەیی دا، بەری كارو كردەوەی خۆمان بخۆین. ((ئینگلیز باست))

❖ هەر كەس ڕاستی ببینێ و لایەنگیری نەكا ترسنۆكە. ((كۆنفۆشیۆس))

❖ هەر چەند ئافرەت نەزان و نەخوێندەوار بێ، بەلآم لە فەلسەفەی خۆشەویستی دا زانایە.

❖ هەر كەسێ پەرتووكێكی بە كەڵك لە ناو بەرێ پیاوێ دەمرێنێ. ((ملتون))

❖ هەندێك هێز، پێویستە بۆ دڵداریش.

❖ هیچ ئافرەتێك نی یە ئامۆژگاری ئافرەتێكی كە وەرگرێ دەربارەی بەرگی، چونكی گومان لەوە دا نی یە پرسیار لە دوژمنەكەت ناكەیت كە چۆن شەڕ ئەبەیتەوە.

❖ هۆی تورە بوونی ئافرەت لەو پیاوەی كە سەری ڕووی ئەكات، ئەوەیە نایەوێ لۆچی دەم و چاوی بە ئاشكرا ببینێت.

❖ هەر چەندە هەولّم دا لە پێناوی دلّداریا دەسكەوتم هەر ئەشكەنجە بو.

((گۆتە))

❖ هەموو نهێنی یەك لە دووان تێپەڕی بلاّو ئەبێتەوە، هەموو دلّداری یەكیش لە دوو گیان تێپەڕی ون ئەبێت.

❖ هەرچی ژێری جیهان هەیە هەموو لە سەر یەك ئاینن. ((ئینگلین))

❖ هەستی نیشتمان پەروەری و ئازادی لە دلّی هەموو كوردێكا جێگیر بووە و دەست لێ هەلّگرتنی نی یە. ((پێشەوا قازی محەمەد))

❖ هێرش بەرە سەر بیری مرۆڤ چۆن ئارەزوو دەكەیت. بەلاّم ڕێگا بە خۆت مەدە كە هێرش بەریتە سەر مرۆڤە كە خۆی.

❖ هەموو پیاوێك دەبێ بە شاعیر ئەگەر توشی دلّداری بێ. ((ئەفلاّتوون))

❖ هیچ شتێك ناتوانێ ژیان پڕ كاتەوە، وەكو خۆشەویستێكی گەورە، كە خۆشەویستەكەت لە سۆزی خۆشەویستیا لێت بە گومانە.

❖ هیچ هیوایەك لەو ئافرەتە دا نی یە كە دلّداری بۆ هیوا بكات،نەك بۆ خۆشەویستی.

❖ هەموو یەكێك حەز بە ئاشتی دەكا، بەلاّم كەم كەس ئەو كارە دەكا كە ئاشتی لێ پێك دێ. ((تۆماس كێمبس))

❖ هەموو دروست بوویەكی ئەم جیهانە نهێنیە، بە تایبەتی دروست بوونی مرۆڤ.

((ئەلسێر تۆماس براون))

❖ هەر كەسێ بیەوێ بژی با بمرێ لە ڕێ ی گەلەكەیدا. ((ئەفغانی))

❖ هەندێ مرۆڤ وەك پەیژە وان، هەندێ بە سەریانا سەر دەكەون و هەندێ پیایانا دێنە خوار، بەلام خۆیان نە سەر دەكەون و نە دێنە خوار.

❖ هەر چۆنێ بێت ژن بێنە، ئەگەر ژنێكی باشت بە تووشەوە بوو كامەرانی و ئەگەر ژنێكی خراپیشت بە تووشەوە بوو ئەوا فەیلەسوفی. ((سوقرات))

❖ هیچ شتێك نی یە بە قەد پاكی ڕێزی ئافرەت بەرز بكاتەوە. ((ئەدیسۆن))

❖ هەر چەند ژمارەی هاوسەریەتی زیاتر بێت، تاوان كەمتر دەبێت.
((وولتەرسكۆتلەندی))

❖ هیچ كارە ساتێك نی یە ئادەمیزادی ژیر سوودی لێ وەرنەگرێ و ئادەمیزادی گەوجیش تیا تووشی زیان نەبێ.

❖ هەرگیز خۆشەویستی لە بەینی ئەو كوڕ و كچەدا نی یە، كە لە ژوورێكی داخراو دا دا دەنیشن، بەڵكو ئارەزوو كۆیان دەكاتەوە.

❖ هیچ گران نی یە ئادەمیزاد بە هێمنـی و خۆشەویستی بژی لەم جیهانە دا پێكەوە لە ژێر ئاسمانێكی جوانی ڕازاوە بە ئەستێرەی گەش.
((تۆلستۆن))

❖ هیچ نەوتن لە ووتەی بێ جێ ووتن چاكترە. ((ئینگلیز))

❖ هەژار لە شۆڕشی ناترسێ.

❖ هیوا ژوورێكی داخراوە، كلیلەكەی چاوەڕوانی یە.

❖ هەموو تاریكی جیهان ناتوانێ ڕوناكی مۆمێك بشارێتەوە.

❖ هەموو مرۆڤێك هەڵە دەكا. بەلام نەزانترین كەس ئەوەیە كە هەڵە دەكات و پێ ی لێ نانێ.

❖ هەندێ جارو بار ڕاستی دەڵێن هەندێ جاریش هەر نایڵێن. ((شیشرۆن))

## - و -

❖ وتیان، فێری لە بیر چوونەوە بە، منیش دەڵێم لە بیر چوونەوە فێڵێکی درۆیە بەرامبەر دڵداری یەکی پتەو کە ڕیشەکەی چەسپاوە.

❖ ووتەی خۆش و ناسك دەرگای پۆڵایین دەکاتەوە. ((تورك))

❖ وێژە ئینجیلێکی جوانی و زانستە، پێویستە هەموو کەس لێ ی بەشدار بێت، جا لە بەر ئەوە نەك کەڵکی کەم.. بەڵکو بۆ سوودی گشتی و پەروەردە کردنی گشتی دەنووسرێ. ((تۆڵستۆن))

❖ واز هێنان لە ئارەزووی بێ کەڵك مایەی ئاسوودەیی و پێشکەوتنە. ((شکسپیر))

❖ ووشەی ناسك... هەرگیز دەنگی ناسك تری هەیە.

❖ وێنەی تازە ((ریالیست)) وەکو ئافرەت وایە... پێویستە خۆشمان بووێ بێ ئەوەی لێ ی تێ بگەین.

❖ وا لە نێوان دوو دوژمن بدوێ، ئەگەر ئاشت بوونەوە نەکەویتە شەرمەزاری یەوە.

❖ وا تێ نەگەی کە پێشکەوتنت وەدەس هێناوە، ئەگەر وا هەست نەکەی لە هەموو کەس نزم تری. ((جیرار دوگروت))

❖ وەرگێڕ خائنە. ((ئیتالی))

❖ دەریا ماسی ناگرێ. ((تورکی))

❖ دایکی کوژراو دەنوێت، بەلام دایکی کوژەر نانوێت.

## - ز -

❖ زەردەخەنەی ئافرەت تیشکێکە لە تیشکەکانی ڕۆژ. ((ڤۆڵتێر))

❖ زۆر دار سەریش بکەوێ تەمەن کورتە. ((لینکۆڵن))

❖ زانا ئەو کەسەیە کە لە نەزانەوە فێری شت دەبێ. ((ئینگلیز))

❖ زۆر کەم توشی هەڵە ئەبی ئەگەر وریا بی. ((کۆمفۆشیوس))

❖ زەردەخەنە زمانێکە هەر ئافرەت لێ ی تێ ئەگا.

❖ زانستێکەت وەکو کات ژمێر لە گیرفانێکی تایبەتیدا هەڵگرەو لێ ی دەرمەکە لە بەر ئەوەی کە وای پیشان دەی کە تۆ خاوەن زانستیت.

((ئەللۆر تشسترفلید))

❖ زۆر کەس کە توشی تەنگو چەڵەمە دێت سەرزەنشتی زووفیان دەکەن. بەلآم من باوەڕم بە زرووف نیە، هەموو ئەو کەسانەی کە سەرکەوتوو بوون لەم جیهانەدا بە دووای زرووفی چاکدا گەڕاون، بەلآم زرووفیان دەست نەکەوتبێ خۆیان دروستیان کردووە.

❖ زەردەخەنەی ژن، پرشنگێکە لە پرشنگەکانی هەتاو. ((ڤۆڵتێر))

❖ زۆربەی برادەریی،برادەری درۆیە،زۆربەی دڵداریش تەنها بێ ئەقڵی یە.

((شکسپیر))

❖ زمانی نەزان کلیلی گۆڕێتی. ((ئیتالی))

❖ زۆر کەس دەگەیەتە تەمەنێکی دیاری کراو، دەبینی دەترسێ و ڕقی هەڵدەسێ لە پیری، جا لە بەر ئەوەی زۆریان پیر دەبن، پیرێکی ناشرین و دەمرن لە پێش کاتی مردنیانا. ((ئیتالی))

❖ زانیاری چرایەکی ڕێگەی کۆمەڵی تاریک ڕووناک دەکاتەوە.

❖ زۆر جار گۆرانی دەڵێین بۆ نواندنی منداڵەکانمان، کە چی خۆمان خەومان لێ دەکەوێت. ((جوبران خەلیل جوبران))

❖ زۆر زان کەم و نەزان زۆر دەدوێ. ((جان جاك رۆسۆ))

❖ زەیتوونە سەوزەکە گوێ لە سێ باڵندە بوو گۆرانیان دەوت : ڕۆژی ئەمڕۆ زۆر درێژە، ڕۆژەکەی زۆر گەورەیە،شەویس دوورە دوور، ئەو بەیانیەی کە کۆمان دەکاتەوە، خۆی مات داوە لە شوێنێکی ناموەوە، سەیرە ئەی چۆن پێت بگەم خۆشەویستەکەم،منیش بە بێ بینینت ئارامم نی یە تەنها دەبێت بە خۆشەویستی تۆ بژیم.

❖ زێڕی بێگەرد لە ئاگر ناترسێ.

❖ زانا سوود لە دوژمنەکانی زیاتر وەر دەگرێ، لەوەی کە نەزان لە دۆستەکانیەوە فێر دەبێ.

❖ زمان شیرینی و ووتەی خۆش ڕابەرت بێ لە ژیان دا چونکە بێ ئەو سەرکەوتن نابێ.

❖ زۆر جار پیاوی خاوەن مەی و سامان، دەست لە دۆستی هەڵدەگرێ.

❖ زۆر جار یەکێ لە ئێمە ئەگەڕێ. بۆ دوژمنەکەی لە هەموو شوێنێك.. تەنها یەك شوێن نەبێت کە تێیدایە. ئەویش ئافرەتە.

❖ زۆر ئاسانە کە بە چەرمەسەری خەڵك پێکەنی بەڵام ئازایەتی لەوە دایە کە تووشی خۆت بو پێکەنی.

❖ زۆر لەو کەسانەی سەرم سوڕ دەمێنێ کە ڕۆژی چەند جار دەم و چاویان دەشۆن، کەچی ساڵی جارێ دڵیان ناشۆن.

❖ زۆر جار پێ لە هەڵەی بچووکمان دەنێین کە لە خەڵکی بگەیەنین، هەڵەی گەورەمان نی یە.

❖ زانستی لەتافی لاویدا دەمێنێتەوە، تەنانەت بۆ پیرە کانیش. ((ئەخلیس)).

## - ژ -

❖ ژن هێنان وەكو بیر وایە،ئەوەی لە سەرەوەی وەستاوە ئەیەوێت بڕواتە ناوەوە، ئەوەی لە ناوەوەیە ئەیەوێ بێتە دەرەوە.

❖ ژن وەكو میوە وایە ئەگەر لە دار كەوتە خوارەوە، واتە كەس نەهاتووە بیپچڕێت لە كاتی خۆیدا.

❖ ژیانمان بە هیواو ئاواتە خوازی دەبەینە سەر،بە ئاوات و هیواشەوە سەر دەنێینەوە· ((ڤۆلتێر))

❖ ژیان وەكو پیاز وایە یەك یەك لە یەكی دەكەیتەوە، هەندێ جاریش دەتگرێنێ.

((كارڵ ساندبرگ))

❖ ژیان بە بێ ئازار هیچ خۆشی یەكی نی یە، ئازاریش ئاگرێكە گیانی پێ ی دەسوتێنرێ.

❖ ژیان شایانی ئەوە نی یە كە مرۆڤ لێ ی بترسێ بەڵكو شایانی ئەوەیە كە لێ ی تێ بگەی.

❖ ژیان بێ ئافرەت چرایەكی بێ ڕووناكی یە.

❖ ژیانی بێ ئازادی لەشێكی بێ گیانە. ((جوبران خەلیل جوبران))

❖ ژیان هیچ نی یە، تەنها گەردە لولێكی خراپە. ((ردیادو كوبانگ))

❖ ژیان هەر چۆنێك بێ، ژیانە. ((فیدۆر دۆستۆیفسكی))

❖ ژمارەی مرۆڤ چەندە ئەوەندەیش بیرو ڕا هەیە. ((تێرنس))

❖ ژیان وای فێر كردم كە شتێكی لێوە فێر بم.

❖ ژن هێنـان هاوبەشـی یە لـە نێـوان دووانـا، یـەکێکیان پـارە کۆکردنـەوە دەکەوێتە ئەستۆی، ئەوەی تریان خەرجی دەکا.

❖ ژیان خۆشە،بەلآم داخەکەم هەموو هیوایەکی تیا نایەتە دی. ((یۆنانی))

❖ ژیانی پیر وەکوو گڕی مۆم–ی دەم با وایە. ((چینی))

❖ ژنی چاك و تەندرووستی،چاکترین سامانە بۆ پیاو. ((ئینگلیز))

❖ ژن هەرە جوانترین مەلە لە جیهان دا. ((ئەلفەرد مۆسێە))

❖ ژیرو هوشیار پێویستیان بە ڕابەر نی یە. ((تورك))

❖ ژیر ترین بـاوك ئـەو باوکەیـە کـە پـاش ژن هێنـانی کوڕەکـەی لـە گـەڵیادا دانەنیشێ، لە جیاتی نزیك بوونـەوە دور دەکەوێتـەوە. ((جەمالـەددین ئەفغانی))

❖ ژن جوانترین دیاری یە خوا پێشکەش بە پیاوی کردووە. ((سوکرات))

❖ ژن بهێنم یا نەی هێنم هەر پەشیمانم. ((سوکرات))

❖ ژن چوار چەکی هەیە –زمان و فرمێسك و چڕنووك و بوورانەوە.

❖ ژیـانی بـێ دڵـداری دارێکـی بـێ بـەرەو بـێ گوڵـە. ((جـوبران خـەلیل جوبران))

## - ی -

❖ یادی دڵداری ناکرێتەوە بە بێ یادی نە نووستن،ناخۆش، لێدانی دڵ، شێتی،خۆکوشتن،کوێری،هۆش،لە سەر ئەوەشەوە هەموو کەسێك دەڕواتە نێو ئەو دۆزەخەوە.

❖ یەکەم پیاوی ژندار کە لە ژیان دا بەختیار بوو بێ تەنها باوکە ئادم بوو چونکە خەسووی نەبوو. ((لۆی رۆنسۆن))

❖ یاسا تۆڕێکە، تاوانکاری بچووك دەگرێ. ((جوبران خەلیل جوبران))

❖ یەکەمین دووژمنی سەرکەوتن و گەورەترین سوپەری کۆنەپەرستی عەیبە عەیبەیە.

((فایق بێکەس))

❖ یاسا وەکو تۆڕی جاڵجاڵۆکەیە، باڵندەی بچووك دەگرێ و باڵندەی گەورە تێکی دەدا. ((ئەمەریکی))

❖ یەکجار ئاگاداری دوژمنەکەت بە، بەڵام دۆستەکەت هەزار جار.

## - ك -

❖ کیسەی بەتاڵ ڕاست ناوەستێ. ((ئەڵمان))

❖ کوێر کەمتر پێ ی هەڵدەکوێ لە چاو ساغ. ((ئەڵمان))

❖ کاتێك ((ئازادی))مان دەستکەوت دەبێ بزانین بە کاری بهێنین.

❖ کاتێـك هــەژاری لــە دەرگــاوە دێتــە ژوورەوە،دڵــداریش بــە جــارێ لــە پەنجەرەوە دێتە ژوورەوە. ((ئۆسکار وایڵد))

❖ کاتێ ماڵ دەسووتێ هەموو کەس ئاو هەڵدەگرێ.

❖ کەری دێ باشترە لە دوکتۆری مردوو. ((ئەسپانی))

❖ کامەرانی تۆپێکە کە لێ ی نزیك ئەبیتەوە تـێ ی هەڵئـەدەین کـە دووریـش کەوتەوە بە دووایا ڕا ئەکەین.

❖ کە خۆشەویستەکەت پێت ئەڵێ لە شـوێن ئـافرەتێکی کـە بگـەڕێ.٠٠ بڵـێ کەوتۆتە داوی خۆشەویستی پیاوێکی کەوە.

❖ کە پیاو ئەمرێ دووا ئەندام کە لە جوڵانـەوە ئەکـەوێ لـە لەشـیا دڵیـەتی، بەڵام ئافرەت زمانێ تی.

❖ کە پیاوێك دەبینم دەپرسم،ئایا پیشەیەکی هەیە، کـە وتیـان پیـشەی نـی یە.لە بەر چاوم دەکەوێ. ((عومـەر کـوڕی خەتاب))

❖ کە یەکێك قسە دەکات تۆ ڕای مەکێشەو داش مەنیشە، کە یەکێك بە پێوە بوو لەو شوێنەش قسە مەکە، کە پێویستی بە بێدنگی بوو.

❖ کێ سزای زمانی بدا، هاوڕێ ی زۆر دەبێ.

❖ کە دەچمە ناو ساڵەوە هەموو ڕۆژێك شتێکی تازە فێر دەبم. ((سۆلۆن))

❖ گورگێکی خوێن خۆر بە مەڕێکی هەژاری وت بۆ نایەتە ماڵـەوە سـەرێکمان لێ بدەی؟ مەڕەکە وتی : چەن پێخۆشحاڵ دەبووم ئەگەر ماڵت لە ووێ نەبوایە.

❖ گڕی ئاگر دوو کەڵی لە دوواوەیە. ((بلۆتۆس))

❖ گەش بینی باوەڕی هەموو شۆڕشێکە. ((جاك بانفیل))

❖ گەلێك لام خۆشترە لە وولاتێکا بژیم ڕۆژنامەی هەبێت و یاسای نەبێت، نەك لە وولاتێکا یاسای هەبێ و ڕۆژنامەی نەبێ. ((جیفرسن))

❖ گوناهبار لە ترسا دەژی. ((ئیتالی))

❖ گرنگ نی یە زۆران بگریت، بەلاّم پێوستە دوژمنەکەت بدەیتە ئەرزا. ((هـ·ج·وین))

❖ گریان نەبوایە ڕێزی پێکەنین نە ئەگیرا.

❖ گەورەترین هەڵە ئەوەیە کە خۆت لە هەڵە بە پاك بزانی. ((کاریل))

❖ گەورەترین دوژمن باوکێك قەرزاری کۆبێتەوە لە سەری.·دایکێك ڕێگەی چەوتی بگرێ.· ژنی جوان شانازی بە جوانیٚ کەیەوە بکات، منالّی هیچ تیٚ نەگا.

❖ گەورەترین سەر لەشکر ناتوانیٚ ڕێگا بۆ شەڕێك دانیٚ وەك ئافرەتێکی دڵدار کە ڕێگە دا ئەنیٚ بۆ ئەوەی بە نهێنی بڕوا بۆ لای خۆشەویستەکەی !

❖ گەر دڵداری پەرتوکێك ببوایە بۆ خوێندنەوە. ئاواتم ئەخواست فەرهەنگی دڵداری بوومایە.

❖ گرانترین شت لای ئافرەت نهێنی شاردنەوەیە.

❖ گۆڕینی دەرمانی لێوو سوور کردنی، بەلگەیەکی چەسپاوە، کە ئافرەت وەکو مارمێلکە حەزی لە گۆڕینە.

❖ گرنگترین چەڵەمە لە ژیانی کچدا ئەوەیە.· ئەیەویٚ بزانیٚ بۆ پیاو تووڕە ئەبیٚ ئەگەر بە دەستێەوە نەدا، ئەشترسیٚ گەر خۆی دا بە دەستی یەوە.

❖ گورە ترین تەگەرە بۆ دایك ئەوەیە بیست ساڵ چاوەڕیٚ ئەکا بۆ ئەوەی کوڕەکەی بێنێتە سەر ڕیٚ.·کەچی کچێکی جوان دێت لە چرکەیەکدا ئەیهێنێتە سەر ڕیٚ ((تۆکس))

❖ گوڵێك بکە بە یەخەی هاوڕێکەتا چاکترە لە وەی لە سەر گۆڕەکەی گومەزێك دروست بکەی. ((ڕوسی))

❖ گوڵ نی یە پەپوولەی لە دەورا نەخولێتەوە.

❖ گاڵتە بە دایك و باوکت مەکە تۆش دەبێ بە خاوەنی منالْ. ((ئەمەرسۆن))

❖ گەڕانێکە هەزار میلیْ بە هەنگاوێك دەست پیْ دەکا.

❖ گوڵێك زۆر کەس بۆنی بکا بۆنی نامێنیْ.

❖ گرنگی لەوە دا نی یە کە دەوڵەمەند بیت، بەڵکو لەوە دایە کە سوود بەخش و خۆشەویست بیت. ((روکفلر))

## - ل -

❖ لە جێگای خۆت دانیشە، کەس ناتوانێ هەڵت سێنێ.

❖ لەغاوی ماین بۆ کەر نابێت.

❖ لە بەر ئەوەی ژیان هەیە، هیوایش دەبێ.

❖ لاوێتی شێتی یە، پیاوەتی هەوڵدانە، پیری جێ ی داخە.

❖ لە وێدا تاریکی نی یە، بەڵکو زانین هەیە.

❖ لە ئافرەتی چەنباز ناشرین تر، پیاوی چەنەبازە.

❖ لە دوو کەس نزیک مەرەوە ئافرەتێک هەموو سامانەکەی جوانی بێ و پیاوێکیش هەموو جوانی یەکەی سامانەکەی بێ. ((هیندی))

❖ لە سەر سوورمانەکانی سەدەی بیستەم ئەوەیە کە ئافرەتێک پێ بە هەڵەی خۆیدا بنێت.

❖ لە فەیلەسوفێکیان پرسی ؟ کام دڕندە بەهێزە وتی ئافرەت.

❖ لە ئازادی واز هێنان وەك لە ژیان وازهێنانە. ((رۆسۆ))

❖ لە بەڵێندا سست بەو لە بەجێ هێنان دا چوست بە. ((ئینگلیز))

❖ لە چۆڵێکدا گرفتاری چەردە بی چاکترە، نەوەك لە کۆشکێك دا هاورازی نەزانێك بی. ((چینی))

❖ لەوە ناترسم دەرگای دۆزەخم بۆ بکرێتەوە، بەلام لە جیرەی خامەی ڕۆژنامە چی دەترسم. ((کاسترۆ))

❖ لە دەرگای خەڵکی مەدە، تا لە دەرگای تۆ نەدەن. ((وێژەی کوردی))

❖ لە سەر گۆڕی نەخۆشێکی دەروونی ئەمە نووسرا بوو :

((پێتانم نەگووت كە من نەخۆش بووم))

❖ لە تێنوسێكی بچوكا، لە گەڵ توودا پێكەنین—ی شیرنیم دۆڕاند كە هەرگیز جیهانمی ڕازاندبووەوە، بەڵام تەمەنێكی تەواوم بردەوە، ئایا لە تۆوە فێری نهێنی ئەشكەنجەی ژیان نەبووم ؟

❖ لاوێك بۆ خۆشەویستەكەی نووسی، من بە خوێنی دڵم بۆت دەنووسم، خۆشەویستەكەی بۆی نووسی یەوە، منیش بە خوێنی دڵم بۆت دەنووسم، پێنووسەكە گوێ ی لێیان بوو، دەستی كرد بە پێكەنین و وتی، هەر دووكتان درۆ دەكەن.. بە خوێنی دڵ —ی من دەنووسن.

❖ لە كاتی كۆڕێكدا منداڵێك گریاو دایكی بردی یە دەرەوە، ئەوەی كۆڕەكەی دەگێڕا ژنەكەی وەستاند وتی : گریانی منداڵەكە بێزارم ناكات، ژنەكەش وتی : دەزانم.. بەڵام هاوار هاواری تۆ منداڵەكەی هێناوەتە گریان.

❖ لاواز ترین مرۆڤ ئەوانەن كە ناتوانن نرخی خۆیان ڕاگرن. ((دانیال))

❖ لە لاویتا كۆی كرەوە لە پیری دا خەرجی كە. ((ئینگلین))

❖ لە ڕۆژێكدا سەد هەلت بۆ هەڵدەكەوێ بۆ خراپی، كەچی لە ساڵێكدا هەلێك هەڵناكەوێ بۆ چاكی. ((زەردەشت))

❖ لە ژیاندا ئەوە بەختیارە كە بتوانێ كەمتر خەرج بكا. لەوەی كە دەستی دەكەوێ.

((فرانكلین))

❖ لە دیاری مردندا گەورەو بچوكی نی یە. ((ماركۆس ئۆربیلۆس))

❖ لە كێویان پرسی ئەو بەرزی یەت لە كوێوە هێناوە ووتی لە دۆڵەكەی بەردەممەوە. ((ئۆسكار وایڵد))

❖ لە تەمەنی لاویماندا هەوڵ دەدەین بۆ گۆڕینی خۆمان،کە گەورە دەبین هەوڵ دەدەین لاوەکان بگۆڕین.

❖ لە خەڵکدا بۆ چاکە بگەڕێ، لە خۆت دا بۆ خراپە. ((فرانکلین))

❖ لە –گا – بترسە کە لە بەردەمی دا بووی، لە –کەر– بترسە کە لە دواوەی بووی، لە –فێڵباز –بترسە لە هەر لایەکی یەوە بێ. ((ئێرلەندی))

❖ لە کاتی تەنگانەدا مردن ترسی نامێنێ.

❖ لە دوای فەرنسا کوڕەکەم خۆشەویسترین شتە لام. ((ناپلیۆن))

❖ لووت بەرز مەبە، بە پارەو سامان چونکە ڕۆژگار یاری ی دەکا بە سامان و جیهان، وەکوو چۆن مناڵ یاری ی بە تۆپ دەکا. ((هیندی))

## - م -

❖ من لە گەڵ شێتانا خۆم وەکو شێت دەنوێنم. ((تیۆگنیس))

❖ مێشوولە ناڕواتە دەمی داخراوەوە. ((ئیتالی))

❖ مرۆڤ بەختیار نابێ، بە ختیارێکەی بە قەد ئەوەیە کە دەیدا. ((لویس برومفیڵد))

❖ مێشوولە دەم و چاوی شیر فرۆش دەناسێ.

❖ مریشك و ژن ئەگەر لە ماڵ دوور کەوتنەوە، ون دەبن. ((ئەسپانی))

❖ من لە سەر هیوا دەژیم و بڕوایشم وایە، ئەوەی بۆ ئەم گێتی یە دێت، دروست کراوی ئەوە.

❖ مۆسیقا.. لە پێش هەموو شتێکەوە.

❖ میری دەسی درێژو دەسی کورتی هەیە، دەسە درێژەکەی بە کار دێنێ بۆ وەرگرتن و گەیشتن بەو جێگایەی دەیەوێ و دەسە کورتەکەش بۆ دان بە کار دێنێ، بەڵام دەگاتە ئەو کەسانەی کە زۆر لە خۆیەوە نزیکە. ((سیلۆنی —ئیتالی))

❖ مرۆڤ ئاوێنەی مرۆڤە تەماشای دەکات و پێویستی خۆی بە جێ دەهێنێ. ((ئیمام عەلی))

❖ مردن ناخۆشترین شت نی یە، ناخۆشترین شت ئەوەیە داوای مردن بکەیت دەستت نەکەوێ.

❖ مرۆڤ وەکو گورگە بۆ مرۆڤ. ((بلۆتۆس))

❖ ماڵ ئەو جێگایەیە کە خۆشمان دەوێت، ئەو ماڵە کە قاچمان بە جێ ی دەهێڵێ..دڵمان بە جێ ی ناهێڵێ.

❖ماڵێکی بچکۆلانەی پڕ،پارچە ئەرزێکی کێلاّو و ژنێکی بچکۆلانەی ئارەزو چاك،ئەمانە هەمووی سامانێکی گەورەن. ((رگون ڕای))

❖مانگی هەنگوین ((شهر العسل))کۆتایی دێت،کە پیاو تەلەفون ئەکات بۆ ژنەکەی ئەڵێت ئەم ئێوارەیە لە نان خواردن دووا ئەکەوم.٠ ئەویش نامەیەکی بۆ جێ هێشتووە تێدا ئەڵێ خواردنەکەت لە نێو ((ثلاجە))کەیە.

❖مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە ئەگەر ژنەکەی تورەی کرد لە پێشا جنێو بە خۆی بدا بەر لە وەی ژنەکەی جنێوی پێ بدا.

❖مرۆڤ کە باوەڕی بە خۆی هەبێ،باوەڕی بە هەموو شتێکی کەیش دەبێ. ((ڤیکتۆر هۆگۆ))

❖میوان و ماسی پاش سێ ڕۆژ بۆنیان لێ پەیدا دەبێ. ((ئینگلیز))

❖مردن لە پێناوی ڕاستی دا چاکترە لە ژیانێك لە گەڵ درۆدا. ((ئەرەستۆ))

❖مەلی نامۆ خوا هێلانەی بۆ دروست دەکا. ((تورك))

❖مریشکی ڕەش هێلکەی سپی دەکا. ((ئینگلیز))

❖مرۆڤ بە هیواوە ئەژێت و پێ یەوە ئەمرێت.

❖منالّ سابوون بە جۆرێ بەکار ئەهێنێ.٠ وەکو بلّێ ی لە ڕۆژانەی خۆی ئەیکڕێ.

❖میواندارى ئاگرێکی داگیرساوەو خۆراکێکی کەمەو خامۆشی یەکی گەورەیە. ((ئەمەرسون))

❖میواندارى ڕاستی لە دڵەوە باوەشێن ئەکاو ناتوانین وەسفی بکەین،بەلاّم پیاوی نامۆ لە هەمان کاتدا هەستی پێ ئەکاو یەکسەر پێ ی ئەحەسێتەوە.
((واشنتۆن ئێزمنك))

❖ من قەرزاری دایکمم بۆ ئەو هەموو سەربەرزێتی یەو ئەو دەسکەوتووەو گەورەیی یە،چونکە سەر کەوتنم بەرهەمی میوەی ئەو بو،لە بیرو باوەڕە ڕاستی یەکانیداو ئەدەبە بەرزەکەیدا. ((ناپلیۆن))

❖ من قەرزاری ئەو هەموو شتەم کە پێ ی گەیشتووم و ئەوەی ئاواتی ئەخوازم کە پێ ی بگەم لە بەرزێتیدا ئەگەڕێتەوە بۆ دایکی پەریم. ((لنکۆلن))

❖ مەزن ترین خۆشەویستی، خۆشەویستی دایکە. ((لنکۆلن))

❖ مار پێش ئەوەی کلکی بقرتێنی سەری پان کەرەوە. ((روسی))

❖ مەی چرای شادمانی یە بەڵام کلیلی وێرانی یە.

❖ مرۆڤـ ـی لات و بێ پارە لە کارواندا لە هیچ ناترسێ.

❖ من ئازادی ئەخەمە سەرووی هەموو شتێکەوە،تەنانەت ئازادیم لە وڵاتیش زیاتر خۆش دەوێت، چونکی وڵاتێك بێ ئازادی هیچە. ((ئین و لمقە فەع))

❖ مرۆڤـ ی بێزار ئەوەیە کە قسە دەکات لە کاتێکا من ئارەزووی قسە کردنم هەیە.

❖ مێشکی مرۆڤـ ئەگەر ڕۆیشت بەلای دۆزینەوەیەکی تازە دا.لە پاش ئەوە هیچ ناگەڕێتەوە بۆ جێگا ڕاستیەکەی خۆی.

❖ مانگی نوێ دایم خەریکە زیاد ئەکاو ئەشنێتەوە تا جەمالی هەر وەکو ڕووی تۆ برازێنێتەوە هەر گەیشتە چواردە ئەو ساتێ ئەگا نابێ بە ((تۆ)) جا لە داخا وردە وردە کەم ئەکاو ئەتوێتەوە. ((عەلی باپیر))

❖ مەپرسە لە مرۆڤـ کە چی دەزانێ لێ ی بپرسە کە چی دەتوانێ، ڕەنگە زۆر شت بزانێ.

❖ من هیچ لە نهێنی خوا نازانم، بەڵام زۆر شت دەربارەی چەرمە سەری مرۆڤەوە دەزانم. ((بوذا))

❖ مێشكی ئافرەت لە تەسك ترە لە كونی دەرزی، تەنها ڕێگەی بیرو باوەڕی خۆی تێدا ئەبینێتەوە.

❖ ماچ كۆتایی دڵداری یە.

❖ مرۆڤـ ـی ژێر ناتوانێ ئارەزووی سەربەستی نەبێ، چونكە هۆش،زمانی سەربەستی یە.

❖ مرۆڤ بۆ ئیش كردن دروست كراوە، هەر وەكو باڵدار بۆ فڕین.. ((مەسیح))

❖ مرۆڤ زێڕە،ئەنجا دەبێ بە زیو، لە پاشان دەبێ بە ئاسن. ((حەبەش))

من ناتوانم ڕەوا بدەم بەو كەسانەی كە درۆزنن و بڵێم كردەوەی چاكیان هەیە.
((مارشاڵ هاڵ))

## - ن -

❖ نهێنی شاردنەوە گرانە، لەویش گرانتر ئاشكرا كردنێتی.

❖ نووسینێك ناژی كە نووسەرەكەی بۆ ئەوە نووسیویەتی كە پیٚ ی بژی.

❖ نــاو دەركــردن، تینــۆتی لاوی یــە. ((لــۆرد بایەرۆن))

❖ نــوقرج لــە خــۆت بگــرە دەزانــی نــوقرج لیٚ گــیراو بــۆ هــاوار دەكــات. ((فەرەنسی))

❖ نیشتمانی مرۆڤ ئەو جێگایەیە، كە حەسانەوەی لیٚ یەتی.

❖ نیسان مانگی دلّداری و درۆیە. ((ساگان))

❖ ناتوانریٚ مافی گەلان بخوریٚ و دەست درێـژی بكرێتـە سـەریان،تەنها ئـەو كاتە نەبیٚ كە ڕاستی یان لە نێوان وون بـوو بـیٚ. ((مـستەفا كامیل))

❖ نازانم كەسانی تر چیان دەویٚ،بەلاٚم ئەوەی من دەمەویٚ یا سەربەستی یـا مردن.

((باتریـــــــك هەنری))

❖ نهێنــی لای ئــافرەت دوو جــۆرە، یــەكێكیان بــیٚ بایەخــەو پێویــست بــە شاردنەوە ناكا، دووەمیان گرنگەو توانای شاردنەوەی نی یە

❖ ناو بانگی چاك لە ڕوخساری جوان چاكترە. ((ئینگلیز))

❖ نیشتمانیە روەری ئەوە نی یە تەنیا بە وتــەی رووت بلّــیٚ ی نیـشتمانەكەم خــۆش دەویٚ، بــەڵكو دەبــیٚ خــۆ بــەخت كــردن و قوربــانی ی پێــشكەش بكــەی. ((سنیكا))

❖ نەکەوتن، شانازی ناویٚ، هەستانەوە شانازی دەویٚ. ((گۆڵد سمیس))

❖ ناشیرنتر هەڵە ئەوەیە کە خۆت وا دابنیٚ ی هەڵەت نی یە. ((کارلیل))

❖ ناکۆکی کرمی ژاراوی یە لە ڕیخۆڵەی گەل دا. ((ناپلیۆن))

❖ ناو بانگ بەری تیٚکۆشانە. ((ڕیٚلّندن))

❖ نهیٚنی بەندی تۆیە، کە بەرەلاٚت کرد تۆ دەبیتە بەندی ئەو. ((ئیمام عەلی))

❖ ناو بانگمان لەو ووتانە دەر دەکەویٚ کە خەڵك لە پاشە ملە دەیگیٚڕتەوە. ((ئەلفەرد پەمبەرسون))

❖ ناوی باش کراسیٚکە لە هیچ کاتیٚك کۆن نابیٚ. ((ئەدیسۆن))

❖ نازانم بۆچی ناشرین و بەد زوو دەگەیەنریٚتە خاوەنی، لە کاتیٚکا ئەو ووشانەی کە بە باشی باسی دەکات لیٚ ی دەشاریٚتەوە. ((سۆمرست مۆم))

❖ نە ء٠ نابی لە دڵی ئافرەت دا فریشتەو شەیتان هەبیٚ چونکی شەیتانەکان تەنها لە دڵی پیاواندا پشوو دەدەن.

❖ نیٚوانی ووڵاتەکان بە جۆریٚك ئاڵۆزراوە، کە باڵیۆزەکانی ئەمریکا لە چەند ووڵاتیٚك دەردەکریٚ تاکو ئیٚستاکە ناومان نەبیستووە. ((ئیٚوا گورنال))

❖ نووزەی دڵدار جوانترین هەڵبەستە، دڵداری ئافرەت ئاوازی بۆ داناوە.

❖ ناتۆرەی باش شتیٚکە مرۆڤ ڕیٚزی ناگریٚ، تا ونی نەکا.

❖ نهیٚنییەك زۆر گرانە مرۆڤ بتوانیٚ ئاگاداری بکات :ئەویش هەستیٚتی بەرامبەر خۆی.

❖ نەفام ئەو کەسەیە کە نهیٚنی خۆی لات باس دەکات دوایی تکات لیٚ دەکات بیشاریتەوە.

❖ نەزان منداڵە گەرچی پیریش بێ.

❖ ناودارێتی وەکو بازاڕە،ئەگەر ماوەیەك تێدا مایەوە بازاڕی کز دەبێ.

((فەرەنسیس بیکۆن))

❖ نەتەوەیەك ئاڵای ئازادی و یەکێتی بشەکێتەوە هیچ کاتێك نانەوێ.

((ناپلیۆن))

❖ ناشێ بۆ مرۆڤێك کە خۆی دەستی پیس بێ و پەنجە درێژ بکا بۆ عەیبی خەڵکی تر. ((ئیتالی))

❖ نیشتمانپەروەر هەستێکە بڵێسەی بەرز دەبێ،هەر کاتێك خەم و دژواری نیشتمان زۆر ترو زل تر بێ. ((مستەفا کامل))

❖ ناتوانی مەلی خەفەت و ناسۆر قەدەغە بکەی بە سەرتا بفڕێ بەلاّم دەتوانی نەیهێڵی لە مێشکتا هێلانە بکا. ((چینی))

## - س -

❖ سەیری سپێتی مێزەر مەكە،دوور نی یە سابوونەكەی بە قەرز كرابێ.((تورك))

❖ سێ كەس مەیان دەخواردەوە،شێتێك بە لایانەوە تێپەڕ بوو داوایان لێ كرد لە گەڵیانا بخواتەوە، وتی ئێوە دەخونەوە وەكو منتان لێ بێت ئەی من كە خوارد مەوە وەكو كێم لێ بێت.

❖ سەرخۆشی زیاد دەبێ. بە جۆرەی تاڵی مەیەكە. ((ئیتالی))

❖ سەرەڕای ئەوەی خۆراك بدەین بە گورگ،چاوی هەمیشە لە ئێسقانە. ((ئیڤان تورغنیف))

❖ ستایش ئەوەیە، لە پاش مردنت وەری دەگری.

❖ سكی بتاڵ ئازاترە لە سەری پڕ. ((ئەڵەمان))

❖ سنگی مرۆڤ گرنگترین سەندووقە بۆ شاردنەوەی نهێنی یەكانی. ((یابانی))

❖ سكی برسی و بەتاڵ ووشەو ئامۆژگاری پێ هەزم ناكرێ. ((ئەنشتاین))

سەرەكی كۆمەڵی شەیتانەكان لە بەر دیمەنی نووسەرێكی سیاسی دەلەرزێ. ((ولیەم ستید))

❖ سامان كە هاتە زمان، ماف بێ دەنگ دەبێ. ((روسی))

❖ سەربەستی نادرێ دەسێنرێ،كە سەندیشت بزانە چی لێ دەكەی ((دیمون دیسین))

❖ سەربەستیت كە لە دەست دەرچوو ئیتر چی تر دەمێنێ كە لە دەست نەچێ ؟ ((سویدی))

❖ سەربەستیم بدەنێ بە جۆرێك كە خۆم دەمەوێ بیر بكەمەوە. باوەڕم ببێ و ئەوەی لە دڵمایە، ئەم چەشنە سەربەستی یە لە هەموو سەربەستییەكی تر باشترە.

((میلتۆن))

❖ سەربەستی لە هەر جێگایەك بوو، نیشتمانیش لە وێ دایە. ((رۆسۆ))

❖ سوپاسی سەرەتا مەكە تا كۆتایی نەبینی. ((ئینگلین))

سێ شتم لە ژیان دا خۆشویستووەو لێیان تێنەگیشتووم، (سان)و (ئافرەت)و (وێنە)

((بلزاك))

❖ سەری مار بە دەستی دوژمنت پان كەرەوە،چونكی هەر یەكێ لە مانە تیا بچێ كەڵكی لێ وەر دەگری، ئەگەر دوژمنەكەت سەركەوت ئەوا مارت كوشت، ئەگەر ماریش سەركەوت ئەوا دوژمنەكەت كوشت.

❖ سەركەوتن شێوەیەكە، ئۆقرە نازانێ.

❖ سێ ڕێگا هەیە بۆ فەوتان و وێران كردن كە پیاوە ڕامیارەكان دەیگرن ئافرەت و قومار و.. وە.. بانگ كردنی شارەزاكان. ((جۆرج پۆمپیدۆ))

❖ سێ شت لە ژیانما زۆر ماندیان كردم... ڕێزمان، هەژاری، ئافرەت. ڕێزمان،بە زۆر خوێندنەوە،زاڵ بووم بە سەریا. هەژاریش،پەلەم نەكرد تاكو بە سەریا زاڵ بووم. بەڵام ئافرەت،تا ئەمڕۆ هیچ چارەییم بۆ نەكراوە. ((سوكرات))

❖ سێ شت تێك ئەچێ ئەگەر یەكێ لە مانەی تێدا نەبێ. ژن هێنان بێ خۆشەویستی، گەڕانێكی بێ پارە،سامانێكی بێ منال.

❖ سەرم سووڕ ئەمێنێ لەو پیاوەی ژن دێنی و دوایی خۆی ئەكوژێ. چۆن توانی دوو جار خۆی بكوژێ.

❖ سەركەوتن بە سەر نەزانینا لە هەموو سەركەوتنێك گەورەترە و خۆشترەو پەشیمانی لە دووا نی یە. ((ناپلیۆن))

❖ سەربەستی زۆر بە ئازارو دێتە دەست، بەلاّم زۆر، بە ئاسانی لە دەست دەدرێ، وەكو تۆپێكە لە لوتكەی چیا یەكەوە گلۆری بكەیتەوە. ((ئەنتۆنی كرۆپ))

❖ سەر خۆشی بە بێ مەی پیس ترین سەر خۆشی یە.

❖ سامان وەك شوشە وایە چەند پاك و بێ گەردە بەلاّم زوو دەشكێ.

## - ش -

❖ شەوانی ژیان، چرا لە گەڵ خۆیدا هەڵدەگرێ. ((جۆزیف جۆبێر))

❖ شاعیر داهێنەرێکی گەورەیە لە ئیشەکەیدا، ماسولکەیەکی ئاسینینی دروست کردووەو سەرێکی ناوداروو ملێکی بە هێزو دەس و مەچەکێکی هەمیشەیی و چاوێکی کەیف خۆش. ((ئیتالی))

❖ شەرەف چی یە، تەنها ووشەیەکە. ((شکسپیر))

❖ شێریش هەموو کاتێ گۆشت ناخوات.

❖ شەیتان ئافرەتی قووت دا.·· بەڵام پێ ی هەزم نەکرا.

❖ شاعیر ئەو کەسەیە، چنگێ ووشەیە؟

❖ شاعیر ڕاستگۆترین مێژوو نووسە. ((جیمس ئەنتۆنی فرود))

❖ شاعیری مەزن بە نرخترین مرواری یە لە میللەتا.··· ((بتهۆفن))

❖ شۆڕش وەکو لەشە ئازایەتی گیانێتی، پیلان دڵیەتی، سڵ کردن چاوێتی، فێڵ زمانێتی، دڵسۆزی پێشەوایەتی، مل کەچی دەستێتی و سەرکەوتن بەشیەتی.

❖ شەیتان مامۆستای پیاوەو قوتابی ئافرەتە.

❖ شرینی ئافرەت، وەکو گوڵە زوو سیس دەبێتەوە.

❖ شۆڕشی ڕاستەقینە ئەو شۆڕشەیە کە تۆوەکەی لە دڵی مرۆڤدا ڕۆژگار چاندبێتی.

❖ شانۆ گەریی سەرکەوتو پێویستە وەکو کڵێسە وابێ، نەزانرێ کێ دروستی کردووە·

((جان گیرۆدۆ))

## - ف -

❖ فرمێسك هێزێکی ئاوی یە لە ژنانا.

❖ فرمێسکی ئافرەتی جوان، خۆشترە لە زەردەخەنەی.

❖ فرمێسك —نیشتمان دەمرێنیٚ و خوێن زیندووی دەکاتەوەو قوربانی هێـزی پیٚ دەدا.

❖ فیزو بایی بوون نیشانەی گەوجێتی یە.

❖ فرە بەخت ئەو کەسەیە کە لە قەوماوی ڕۆژگاری خـۆی بزانـیٚ و تـیٚ بگـا. ((چینی))

❖ فەرمانێکی بچوکی جیٚ بە جیٚ کراو لە ملیۆنێك نیازی جیٚ بە جـیٚ نـەکراو چاکترە.

❖ فێر بـە چـۆن خـۆت دەخەیتـە —قـالّبی —ئـەو کۆمەڵـەی لـە گـەڵیا نایـت. ((لۆردفیلد))

❖ فرمێـسك ڕشـتن نیـشانەی خۆشەویـستی یـە، بـەلاّم دەرمـان نـی یـە. ((شکسپیر))

## - ق -

❖ قژی سپی ئەرشیفی ڕابوردووە. ((ئەدکار ئەلەن))

❖ قسەی چاك و بیری چاك بە کەڵك نایەن، ئەگەر فەرمانی چاکیشیان لە گەڵدا نەبێ.

((لاشۆسیێە))

❖ قینم لەو خاوەن ماڵانەیە کە خۆراکی چەند ڕۆژێك لە یەك ڕۆژ دا خەرج دەکەن.

((ئەبو بەکری سدیق))

❖ قوتابخانەی سەختی و تەنگانە چاکترین قوتابخانەیە کە مرۆڤی تێدا دەپاڵێورێ و ڕەوشتی چاکی تێدا فێر دەبێ.

❖ قورسترین تەنگانە ئەو کاتەیە کە مرۆڤــ لە کاتی خۆشی دا، یادی خۆشی پێشووی بکاتەوە. ((دانتی))

❖ قومار چی و دز لە یەك دەستەن. ((روسی))

❖ قوور، یاقوت دەشارێتەوە، بەڵام پیسی ناکات.

❖ قەلەڕەشی پیر، بە هەڵە ناقیڕێنێ. ((روسی))

- ر -

❖ ڕاستی یەك ڕێگای هەیەو چەوتی هەزار.

❖ ڕۆژنامە بە هێزترین پایە یە کە شارستانێتی وئاوەدانی لە سەر دادەمەزرێ.

((ناپلیۆن))

❖ ڕاستی پتەوە وەك ئەڵماس و ناسکە وەك گوڵ. ((غاندی))

❖ ڕێگرەکان داوای پارەت لێ دەکەن یا ژیان، بەڵام ئافرەت داوای هەر دوو کیان دەکات. ((سمۆئیل بتلر))

❖ ڕاژەی گەل بە پێنج جۆر دەکرێ بە -ژیان و خوێن و ئیش کردن و پێنووس و بە بێدەنگی. ((جۆنسۆن))

❖ ڕشت بە لە سەر خۆناسین،چونکە خۆناسین گرانترین ئیشێکە لە ژیانی ئادەمیزاد دا. ((سرڤانتس))

❖ ڕەنگە بۆقی وا هەبێ کە قیڕەی لە بۆڕەی -گا- گەورە تر بێ، بەڵام -بۆق- ناتوانێ -گاسن - ڕاکێشێ و پێستشی بە پێڵاو ناکرێ.((جوبران خەلیل جوبران))

❖ ڕۆژنامە و چاپەمەنی چەکێکی هێمنکارن بۆ ڕوخاندنی زۆرداری و بێدادی.

❖ ڕامیاری، هونەری هەڵفریواندنەو مەیدانێکی فراوانی لە هۆشە لاوازەکان بۆ دە دۆزێتەوە.

❖ ڕەزیل چاو تیرە لە شەرەفیا بە گوێرەی ڕەزیلی پارەکەی،چاو تێریش ڕەزیلە لە شەرەفیا بە گوێرەی چاو تێری لە پارەکەی دا.

❖ ڕێزگرتنی یاسا، یاسای خوو ڕەوشت لە ماڵەوە، دوایی لە قوتابخانەوە،دەس پێ دەکات ئەگینا بە هیچ جۆرێك دەس پێ ناکات.

❖ ڕاستی باش نی یە هەمووی بووترێت. ((ئینگلین))

❖ ڕابووردووی پیاو لە بیر دەچێتەوە، بەڵام هی ئافرەت لە بیر چوونەوەی نی یە.

((نیومان))

❖ ڕووبار هەمیشە سەرچاوەکەی پاکترە. ((باسکاڵ))

❖ ڕێزی هەژارو لێ قەوماوان بگرە، بە تایبەتی خۆشەویستی لێ قەوماوت.

❖ ڕێگەی سەر بە خۆیی دەبێ خوێن پاکی بکاتەوە. ((غاندی))

❖ ڕێزی وەتەکانت پتر بگرە لە ڕێزی سوێندکانت. ((دیۆجنیس))

❖ ڕاستی دەبێ بە پێنرێت بە بێ توندو تیژی. ((تۆڵستۆی))

❖ ڕاستی ئامادەیە هەموو کات. ((ئەمرسۆن))

❖ ڕێوی پێستی دەگۆڕێ، نەك ڕەوشتی. ((سویتۆن))

❖ ڕاستی وەکوو ڕۆژ وایە هیچ هێزێك نی یە،هەڵاتنی دووا بخا. ((وێندڵ))

## - ت -

❖ توانای گەنجان و هۆشی پیران كۆببنەوە هەژاری دەبێتە شتێكی ئەفسانە.

❖ تف لەو ژن و مێردەی كە بە سەر زاری خۆشەویستی یەكترین و لە دلا لە یەك بێزارن.

❖ تا ئەو ڕادەیە كە بەختیارین، پێویستە بە قەد ئەو بەختیارە ئازارمان چێشتبێ.

((ئەدگار ئالەن بۆ))

❖ ترس و لەرزت بۆ خۆت بێ وئازایەتی و توانات پیشان خەڵك بدە.((فەرەنساوی))

❖ تاو لەزەتی بیركردنەوە، دەرمانە بۆ برینەكانی دڵ. ((مەدام دۆستاڵ))

❖ تۆڵە سەندن دەبێ لە یاد نەكرێ، بەڵام نابێ باسی كەی. ((كامبتا))

❖ تۆ باش بە، جیهان هەمووی باش دەبێ.

❖ تاریكی نەزان چاكترە لە ڕووناكی درۆزن. ((جان جاك رۆسۆ))

❖ تەماشای ئافرەت لە یاسا بە هێزترە، فرمێسكیشی لە بەڵگە بە هێزترە.

❖ تورە بوون هۆش لە سەر دەر دەكاو دەرگای گەڕانەوەی لێ دادەخا.

❖ تورە بوون شێتی یە، دووایەكەی پەشیمانی یە.

❖ تا بەرز بیتەوە، كەوتنت بە ئازارتر دەبێت.

❖ تورەیی ئەو ڕەشەبایەیە كە چرای بیر كردنەوە دەكوژێنێتەوە.((پۆلۆنی))

❖ تەمەڵ بڕۆ سەیری مێروولە بكە. ((حەزرەتی سلێمان))

❖ تۆ چۆنی بۆ من منیش وام بۆ تۆ. ((ئینگلین))

❖ تێکۆشەر لە سەرتە بە کردار قەرزی ژیان بدیتەوە.. تەمەڵ سامانی ئەو گەلە دەدزێ کە لە گەڵیان دا دەژی. ((ڤۆلتێر))

❖ تەنها پیاوی بچووك لای وایە، شتی بچووك بایەخی نی یە.

❖ تا ئافرەت بمێنێ چوونە بەهەشت شتێکی زۆر دوورە. ((کلودین))

❖ تەنگانە کاتی تاقی کردنەوەی دەروونی ئادەمیزادە.

❖ تۆڵەی تاوان دەبێ بە چاکەو لێبوردن و بەخشین بسەنرێت.((تۆلستۆی))

❖ تاقە ووشەیەکی ناسك و خۆش و بە سوود، بە زیندویی ببیستم لام گەلێك چاکترە لە لاپەڕەیەك پیا هەڵدان و ستایش دووای مردن. ((ڤۆلتێر))

❖ تۆ ئەگەر لە سەر حەق بی،دەتوانی دەماری خۆت بگری و تووڕە نەبی... بەڵام ئەگەر بزانی لە سەر هەق بیت و بە هەڵەدا چووی، لە قسەی تاڵ و سوێر بەو لاوە هیچت دەسگیر نابێ ڕای خۆتی پێ بسەپێنی. ((غاندی))

❖ تەنها کردەوەی چاك لە خاکدا بنج دا دەکوتێ.

## - ح -

❖ حەزرەتی سلێمان لە مێرولەیەکی پرسی : ساڵی چەندی دەخۆی ؟
مێرولەکە وەڵامی دایەوە سێ گەنم دەخۆم. حەزرەتی سلێمان مێرولەکەی بردو خستی یە ناو قوتویەکەوە لە گەڵ سێ دەنکە گەنم دا، کە ساڵ تەواو بوو،حەزرەتی
سلێمان تەماشای کرد مێرولەکە گەنم و نیوێکی خواردووە.٠ حەزرەتی سلێمان پرسی : بۆچی گەنم و نیوێکت ماوە. مێرولەکە وتی : کاتێ من بەرەڵلا بووم و بەند
نەبووم دەمزانی خوا من لە یاد ناکا.٠ بەلام پاشان تۆ منت خستە ناو قوتویەکەوە
لەوە ترسام لە یادت بچم لە بەر ئەوە لە خواردنەکەم هێشتەوە بۆ ساڵی داهاتوو.

❖ حەوت ساڵ لێ ی بکۆڵەرەوە، بەر لە وەی هەواڵێك بسەلمێنی. ((یابانی))
❖ حکومەتە زۆردارەکان لە درەندەی کێوی خراپترن. ((چینی))
❖ وەڕینی سەگ زیان بە هەور ناگەیەنێ. ((عەرەب))

## - ع -

❖ عـەیب وەكـو ئاژەڵـە، قەڵـەو دەبـێ، تـاكو كـاتی سـەبڕینی دێ. ((بـن دگۆنسۆن))

## - خ -

❖ خراپە كردن لە پاشت بە جێ دەمێنێ، چاكە زۆر جار لە پاش خـۆت گـۆڕ دەكرێ

((شكسپیر))

❖ خوا دەرگای زۆری داوە بە – ڕاستی – هەر كەسێك بـە دەسـتی بـاوەڕ لێ ی بدا دەیكاتەوە. ((میخائیل نەعیمە))

❖ خۆڵەمێشی مردووەكان وولاّتی دروست كردووە. ((لامارتین))

❖ خۆ پەرست هەمیشە لە بەردەممتا باسی خۆیت بۆ دەكا، هەروا دەسووتێ بۆ ئەوەی باسی بكەیت لە بەردەممیا. ((مەرسێل ئێمیە))

❖ خوا یارمەتی ئەوانە دەدا، كە یەك یارمەتی یەك دەكەن.

❖ خۆشەویستی لە ژیان بە نرخ ترە، شەرەفیش لە ماڵ بە نرخ ترە، لە هەر دووكیش بە نرخ تر و گرانتر، بەڵێن دانە. ((ئەدمۆن سپنسەر))

❖ خوا وولاّتی دروست كردووە و مرۆڤیش شار. ((كۆبەر))

❖ خراپە هیچ كاتێ تووش پیاوی چاك نایەت، نە لە ژیانیاو نە لە مردنیا.

❖ خەفەت مەخۆ،خەفەت هەنگێكە بۆنی جوانیت دەمژێ.

❖ خۆشەویستی دایكایەتی ئەو هەستەیە كـە هـەموو ئـافرەتێ هەسـتی پـێ ئەكا، لە پاش ئەوەی كە مناڵەكانی ئەخەون.

❖ خانم گیان ئەڵێن لە دووای هەموو پیاوێكی گەورە ئافرەتێكە، بەلاّم بڕوام پێ بكە لە دووای هەموو ئافرەتێكی گەورەوە كۆمەڵێ پیاو هەیە.

❖ خۆشەویستی وەك نەخۆشی ئاوڵە وایە ئەگەر وەختی بە سەر تێپەڕی کوشەندەیە.

((ئینگلین))

❖ خەڵکی بە هیچ ڕازی نابن : ئەگەر کوڕێك حەزی لە کچێك کرد پێ ی ئەڵێن خراپە، ئەگەر خوازبێنی کرد پێ ی ئەڵێن کوڕی چاکە،ئەگەر خواستی ئەڵێن نەفام و کەرە.

❖ خوا لە وانە خۆش نابێت کە شیرنی دڵداری ئەگۆڕنەوە بە تاڵی.

❖ خۆشەویستەکەم دە ساڵ لە گەڵ تۆدا بم لام دە دەقیقەیە، بەڵام دە دەقیقە لە تۆ دوور بم لام دە ساڵە. ((لۆرد بایەرۆن))

❖ خوا لە گەڵ هێزدا نی یە، لە گەڵ ڕەوادایە. ((روسی))

❖ خەڵکی دوو دەستەن، دەستەیەکیان ڕاستەو خۆ بەرەو ئامانج دەڕواو شتێك دەکەن... دەستەکەی تریان هیچ خەمێکیان نی یە ئەوە نەبێ دا دەنیشن و دەپرسن بۆ چی ئەم کارەیان بە ڕێگایەکی تر نەکرد. ((ئۆلیڤەر ویندڵ))

❖ خراپترین چەکێك کەنامەردان بە دەستی وە دەگرن بوختانە. ((ملیتۆن))

❖ خواو دایك و باوك و مامۆستا ناتوانرێ پاداشتیان بدرێتەوە. ((ئینگلین))

❖ خۆشەویستی مێژوویی هەموو ژیانی ئافرەتە بەڵام سەردەمێکی تایبەتی یە لە ژیانی پیاودا. ((دی ستایل))

❖ خۆشەویستی پیاو بە گفتو گۆدا دەر دەکەوێ بەڵام هی ئافرەت بە ماچ و زەردەخەنەدا. ((ڤۆڵتێر))

❖ خۆت چاك بە، خەڵك بۆت چاك دەبن. ((ئەبو بەکر ئەلسدیق))

❖ خۆشەویستی و ئیش و خێزان و ئایین و هونەر ووشەیەکی بەتاڵە لە هەموو مانایەك بۆ ئەو کەسەی برسی یە.

❖ خۆزگە دەمتوانی تەماشای هەموو گیان لە بەرێکم بکردایە بەچاوی هاوڕێ یەتیەوە.

❖ خوا نانی هەموو باڵدارێك دە دا، بەلأم بۆی ناخاتە هێلانەکەیەوە. ((هۆلأند))

❖ خۆر بەو مەزنی یە کە هەیەو ئەو هەموو ئەستێرانە بە دەوریا دەسوڕێنەوە، ئەوەی لە یاد نەچێ کە میوەیەك بە سەر درەختێکەوە ماوە پێ بگا.. وەك بلێ ی لەم گەردوونە پان و بەرینە دا کارێکی تری نەبێ بیکا. ((گالیلۆ))

❖ خۆشەویستی، هەستێکی خاوێن و پیرۆزە، کامەرانمان دەکات و دەروونی خاوێنمان دەگەیەنێتە جیهانی فریشتەو ئەو پیاو چاکانەی کە شاعیران لە شیعرەکانیان دا باسیان کردووە. ((راسل))

❖ خێرا بمرین چاکترە لە وەی چاوەڕوانی مردن بکەین. ((یابانی))

❖ خۆشترین کاتی ژیانم ئەوە بوو کە لە ناو خێزانەکەم دا دەبووم و لە گەڵ ناخۆشی و گیرو گرفتە کانیان دا دەژیام. ((جیفەرسۆن))

# بەشی دووەم

## پێشەكی

خۆینەرە بەرێزەكان ــ بەشی یەكەمی ((ووتەكانی ژیان))٠ لە ماوەی مانگێكدا لـە كنێبخانەكانـدا نـەماو هەنـدێ لـە خوێنـەرانیش بەردسـتیان نەكـەوت، تـاكو ئێـستاكەش خـاوەنی كتێبخانـە كـان داوام لێ دەكـەن.لـە ڕاسـتی دا مـن و هـەموو نووسەرێك هەسـت دەكـەین، جـەماوەری خوێنـەر انمـان زیـادی كـردووەو ئەمـەش مایەی شانازی و دڵ خۆشیمانە. بەشی دووەمی ووتە كانی ژیان دیسانەوە برێتیـە لە بەرهەمی گەورەپیاوانی ئەم جبهانە، دەربارەیی ژیـانی كۆمەڵایـەتی و ئـابوری و ڕامیاری و هەموو لایەنەكانی ئەم ژیانەیە، بۆ ئەم مەبەسـتە پـەنامان بـردەوە سـەر كنێبەكەی سمیر شێخانی ((**من حصاد الفكر العـالمی**))كـەزۆر بـەی ووتـەكانی ژیـان لـەوەوەوەر گێـراوە لـە گـەڵ چـەند گۆڤارێـك و ڕۆژنامەیـەك دا. لـە یەكـەم بەشـی ووتەكانی ژیان ووتم ـ ووتەیەكی ئیتاڵی هەیە دەڵێ ((وەرگێر ناپاكە))، ئەم ووتەیە ڕسـتی یـەكی تێدایـە، چـونكە وەر گێـر زۆر جـار مەبەستەڕاسـتی یەكـە ناداتـە دەسـتەوە، بـەلاَم ئـەوەی گرنگـە لـە لای ئێمـە بتـوانین لـە مەبەسـتەكانیان نزیـك ببینـەوەو گەنجینەیـەكتان پێـشكەش بكـەین و سـوودی لێـوەر گـرین. دیسانەوە

دەڵێم، ئەگەر چی لە گەڵ هەندێ ڕادا نین، پێویستە خوێنەر خۆی سوود لەوانە وەر گرێ کەچاك و بە پێزو پڕ مانایە. ئەوەی گرنگە ئەوەیە، ئێمە بتوانین کتێبیکی کە بخەینە ناو کتێبخانەی کوردی یەوە بۆ خزمەتی گەلی کوردمان و کورد ناسەکان. خۆینەرە بەرێزەکان ـ داوای لێ بوردن دەکەم ئەگەر کەم وکوری یەك هەبوو، چونکە شاکارێی وا گەورە بێگومان لە هەڵە بە دەر نابێ.

محمد عبدالحمن زنگنە

کەرکووك

١٩٨٤/٥/٢٠

## - ئا -

❖ ئافرەت لە پلەی ژیانیدا :ـ

لە ١٤ ساڵیدا، گوڵێکە، هێشتا بۆنی دەر نەچووە..

لە ١٦ ساڵیدا وەکو دار سەرو وایە، لە گەڵ شنەی شەماڵدا دەلەرێتەوە بۆ ئەوەی دڵی لاوان ڕاکێشێ.

لە ١٨ ساڵیدا کانی یەکە، گیا دای پۆشیوە.

لە٢٠ ساڵیدا، خۆرە ((هەتاوە)) گەرمایی دەدا تاوێك، جار جاریش دەتسووتێنێ.

لە ٢٢ ساڵیدا، مانگە، تا بێ گەش دەبێتەوەو چاویش ڕووناك دەکاتەوە.

لە ٢٤ ساڵیدا،گوڵێکی کراوەیە،تەماشاکەر بە ئاواتەوەیە بۆنی کا.

لە ٢٦ ساڵیدا، سێوێکی گەیشتووە، ئەگەر نەیبچڕی بۆگەن دەکا.

لە ٢٨ ساڵیدا، ئاسکەیەکە،ڕاوچی لە پارێزیا،کەچی ئەو هیچ گوێ پێ نادا.

لە ٣٠ ساڵیدا،شنەی دەریاە،مرۆڤ ئاگادار دەکاتەوەگیانیش دەگەشێنێتەوە.

لە ٣٥ ساڵیدا، مۆمێکە،تا بێ ڕووناکیەکەی کز دەبێتەوە.

لە ٤٠ ساڵیدا،باخچەکە،پایز بە سەریا دێی و یاری بە جوانیەکەی دەکا.

لە ٤٥ ساڵید، بەرداخێکی،ئاوی گەرمەو مرۆڤ لە هاوینا تینووەو بە ناچاری دەیخواتەوە.

لە ٥٠ ساڵیدا، دارێکە،مرۆڤ لە ژێر سێبەرەکەیدا دەحەسێتەوە.

لە ٦٠ ساڵیدا، پەرتووکێکی گەورەیە، پەتەکەی بچڕاوەو خەریکە بڵاودەبێتەوە.

❖ ئازار، ئەو تاڵە دەزووەیە، کە قوماشی هەلی لێ چنراوە مرۆڤی هیوا دار هیچ کاتێ تامی خۆشی نازانێ.

❖ ئەوەی لە کەس نەترسێ، کەسیش لێ ی ناترسێ.

❖ ئەوەی بە دووای هەڵەدا بگەڕێت، لە هەڵە بەو لاوە هیچی تر نادۆزێتەوە.

❖ ئەوەی دڕك بچێنێ، نابێ بە پێ ی خاوسی بگەڕێ.

❖ ئەوەی سەبری هەبێ، دەتوانێ هەموو شتێك جێ بە جێ بكا. ((ڕابلیه))

❖ ئازار، دوو كاتی خۆشی، كارمان تێ دەكا.

❖ ئەو كەسەی بیەوێ مەشخەڵێكی بەهیز داگیرسێنێ لە ناكاودا، دەبێ بە كەمێ پووش دەس پێ بكا.

((شكسپیر))

❖ ئافرەتی عاشق، دەتوانێ لە خیانەتی واز بێنێ، بەڵام پیاو ئەوە ناتوانێ.

❖ ئەو ژنەی پێویستە خۆش بویسترێ، دەتوانێ بەختی خۆی بخوێنێتەوە لە داری (لاولاو)دا، كە دەمرێ ئەگەر خۆی هەڵنەواسێ.

❖ ئافرەت تێهەڵچون، لە ئەقڵ بە باشتر دەزانێ.

❖ ئێوە پێویستان بە پێشەوایەكی ئیش كەر هەیە، نەك پێشەوایەك هەر قسە بكات.

❖ ئەگەر وەكو خەڵكی خۆمان بدیبایە، خۆمان دەشاردەوە.

❖ ئیش كردن و پیشە سازی جوانی پیاوە،وەكو خۆشەویستی و دایكایەتی جوانی ژیانی ژنە. ((هەنری بۆردۆ)) ١٨٧٠ – ١٩٦٣ لە كتێبی (بەردی ماڵ))

❖ ئەو كەسەی بییەوێ كچێك خۆشی بوێ، پێویستە یەكەم جار بتوانی دایكی ڕازی بكا. ((جۆن ڕای))

❖ ئەو پیاوە بەختیارە كە هەموو شتێك، بە ژنەكەی دەڵێ. ((ستندال))

❖ ئەو كەسەی لە حاڵەتی دالّداری دا بێت وەكو ئەو كەسەیە لە حاڵەتی وورینەدا بێت.

((تێرنس))

❖ ئەو ماچانەی بە دزیەوە دەكرێ، زیاتر شرینە. ((لای هەنت ))

❖ ئەی خۆشەویستی، هیچ كەسێك ناتوانێ بەرانگیرت بێ، تۆ بە سەر زێرپیشدار سەر دەكەوی. ((سوفۆكلیس))

❖ ئەگەر جوانی شاردرابێتەوە لە دووای بیست قفڵەوە خۆشەویستی دەیشكێنێتوو هەموویان داگیر دەكا. ((شكسپیر))

❖ ئەوەی گومان لێیەتی دەیبینین، ئەی چۆن باوەڕ بەوە بكەین لە پاش ملە باس دەكرێت ؟.

❖ ئەو دارەی سەری لە ئاسمان دەدا، لە تۆوێكی بچووك بووە.

❖ ئەو خانووە دیمەن جوانە، كە حەوت نهۆمە، لە كۆمەڵێ خۆڵەوە دروست بووە.

❖ ئەو پیاوەی پێشوازی لە میوان لە ماڵەوە نەكا،لە سەفەردا خانە خۆیی كەم دەبێ.

❖ ئەو كەسەی ئازار زۆر بچێژێ، زیاتر فێر دەبێ. ((ئیزۆب))

❖ ئەگەر ئێمە لە گەڵ چەكدارا بجەنگین،واتە ئێمە دوو جار چەك دارین.((ئەفیلۆس))

❖ ئەوەی دانسقە بێ، بە نرخە. ((ئەفیلۆس))

❖ ئەو كاتەی شاخی مانگا دەگرین، واتە مانگا كە دەگرین. ((سترابۆ))

❖ ئەوەی بترسێ كۆیلەیە. ((سینیكا))

❖ ئێوە لە بیرتان چووە كە میوە هی هەمووتانە، كەچی ئەرز هی كەس نییە.

((جان جاك رۆسۆ))

❖ ئیش كردن مەرجێكی دابڕاوەیە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی و ئەو چاوگە ڕاستییەیە بۆ خۆشگوزەرانی مرۆڤایەتی.. ((تۆڵستۆی))

❖ ئیش کردن هەموو شتێکە، بەرزەوە بوون هیچ نی یە. ((گۆتە))

❖ ئاگات لە دوکانەکەت بێ، دوکانەکەت ئاگای لە تۆ دەبێ. ((جۆرج تشابمان))

❖ ئەگەر بتەوێ لە لای خەڵکی خۆشەویست بیت پێویستەخۆتت لە بیر بچێ ((ئۆفید))

❖ ئەوەی بۆ تۆیە بۆ منیشە، ئەوەی بۆ منیشە بۆ تۆیشە. ((بلۆتس))

❖ ئەگەر ویستت چاکەیە، بکەی، بە پەلە بیکە، ئەوەی بە پەلە بکرێت زوو قبوڵ دەکرێت، ئەوەی لە سەرخۆ پێشکەش دەکرێ زۆر باش پێشوازی ناکرێ.

((ئۆزۆنیوس))

❖ ئەوەی ئامۆژگاری یەك پێشکەش بکا، یارمەتیەکی پێشکەش کردووە ((بلۆتس))

❖ ئافرەت یا خۆشەویستی دەوێ یا رقی لێ یەتی،رێگەی سێهەمیش نی یە.

((بوبلیلیوس))

❖ ئەگەر پێستی شێر و پڵنگ نەبوو، با پێستی رێوی بێ. ((یۆنانی))

❖ ئەو رۆژەی ئیش نەکەین ماندوومان دەکا، وەکو ئەو شەوەی تێدا نانوین.

❖ ئەو بەردانەی تیان دەگرین، زاناکان رێگایەکی تازەمان بۆ درووست دەکەن.

❖ ئەوەی بیر لە بەختیاری خەڵکی بکاتەوە، بۆی هەیە داوای بەختیاری بۆ خۆی بکا

((مۆرۆی))

❖ ئەگەر ئەو شتە وانەبو پێ ی هەڵمەسە، ئەگەر راستیش نەبوو قسە مەکە.

((مارکۆس ئۆربیلوس))

❖ ئەو ئیش و كارەی لە بەردەمتایە، بە چاكترین شێوە پێی هەڵسە. ((بیتاكۆس))

❖ ئێمە ئەوانە بە كامەران دەزانین كە لە تاقی كردنەوەی ڕۆژانەی خۆیان فێر بوون بەرگری ئارەزوەكانیان بگرن نەك لە ژێریدا بناڵێنن. ((جۆفینالٚ))

❖ ئەو كەسەی بیەوێ بگاتە مەبەستێكی تایبەتی پێویستە یەك ڕێگا بگرێ، نەك چەن ڕێگایەك. ((سینیكا))

❖ ئەگەر سەر نەكەوینە سەر شاخەكان، نازانین ئاسمان چەندە بەرزە.

❖ ئەوەی لە گەڵ سەگدا بخەوێ، لە گەڵ كچێدا هەڵدەستێ.

❖ ئەفریقی یەكان دەڵێن ((ئەو زمانەی كە ئێسكی تێدا نی یە. ئەم بچكۆلە لاوازە بۆی هەیە بپلیشێنێتەوەو بكوژێ)).

❖ ئەو كاتەی مرۆڤ برادەری ڕێك و پێك دە دۆزێتەوە. ئەو كاتە كۆمەڵ درووست دەبێ. ((ئەمرسۆن))

❖ ئەو كەسەی لە گەڵ برادەرەكەیدا چاكە دەكا، چاكە لە گەڵ خۆیدا دەكا. ((ئیرازمۆس))

❖ ئەوانە دەوڵەمەندن، كە برادەری موخلیسیان هەیە. ((تۆماس فۆلەر))

❖ ئەگەر مرۆڤەكان قسەیان بكردایە، مێژوو دەبووە كۆمەڵێك درووی هیچ و پووچ.

❖ ئەگەر سگ برسی بوو، چاو كوێر دەبێ.

❖ ئەو كەسە بەهێزە، ئەگەر تووانای بە سەر خۆیا هەبێ. ((سینیكا))

❖ ئەو كاتەی ماڵی یەكێك پڕ دەبێ لە سەگی كێوی، ئەو كاتە پێویستە بۆ ئاشتی بگەڕێن لە جێگایەكی تر. ((بێرلٚ باك))

❖ ئەو ژنانەی کە ناسراون،ژنانی خۆشەویستی یە،باوکی هەڵەیەو دایکی پێویستی یە.

❖ ئەوەی مەڕ بێت، گورگ دەیخوا. ((فەرەنسی))

❖ ئەو کەسەی ئیشی نی یە، هەموو ڕۆژێکی جەژنە. ((تیوقرتیس))

❖ ئەگەر گەوجی پێشکەوت، ژیری دەگەڕێتەوە. ((یابانی))

❖ ئەم ژینە گاڵتە جاڕی یە، بۆ ئەوەی بیر دەکاتەوە، ئەشکەنجەیە بۆ ئەوەی دەیزانێ.

❖ ئێمە گوێمان لە دەنگی چەپڵەی هەر دوو دەستە، ئایا دەبێ چەپڵەی یەك دەس چۆن بێ ؟!

❖ ئەگەر هەموو زانا بوینایە، کێ گوێی لێمان بگرتایە.

❖ ئازار، مرۆڤی بە شەرەف ناگرێنێ، بەڵکو وای لێ دەکات پێکەنێ.

❖ ئەو گوڵەی زۆر کەس بۆنی کا، بۆنی نامێنێ. ((ئەسپانی))

❖ ئەگەر خوا لە ناختا بێ، دوو دڵیت نی یە. ((شی گنك))

❖ ئەوەی دەزانێ، لە گەڵ ئەوەشدا بڕوای وایە نازانێ، ئەمە لایەنێکی زۆر ژیری یە، ئەوەی نازانێ و بڕوای وایە کە دەزانێ ئەوە نەخۆشە. ((لاوتزۆ))

❖ ئازاری ئاگر، یا ئاو، یا دز، تەنها بۆ لەشە،بەڵام ئازاری بیرو باوەڕ بۆگەن، بەمێشك دەگا.

❖ ئەو کەسەی خزمەتی دایك و باوکی نەکا، بۆ ڕەزا بوونیان هیچ کاتێ جێگەی باوەڕی دراوسێکەی نابێت. ((منسیۆس))

❖ ئەگەر قسەی شرین بوو، دەنگ دانەوەکەی شرین دەبێ، ئەگەر ڕەق بوو، دەنگدانەوەکەشی ڕەق دەبێ،ئەگەر لەشیش درێژ بوو، سێبەریش کورت دەبێ، ناودانەوەش وەکو دەنگدانەوە وایەو ڕەوشتی دەرەوەیش هیچ نی یە تەنها سێبەر نەبێ.

❖ ئەو پیاو ژنەی کە بە ئاسانی یەکتری دەناسن ئەوانە خۆشەویستی هەرزان بەهان،ئەو کەسانەی بە زوویی دەبنە برادەر،ئەوانە برادەری هەمیشەیی نین.

((توت توت))

❖ ئەکتەر پەیکەر تاشێکە، لە بەفر دەتاشێ. ((لۆرنس بارێت))

❖ ئەو کەسەی نەڕوا بۆ شانۆگەریی، وەکو ئەو کەسەیە بێ ئاوێنە خۆی برازێنێتەوە.

❖ ئەو خوایەی کە ژیانی داوە بە ئێمە، لە هەمان کات دا سەربەستیشی داوە پێمان.

❖ ئەو پیاوەی لە گەڵ ژنەکەیدا بەختیار بێت، هەموو شتێك دەتوانێ بکات.

❖ ئەوەی مرۆڤێك بکوژێ پێ ی دەڵێن خوێن ڕێژ،ئەوەی ملیۆنەها کەس بکوژێ پێ ی دەڵێن داگیر کەر،ئەوەی هەموو مرۆڤ بکوژێت پێ ی دەڵێن خوا.((جان رۆستان))

❖ ئێمە پیاوی ژیر نادۆزینەوە، تەنها ئەوانە نەبێ کە هاوکاریمان لە گەڵدا دەکەن.

((لارو شنوکو))

❖ ئەی خۆشەویستی تۆ خوای شەڕی، لە پاش ئەو هەموو شتە ناتوانین بڵێین شەیتانی. ((ئەللۆرد پایەرۆن))

❖ ئەو درووییەی کە نیوەی ڕاستە، لە هەموو درۆکان ڕەشترە. ((تنیسۆن))

❖ ئەگەر لە بگرەو بەردەیەکدا ڕەوابویت، وەکو پیاو بگرەو بەردە بکە،ئەگەر لە سەر هەڵەش بویت، ئەوا وەکو ژن بگرە و بەردە بکە.

❖ ئەگەر ویستت خەڵکی بە درۆزنت دانێن، ئەوا هەردەم ڕاستی بڵێ.

❖ ئەو کەسەی باوەڕی وایە، کە دەتوانیت وەلامی هەموو پرسیارێك بداتەوە هیچ پرسیارێکی لە خۆی نەکردووە.

❖ ئەو لاوەی هیچ نەگریاوە کێوی یەو ئەو پیرە مێردەی کە هیچ پێنەکەنی وە شێتە.

ئەگەر هیچ ڕێگایەك نەبوو بۆ دز، دزی بکا، ئەوا خۆی بە پاکترین مرۆڤ دەزانێ.

((شاتۆ بریان))

❖ ئەگەر ویستت نرخی پارە بزانی، هەوڵدە هەندێکی لێ قەرز کە.

((فرانکلین))

❖ ئەو کەسانەی تاوان لە ناخیانا هێلانەی کردووە، وا دەزانن هەموو چاوێك ژوورەوەیان دەبینێ. ((شکسپیر))

❖ ئا لە وێدا پەنجا پیاو بڕیاری لە ناو بردنی دەدرێ، بۆ یەك ئافرەت.

((ڤۆلتێر))

❖ ئازاردان، هونەری تاقی کردنەوەیە، لە نێوان بیرەکاندا.

((مەدام دۆستالێ))

❖ ئەو کاتەی بمەوێ لە گەلێ پیاوێکدا بگرەو بەردە بکەم، یەك لە سەر سێ بەشی کاتم بە خۆمەوە ڕادبوێرم کە چی بڵێم.دوو بەشەکەی تری،بەوە،بیر دەکەمەوە کە چی دەڵێ. ((ئەبراهام لنکۆڵن))

❖ ئەوانەی پەیکەری یادگاریان بۆ دەکرێ پێویستیان پێ نی یە. ((کین فاولەر))

❖ ئەو ئیشە بچووکەی کە لێ ی دەزانی، بەستە. ((مارکۆس ئوربلیوس))

❖ ئەو مۆسیقایەی کە من و تۆ گوێمان لێ بو، لە مۆسیقا زیاتر بو. ((کۆنراد ئایکن))

❖ ئۆرفیۆس، بە تارەکەی وای لە دارو بەفری سەرچیاکان کرد لە کاتی گۆرانیدا سەری بۆ دانەوێنن،لە سەر لێدانی مۆسیقای ئەو، سەوزی و گوڵ،مژدەی بەهاری دا وەکو هەتاو چۆن مژدەی ئاوەنگ دەدا. ((شکسپیر))

❖ ئەگەر هەر دوو چاو،بۆ تەماشا درووست کرابێ، جوانی بەڵگەیەتی.

((ئەمرسۆن))

❖ ئەوەی کە زیاتر ژن تورە دەکا، پێ ی بڵێن پیرێژنی. ((ئەریوستۆ))

❖ ئەگەر هونەرمەند ویستی لە هونەرەکەیدا بەرز بێتەوە پێویستە کچ لە دڵیا دوور خاتەوە. ((کبڵنگ))

❖ ئەو کەسانەی هەمان کتێب دەخوێننەوە لە نێوانیانە پەیوەندی یەك هەیە.

((لامارتین ))

❖ ئەوەی دیزانم ئەوەیە کە لە ڕۆژنامە دەیخوێنمەوە. ((ووڵ ڕۆدجەرز))

❖ ئەو مرۆڤە شارستانی یەت نی یە ئەگەر هەموو کات بە پەلە بێت.((وێل دۆرانت))

❖ ئەو پیاوەی عەیبەکانم دەر دەخا لە بەردەمی خەڵکدا گەورەمە،ئەگەر خزمەکارشم بێ. ((گۆتە))

❖ ئەوەم خۆش دەوێ، خەون بە شتێکەوە ببینێ کە نابێ.

❖ ئەی چۆلەکە،ئەی براکەم پێویستە مەلە بکەی و ئەو کەسەت خۆش بوێ کە دروستی کردووە،چونکە پەڕی داوە پێت بۆ ئەوەی بفڕی،تۆی لە هەموو گیان لە بەرەکان زیاتر نرخی داویتێ. ((ئیتالی))

❖ ئەو قوتابییەی مامۆستاکەی تێپەڕ نەکا بێ نرخە. ((لیونارد))

❖ ئەندامانی لەش یەك لە گەڵ یەك هاوکاری دەکەن، لە کاتی نەخۆشیدا. تەنها مرۆڤی لە خۆ بایی بوو نەبێ کە دەستی یارمەتی بۆ برای مرۆڤی درێژ ناکا.

❖ ئەگەر نانت ڕەش بوو، ڕۆژەکانتیش ڕەش دەبێ. ((ئەنتون تشیخۆف))

❖ ئەگەر لە تەنهایی دەترسی ژن مەهێنە. ((ئەنتون تشیخۆف))

❖ ئیشی چاکە هەرگیز وون نابێ.

❖ ئەفلاتوون خۆشەویستە لەدڵما،بەلاّم ڕاستی زیاتر خۆشەویسترە لە دڵما.
((ئەرستۆ))

❖ ئەم جیهانە جێگای ناخۆشی یە،مرۆڤیش درووست بووە بۆ ئازار چێژتن وەکو پرشکی ئاگر لە ئاسمانا،پرش و بلاّودەبێتەوە. ((جیرۆم.ك.جیرۆم))

❖ ئەو ئافرەتەی لە تاریکیدا لە پشت پەنجەرە کراوەکەوە دەگری،وەکو ئەوە وایە لە یەکێك داوای کەمێ خۆشەویستی بکا.

ئەگەر سەربەستی توانی ئیشو کاری خۆ بەرێتە ڕێوە، ئەو کاتە دیموکراتی یە.
((ریمۆن دۆس باسۆس))

❖ ئەوەی مێژوو دەیگێڕێتەوە ڕاستی یەکە،وەکو خەونێکی درێژ، خەونی مرۆڤی قورس و لێڵ.

❖ ئیش کردن برادەر دروست دەکا. ((گۆتە))

❖ ئا لێرەدا نهێنی وبەختیاری و پاکێتی هەیە،ئەویش ئەوەیە مرۆڤ حەز لە چی بکا بیکا. ((ئەلدۆس هکسلی))

❖ ئەو شتە تاقانەی کە دەبێت لێ بترسین،ترس خۆیەتی.((فرانکلین دیلاتۆ رۆزفلّت))

❖ ئێمە هەموومان لەسەر ڕابوردوو دەژین،بۆ ڕابوردووش خۆمان دا دەڕزێنین((گۆتە))

❖ ئەوەی گوێرەکەیەك بدزێ مانگایەکیش دەدزێ.
((بترونیوس))

❖ ئەی ئەستێرە پرشنگدارەکە، بۆچی ئارام و وەستانت نی یە. ((کینس))

❖ ئایا بیرەوەری کۆن، خۆشی ئێستای درووست نەکردووە ؟! ((ئەدگار ئەلەن بۆ))

❖ ئەوەی نایبینین،دتوانین بلێین نازانین. ((گراهام گرین))

❖ ئافرەتـــان خـــاوەنی زیرەکـــی ترســـناکن،لە ڕووخانـــدنی پـــرۆژە سەرنەکەوتووەکان،یەکەســـەر پرۆژەیـــەکی تـــازە دروســـت دەکـــەن. ((گراهام گرین))

❖ ئازاردان گوناهە. ((گراهام گرین))

❖ ئێمە زنجیر هەڵدەگرین کەچی چاومان نابینێ،ئێمەکویلەین وکەچی دەڵێین ئێمە سەربەستین. ((ئۆسکار وایلد))

❖ ئەوەی مرۆڤـ کۆی کردۆتەوە، سروشت بێدەستەلاتە بۆ بلاوکردنەوەی. ((ئەلدۆس هکسلی))

❖ ئەگەر خزمەتی میللەت نەکەم، ئەی خزمەتی کێ بکەم. ((م. ع ))

❖ ئەوەی بە تەنها سەفەر بکا، بە پەلە سەفەر دەکا. ((ردیارد کبلنگ))

❖ ئامۆژگاریێکەت هەرچی بێ کورتی کەرەوە. ((هۆراس))

❖ ئێمە تەنها جارێك دەمرین، ئەویش بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ. ((مۆلێیر))

❖ ئەگەرمن ڕۆیشتم بۆ ئاسمان، حەز دەکەم بیرەکەم لەگەل خۆما هەلگرم. ((ئەنقر سۆل))

❖ ئازایەتی هەمیشە کوێرە. ((بیکۆن))

❖ ئەوانەی لێرە نین هەمیشە لە سەر هەڵەن. ((فەرەنسی))

❖ ئەوەی زۆری خۆش ویست، ڕقی لە زۆریش دەبێتەوە. ((فەرەنسی))

❖ ئەوەی بریسکەی بێ، زێڕ نی یە. ((فەرەنسی))

❖ ئەوانـەی دەرەنـگ دێـن بـۆ سـەر مێـز، لـە ئێـسك زیـاتر هـیچ نادۆزنـەوە. ((لاتینی))

❖ ئەگەر ئاشتیت دەوێ خۆت ئامادە کە بۆ شەڕ. ((لاتینی))

❖ ئەوەی ئازاری خەلکی بدا، ئازاری خۆی دەدا.

❖ ئەو پیاوەی کە لە مەیدانی پێشبڕکێ دا پارەی دەس دەکەوێ، ئەو کەسەیە کە جووتەو گسک هەڵدەگرێ. ((ئێلبەرت هابارد))

❖ ئەموستیلەی ژن هێنانی ڕاستی لە ئەڵماس دەبێ، بێ گومان بەردی ژن هێنان، بەردی دەستاڕە.

❖ ئەو مرۆڤەی ژیانی و وێنەی خۆی بە هیچ دانێ نەك هیچ و پوچە، بەڵکو مرۆڤێکە تووشی جۆرە بێ دەسەلاتی یەك بووە لە ژیاندا. ((ئەلبەرت ئەنیشتاین))

❖ ئەوەی مێژوو دەیگێڕێتەوە، خەونی درێژو قورس و شێواوی مرۆڤە.((شۆنبهاوەر))

❖ ئای چەند سەرکەوتوو دەبن ئەوانەی شەڕ دەکەن، بەبێ ئەوەی شەڕیان خۆش بوێ. ((ئەنداری مالرۆ))

❖ ئەگەر دەتەوێ لە ڕەخنە دوور بیت، هیچ مەڵێ،هیچ مەکە،هیچ مەبە.

❖ ئەو پیاوەم خۆش دەوێ بزە بیگرێ، کەتێ دەکوشێ. ((ونستۆن چیرچل))

❖ ئەو پیاوانەی کە لە لام گرنگن، ئەوانەن کە سوودم پێ دەگەیەنن.((نابولێون))

❖ ئەو وولاتە ئازادە، کە ڕێزی مافی مرۆڤ دەگری و یاسای تێدایە و لە دووایشدا عادیلە. ((ڕۆبسییر))

❖ ئاشتی، بەهێز ناپارێزرێ بە لەیەك گەیشتن دەپارێزرێ. ((ئەلبەرت ئەنیشتاین))

❖ ئەوەی لە دوواکاتدا پێکەنێ، چاك پێ دەکەنێ. ((وێژەیەکی کۆنە))

❖ ئـەو ڕۆژەی کـەوون بـووە، ئـەو ڕۆژەیـە کـە مرۆڤـ تێـدا پـێ ناکـەنێ.
((شامفوور))

❖ ئەوەی لەم کاتەدا لە ڕابواردن دوور کەوێتەوە، لە پاشە ڕۆژدا ڕابواردنێکی زۆری بە تووشەوە دەبێ. ((دیجۆن هایوود))

❖ ئەمڕۆ بژی، ڕاڕابی کۆن لە بیرکە. ((ئەبیقور))

❖ ئێمـە هـەموو مرۆڤـ تاوانبـار دەکـەین ودەڵێن،خـاڵی لاوازی خۆیـان نازانن،بەلأم کەمیان خاڵی بەهێزی خۆیان دەزانن مرۆڤـ وەکو ئـەرز وایـە کـە زۆر جار دەمارەزێرێکی تێدایە و خاوەنەکەی نایزانێ. ((جۆناسان سویفت))

❖ ئەگەر هێزم بووایە شتم لە یاد بچێت، ئەوا هەموو یادێکی مـرۆڤم دەسـڕی یـەوە کـە پڕبـوو لـە نـاخۆش و ئـازار. ((تـشارلز دیگنز))

## - ب -

❖ بەشی یەكەم گومانی لێ دەكرێ، بەلام دەلێن دووا شانۆگەرێ یەكە پەنجە بۆ ڕۆمانەكە ڕادەكێشی. ((ڕۆبەرت هێریك))

❖ بەكار هێنانی مێشك لەو ڕێگانەدا بەیەك دەگەنەوە.كار و باری نەخۆشخانەكان كەم دەكاتەوە.

❖ بە سەدو پەنجا جۆر دەتكوژم. ((شكسپیر))

❖ بێزاری لەم جیهانەدا ئەوەیە كە بێ ئەقڵەكان لە خۆیان ڕازین و ئاقڵەكان لە خۆیان بەگومانن. ((برتراندرسل))

❖ بە نرخترین كراسی ژن ئەو كراسەیە كە زیاتر بەرووتی ببینرێ.

❖ بێ ئەقلێكی هەژار بێ ئەقڵەو،بێ ئەقلێكی دەوڵەمەند،دەوڵەمەندە·((پۆل لافیت))

❖ بێ دەنگی ئەو تەنها شتەیە كە لە ژێرەوە،ژن قینی لێ یەتی ((ماری ولسۆن لیتلێ))

❖ باشترین ڕێگا بۆ ئەوەی خەلكی بباشی باسمان بكەن،پێویستە چاكەیان لە گەڵدا بكەین. ((فۆلتێر))

❖ برادەری تەنگانە، بەڕاستی برادەرە. ((رتشارد گریفن))

❖ باوەڕ بەو كەسە مەكە كە لە بەردەمتا وەك قەشە وایە. ((تۆماس فۆلەر))

❖ باش تێگەیشتن، كوتالێكی دانسقەیە. ((بۆفی))

❖ بزمارێك، بزمارێكی تر دەردەكا. ((فەرەنسی))

❖ ببەرە هەنگوین، مێش دەتخوا. ((ئیتالی))

❖ بۆ هەموو شتێكی باش، لەیەك كەسا مەگەڕێ.

❖ بەبێ ئاوێنە ئافرەت چۆنێتی دەم و چاوی نازانێ، پیاویش بەبێ برادەرێكی چاك هەڵەكانی نازانێ.

❖ بەرپیش بە فەیلەسوف نابێت. ((لوقیان))

❖ بڕیارەكانی دڵداری ناگەیەنرێتە گوێ خوا،دز،دز دەناسێ و گورگ گورگ دەناسێ.

❖ با لە وورە بەردانمان هێزێك پەیداكەین. ((سینیكا))

❖ بیری گەورە چاوگەی دڵە. ((سینیكا))

❖ بستە بالآ ئەگەر لە سەر شاخیش وەستابێ گەورە نابێ. ((سینیكا))

❖ بەهێز ئەوە نی یە كە هەمیشە لە جەنگدا سەر كەوێ، لاوازیش ئەوە نی یە ئاشتی بدۆڕێنێ. ((هـ ج ویك))

❖ بە بیرتا بێت كە كات، لە سامانەوەیە.

❖ بۆ مرۆڤ هەیە تۆڵە بسێنێ، ئەگەر تۆڵەكە بچووكیش بێت،تۆڵەسەندن چاكە بۆ ڕەوشتی ئادەمیزاد و لە وێوە لێ بوردن، لە دایك دەبێ.

❖ بڕیاری چاك،چەك (صك)ی ڕاكێشراوە لە بانق، كە هیچ حیسابمان تێدا نییە.

((ئۆسكار وایڵد))

❖ باشتر وایە هەڵسوكەوتت باشتربێ لە گەڵ برادەرەكانتا، نەك تۆزێ دوژمنەكەت خۆش بوێ. ((ج٠ك٠ تشترۆن))

❖ بیرو باوەڕی گەورە نەك تەنها پێویستی هەیە بەباڵ، بەڵكو پێویستی بە پیپلكان هەیە بۆ نشتنەوە. ((ج٠ك٠ تشترۆن))

❖ باش لە وتەكانت وردبەرەوە،هەرچەندە مەبەستت نی یە هەڵە بكەیت،زۆریش گرانە بە تەواوی ڕاستی بڵێ ی.

❖ برادەرەكانمان ئەوەی لە ئێمەدا دەیدۆزنەوە، پەراوێزی خۆیانە.

❖ بۆچی شاعیرەکان بە گوڵەوە گۆرانی دەڵێن؟لێ گوڕێن بپشکوێی لە قاسیدەکانتانا.

❖ بۆخۆت لە زێڕوزیو خوات درووست کردووە، ئیتر لە نێوان تۆو بت پەرستا فەرق چی یە ؟ ئەو بتێك تۆ سەت بت دەپەرستی. ((دانتی))

❖ بۆ ئەوەی نەگەی بە هیچ جێگایەك، دووای جەماوەر بکەوە.

❖ بۆچی سروشت بە بیرکەرەوەی بچووك، دەنگی گەورە دەدات ؟.

❖ باشترین ڕێگە بۆ ئەوەی بگەی بە شەمەندەفەر،ئەوەیە شەمەندەفەری ڕابوردوو تێپەڕ بو بێ. ((ج٠ك٠ تشترۆن))

❖ بە یادتان بێتەوە، ئەی سەربەستەکان، ئەو ووتەیە کە دەڵێ : (دەتوانین سەربەستی وەدەس بێنین – بەڵام زۆر گرانە جارێکی تر بیگێڕینەوە ئەگەر لە دەستمان دەرچوو). ((رۆسۆ))

❖ بەشی زۆری کاتی نووسەر لە خوێندنەوە تەواو دەبێ تاکو بنوسێ، مرۆڤیش پەڕەی نیوەی کتێبخانە یەك هەڵدەداتەوە بۆ ئەوەی کتێبێ بنوسێ.

((سمۆئیل دجونسۆن))

❖ بە ووشە،ووشە،کیتاب درووست دەبێ. ((وێژەی فەرەنسی))

❖ بە بێ زانینی هێزی ووشە،زۆر گرانە مرۆڤ بناسی. ((کۆنفۆشیۆس))

❖ باشی جۆرێکی تایبەتی یەلەڕاستی و جوانی،بەلام ڕاستی لە ڕەوشتی مرۆڤایەتی یە

((ه٠أ– ئۆفەرسترێت))

❖ بەختیاری لە خۆشیدا تەواو نابێ، ئەگەر هەموو بە ڕاست و ڕەوان نەبێ.

❖ بەختەوەر، قورقۆشمی لە بەر دەست بەزێڕ دەبێ. ((بترونیوس))

❖ بە بێ پارە، ئەگەر مرۆڤ لە وولاتی خوێدا نەبێ، ئەوەی ڕێزی بۆ ڕادەکێشێ، نازناو نی یە، بەڵکو پارەکەیەتی.

❖ بەشێك لە بەختیاریمان، دەکەوێتە سەر زیرەکیمان، لە هەڵبژاردنی هاوڕێ کانمان. ((کارلۆ گۆڵدۆنی))

❖ بەختیاری تەواو لە دڵداری دا، ئەوەیە،دەس درێژو پارە دەربیت،بەبێ ئەوەی یاد لەوە بکەیتەوە بەرامبەرەکەت هیچت بداتەوە.

❖ بیرکردنەوە،وەکو خۆشەویستی و مردن وایە، هەر یەکە لە ئێمە پێویستە خۆی پێ هەڵسێ. ((جۆزایا رۆیس))

❖ برادەری دڵسۆز، دەرمانی ژیانە.

❖ بیرەوەری،دەبێ بۆنێکیووشکی هەبێ. ((جیرار بوێر))

❖ برادەری،ووشەیەکە،تەنها بەچاپ کراوی ببینین گەرمایی بەدڵ دەدا. ((ئۆگستین بیریل))

❖ بێ ناوی، چاترە لە بەد ناوی.

❖ بناغەی کۆمەڵ، لە سەر ڕاست پەرستی دانراوە.

❖ بیر لە کامەرانی بکەرەوەو درووستی بکە، دەبینی لە نێو دەستایە.

❖ بۆ خەونەکانی لاوەکان، دڵسۆز بن. ((شیلەر))

❖ بۆ ئارەزووی بەشی دووەمی ژیان،بەشی یەکەم بە سەر دەچێ دووەمیش بەسەر دەچێ بە داخ خواردن بۆ بەشی یەکەمی ژیان. ((شامنوور))

❖ باشترین ووتاربێژ، مێرولەیە.٠ چونکە هیچ ووشەیەك ناڵێت ((بنیامین فرانکلین))

❖ بەختەوەر تەنها ئەوەیە، ئەو کات ژمێرەی تێدایی پڕی کەیتەوە. ((ئەمرسۆن))

❖ بەردەوام بوون و ئارام گرتن، دایك و باوکی، سەرکەوتنە.

❖ بترسە لەو کەسانەی کە ژێر دەکەون، ڕەنگە بیانەوێ چمکی قالێکە ڕاکێشن.

## - پ -

❖ پیاوی (ڕەش بین) پێش تەمەنی جل وهەشتساڵ زۆر شت لەوە دەزانێ، ئەوەش (گەش بینە) لەدووای ئەو تەمەنە. ئەوەندەی پێویستە،لێ ی نازانێ((مارك نۆین)).

❖ پێکەنینی چاك،هەتاوێکی هەڵهاتووە. ((ساکری)).

❖ پێکەنەو قەڵەوبە گەورەم. ((بن دجونسۆن)).

❖ پێویستە پیاوێکی ژێر بیت تاکو شوناسی لەگەڵ پیاوێکی ژیردا پەیداکەی. ((زنیۆفانیس))

❖ پێویستە لەسەر هونەرمەند لە دوو گوێ زیاتری هەبێ. ((لامەریتن))

❖ پەرتووك کلیلی گەنجینەی ژیری یە. ((یەکێك))

❖ پێویستە مێژوو نووس وردو ئەمین و بێ لایەن بێ نابێ خۆ پەرستی و ترس و کینەو عاتیفە، لە رێگەی ڕاست لایان بدا. ((ماکۆلی)).

❖ پێویستە لەسەر لاوەکان،سەفەر بکەن، ئەگەر تەنها بۆ خۆیانیش بێ. ((بایەرۆن))

❖ پاش ئەو هەموو ووتەو کارە، دەردەکەوێ ئەوەی ووتراوە زیاترە لەوەی دەکرێ.

❖ پیاوی ژیر، زۆر شت لەهەڵە درووست دەکا، لەوەی کە دەیدۆزێتەوە.

❖ پرسیاریان لە نابلیۆن کرد، چی پاڵی نایی کە لیژنەیەك درووست کەی بۆدابەش کردنی ((شەرەف))،زەردەخەنەیەکی بۆ کردوو وتی :چونکە خەلکی بە شتی هیچ وپوچ دەخەڵەتێن.

❖ پیاوی ئازا، سەربەستە.

❖ پیاو، ئەوەی پێویستە بێتە یادی، لە یادی دەچێ.ئافرەت ئەوەی پێویستە لە یادی بچێ هەمیشە لەیادێتی.

❖ پەروەردە، ئەو توانایەیە کە باسی کچێکی جوان بکەیت بێ ئەوەی دەستت بەکار بێنی.

❖ پێویستە نەتەوە، بەهێز بێت، نەتەوەیەك ئامادەی ئەوە نەبێت بمرێ لەپێناوی سەربەستی خوێدا، لەژیان دا خۆی دەدۆڕێنێت.((مۆرا))·

❖ پیاوی ماندوو بۆ گیرو گرفت دەگەڕێ ((سینیکا))·

❖ پەروەردە، دەستکردی قوتابخانە نی یە، بەلاّم جۆرێکە لە چاکە کە مرۆڤـ لەناخی دا هەڵی گرتووە. ((لویس برومفیلڎ))

پێویستە بژین، سەرەڕای ئەوەی زۆر کەس لە ئاسمانەوە کەوتوونەتە خوارەوە.

((د·هـ·لورنس))

❖ پیاو هەڵەی خۆی لە یاد دەچێ ئەگەر ڕۆیشت بۆ یەکێکی کە بەلاّم ئەوی تر، لە یادی ناچێت. ((نیتشە))

❖ پێش شۆڕش هەموو شتێك هەوڵدان بو،پاشان هەموو وەرگەڕا بۆ داواکاری((گۆتە))

❖ پێویستە مرۆڤـ بیری بێ خەوش بێ و دەروون پاك و لەش ساغ بێ·

((ئەنتۆن چیخۆف))

❖ پیاوێك، بەبێ سمێڵ، وەکو ژنێك وایە سمێڵی هەبێ· ((ئەنتۆن چیخۆف))

❖ پشیلە، لە ڕاونانی مشك، واز ناهێنێ· ((ئەڵمانی))

❖ پیاوی سەرکەوتو، حەز دەکا لەقسەکردنا لەسەر خۆ بێت و لە هەڵسو کەوتیا زۆر (جدي)بێت ((کونفوشیۆس))

❖ پیاوی سەرکەوتوو بە هێزە، بەلاّم شەڕ کەر نی یە،بە زۆریش تێکەلاّوی خەڵکی دەبێ، بەلاّم کۆمەڵێ پێکەوە نانێ.

((کونفوشیۆس))

❖ پاداشت نی یە، بۆ ئەو كەسەی هەڵە دەدۆزێتەوە.

❖ پیاوان ئیش درووست دەكەن و ژنان پیاوان.

❖ پرسكردن، داواكردنە لەوی تر كە ڕای لەگەڵ ڕامان دا بێت ((ئەدریان دۆكورسیل))

❖ پاڵەوان لە پاڵەوانێكی كە ئازاتر نی یە، بەڵكو پاڵەوانە بۆ ماوەی پێنج دەقیقە لەیەكێكی تر.

❖ پارە خزمەكارێكی چاكەو گەورەیەكی خراپە. ((فەرەنسی))

❖ پیاوی زیرەك، دەكاتە، دوو پیاو. ((فەرەنسی))

❖ پیاو دەتوانیٚ واز لە باوكی بێنیٚ ئەگەر دادوەریش بیٚ،بەڵام ناتوانیٚ واز لە دایكی بێنیٚ، ئەگەر سواڵكەریش بێت.

❖ پێویستە یەك هێلانە، لەسەر یەك دار درووست بكرێت. ((تیوقرتیس))

❖ پیاو لە بەختیاری و خۆشەیستی دا پێویستی بە تەنهایی هەیە،پێویستشی بە كۆمەڵ هەیە بۆ ناودارێتی. ((ستندال))

❖ پێم بڵیٚ كیٚ یەكەم جار ماچی دۆزی یەوە ؟ ئەو دەمە پشكۆیە پیرۆزە.

❖ تەنها لە ماچ نەبیٚ، لە هیچی تر یادی نەكردۆتەوە. ((هاینریش هاینی))

پێویست ناكات شەوان نەخەوی بۆ سەركەوتن،تەنها ئەوە هەیە ڕۆژ بەخەبەر بیت. ((ئەڵمان))

❖ پێم بڵیٚ لە گەڵ كێدا هەڵدەستی،پێت دەڵێم تۆ كیٚ ی. ((سرفانتس))

❖ پیاوی چاك ژنی چاك دروست دەكا. ((ڕۆبەرت برتۆن))

❖ پیاوی بە شەرەف،هەموو كەس ڕێزی لیٚ دەگریٚ. ((ولیام هازلێت))

❖ پزیشك دەتوانیٚ خۆی بنێژیٚ، بەڵام ئەندازیار ناتوانیٚ،تەنها ئەوە نەبیٚ كە بەو كەسە بڵیٚ هەندیٚ درەخت بۆ شاردنەوە بڕوێنە.

## - ج -

❖ جوانـە پیـاو چـاکە بکـە —بـەڵام لـە گـەڵ کـێ دا،ئەوەیـە مەسـەلەکە. ((لافونتین))

❖ جۆگەلە بە ئارەزووی خۆی دەڕوا. ((وردزورس))

❖ جوانی،جوانی ڕادەکێشێت. ((هنت))

❖ جوانی ڕاستی یە، ڕاستیش جوانی یە. ((کێتس))

❖ جوانی،هەرگیز نامۆیە. ((بۆدلێر))

❖ جوانی،بەخشندەیەکی خواییە،ئای چەندە ژمارەی ئەوانە کەمن کە خۆیان هەڵدەکێشن بە جوانی یەوە. ((ئۆفید))

## - چ -

❖ چەن بەختیارە ئەو كەسەی كە دڵی بە منداڵەكانی خۆشە. ((تۆماس فۆلەر))

❖ چاك وایە منداڵەكانت،بەخۆتەوە بگریت بە ڕێزو نەرم و نیانی،نەك بە خۆتەوە بیان گری بە ترسەوە. ((تێرنەس))

❖ چی لەوە گەورە ترە،كوڕێك ناودارێتی باوكی هەبێ و باوكێك ڕەوشتی كوڕەكەی جێگای پیاوەتی بێ. ((سۆفوكلیس))

❖ چۆن یاسا پێویستە بۆ پاراستی ڕەوشتی چاك هەروا پێویستە ڕەوشتی چاك بۆ جێ كردنی یاسا. ((مكیافیللی))

❖ چاكترین دەرمان كە دەیزانم بۆ ڕۆماتیزم ئەوەیە كە سوپاسی خوا بكەن تووشی (فیّ) نەبوونە. ((ج بیلنگز))

❖ چیّ ؟! ئا ئەمە پیاوێكی خراپە ؟ ئەمە دەتوانیّ، هەزار كەس خراپ كا.

❖ چەند بەختەوەرە، ئەو كەسەی بیەویّ، لە دەریای هەڵە هەڵیّ. ((گۆتە))

❖ چەن ووشەیەكی كەم، بەلاّم لە دڵێكی پڕ ڕاستی یەوە. (لۆكان)

چاك وایە قەرز بدەی، نەك قەرز بكەی، هەردوكیان هەر یەك نرخیان هەیە. ((فیلیب گێبن))

❖ چاكتر ئاوێنە، برادەرێكی كۆنە. ((جورج هەربرت))

❖ چاك وایە، لە هەژاریدا ڕاست بیت، نەك دەوڵەمەندو گێر بیت.

❖ چۆلەكەی كێڵگە بچووكەكان خوایان هەیە،كە خواردنیان بۆ دەنێریّ. ((سرڤانتس))

❖ چۆلەکەکە مردنی نزیك دەبێتەوە، جیگە جیگەی خەماوی یە، مرۆڤـ کە نزیك مردن دەبێتەوە، ووشەکانی خۆش دەبێ. ((کونفوشیۆس))

❖ چاك وایە ژیانی مرۆڤێ رزگارکەیت، نەك پەرستگایەکی حەوت نهۆمی درووست بکەیت. ((صینی))

❖ چاك وایە لە نزیك ماڵەکەتەوە خێر بکەیت، نەك هەزار میل ببڕی و بڕۆی بۆ زیارەتی حەجێکی ئایینی. ((صینی))

❖ چاکە بکەو بە تەنها بیکە.

چاك وایە خواردن بە خەڵك بدەی، نەك بە ووشە خواردن،بخەیتە دەمیانەوە.

((شۆشویهمۆ))

❖ چۆن گوێمان لە دەنگی هەڵۆ دەبێ کە بە سەرمانا تێ دەپەڕێ، هەروا ناوی مرۆڤـ دەمێنێ لە پاش مردنی.

❖ چاکەیەکی کەم، خۆشی یەکی زۆرە. ((هۆمیرۆس))

❖ چاك وایە شتی جوان دووپات و سێ پات بێتەوە. ((ئەخیلۆس))

❖ چاك وایە مرۆڤـ چەکە شکاوەکەی بەکار بێنێ، نەك بلێ خوێن، خوێنی دەوێ

((شکسپێر))

❖ چاك وایە مرۆڤـ هەندێ جار جم وجوڵی زۆر بێ، نەك بیرکردنەوە بەسەریا زاڵ بێت

((لویس برۆمڤیلد))

❖ چاکە، چاکەیەو خراپە، خراپەیە، جا بۆ چاکە نەکەین. (م٠ ع)

❖ چەندە ڕێگەی ژیان دڕکاوی یە،چەندە گران و قورسە ڕێگەی سەرکەوتن بۆ ئەوەی بی بڕێ،تاکو بگاتە ترۆپکەی ڕاستی.

❖ چەندە خۆشەویستی جوان بە باوە لە لای لاوەكان ئەوەندە ڕێك و پێك نی یە بۆ ئەو كەسەی كە تەمەنیان بەسەر چووە.

- د -

❖ دڵـداری وەکـو دار گـوڵ وایـە، کـە گوڵێـك سـیس دەبێتەوە،خونـچەیەك دەکرێتەوە.

❖ دڵ،خوان نی یە، بۆ هەموو کەس ڕابخرێ.

❖ درۆ دوو پیێ ی هەیە،بەلأم ئابڕو چوون باڵی زۆرە.

❖ دۆزەخ ئەی ژن، ئەوەیە مرۆڤــ لە دڵداری بوەستێ. ((جیراربوێن))

❖ دوژمنەکان،دوژمنایەتیان لە گەڵما کرد، کەچی خۆم باشترین دوژمنی خۆم بوم.

❖ دڵداری،تەنها باشە لە ژیانی پیاودا،بەلأم مێژووی ژنە، بە درێژایی تەمەنی.
((مەدام دۆستاڵ))

❖ دان نان بە چاکەدا،برادەری کۆن دەپارێزی و برادەری تازە دروست دەکا.
((ووتەیەکی ئەسکەتلەندی))

❖ دڵ چەند هۆیەکی هەیە، کە ئەقڵ نایزانێ. ((باسکاڵ))

❖ دیوارو تەلبەنی چاك،هاوسێ ی چاك دروست دەکا. ((ڕۆبەرت فرووست))

❖ دان نان بە چاکەدا،یادگاری دڵە. ((جان بانێست ماسیۆ))

❖ دەتوانی لە خۆت گەورەتر هەڵخەڵەتێنی، بەلأم لە خۆت خوارتر ناتوانی.

❖ دڵداری لاوان بارەگای ڕاستی دڵ نی یە، بەڵکو لە چاوییایەتی.
((شکسپیر))

❖ دڵداری هەموو ئەشکەنجە و ئازارە، بێزار تـرین خۆشەویست ئەوانەن کە بەبێ هیواو ئامانج دەژین.

دڵداری نەخۆشی یە،تەندروستی ژن هێنانە،تەندروستی و نەخۆشی یەك ناگرن.

((تۆفیق الحکیم))

❖ دەردی کاتژمێرێکی ئیش، خۆشی ڕۆژێکە.

❖ دادپەروەری، ئەو ڕاستی یەیە، دەبێ جێ بەجێ بکرێ.

❖ دوور کەوتنەوە لە مرۆڤـ، ئایا پێویستە ڕقیان لێ هەڵگری. ((شیریدان))

❖ درۆ پێ ی نی یە لە بەر ئەوە ناتوانێ بوەستێ. ((ووربرتۆن))

دەربارەی یەکێك دەمووت ((ئەو چاکە دەکا)بەلاَم بە ڕێگەیەکی جوان نایکا.

((مۆتسکیۆ))

❖ درۆ،درۆیە،ئەگەر درۆ چاوو گوێی بێت. ((د. دکسونسون))

❖ دوو شت لەم جیهانەدا گرانە، یەکەمیان ئەوەیە بۆ خۆت ناوێ پەیدا بکەی، دووەمیان بتوانی ئاگاداری ئەو ناوە بیت. ((ڕۆبەرت شۆمان))

دڵی ژیر وەکو ئاوێنە وایە،دەبێ هەموو شتێك عەکس کاتەوە،بەبێ ئەوەی تێکی دا.

((کونفوشیۆس))

❖ دڵ هۆی هەیە، مێشك نایزانێ. ((باسکال))

❖ دەریا هیچ پادشایەکی نی یە، تەنها خوا نەبێ. ((دانتی کبریلی))

❖ دەریا زۆر شت درووست دەکا. ((میشلیە))

❖ دۆستی،دۆستمان، دۆستمانە. ((فەرەنسی))

❖ دەنگی گەل، دەنگی خوایە. ((لاتینی))

❖ دووازدە پێشەو سیازدە نەگبەتی. ((ئەڵمانی))

❖ دووجار بیرکەرەوە.... ئەمجاریش هیچ مەڵێ.

❖ دەرمانی نەزان خوێندەواری یە، وەکو گۆشت دەرمانی برسێتی یە.

❖ دەریا کویلەی بایە. ((ئۆستات))

❖ دایك،لە هەموو زیندەورێك،پیرۆز ترە. ((کولێریدج))

❖ دەرمانی ڕاستی بۆ ئەقڵ، فەلسەفەیە. ((شیشرۆن))

❖ دەرگای بەختیاری داخە لە سەر ئەو ماڵە، ئەگەر دەنگی ژن بەرز بووەوە بە سەر پیاودا. ((سەعدی شیرازی))

❖ دەنگی گەل زۆر بەهێزە. ((ئەخیلۆس))

❖ دووا کۆتایی شارستانی یەت ئەوەیە، مرۆڤ بتوانێ دەس بەتاڵی، بەزیرەکی پڕکاتەوە. ((برتراند راسل))

❖ ناتوانین زۆر شتی ناشرین لە کتێبدا، بدۆزینەوە،تەنها لە ((دەلیلی))تەلەفوندا نەبێ. ((بەرناردشۆ))

## - ڕ -

❖ ڕاستی و شەکر، هاوڕێن.

❖ ڕاستی، چرای ڕێ ڕۆشنکەرەوەی ڕێگەی گەلانە.

❖ ڕێگای، چاو پیسی لە ژیانا، هاوڕێ ی دڵداری یە لە مردنا.

❖ ڕەوشتی چاك، مرۆڤـ درووست دەکا. ((دانیال دیفۆ))

❖ ڕابواردن لە گەڵ زەمانا کەم دەبێ و ئازاری زیاد دەکا. ((ستندال))

## - ه -

❖ هاوڕێتی لە گەڵ ئافرەت دا، دەراوسێ ی دڵداری یە. ((مۆر))

❖ هیچ ڕووی نەداوە کە پیاوێك بە ئاقرەتێك بڵێ، کە تۆ زۆر بڵێ ی،لەو کاتەدا کە ئافرەت باسی گرنگێتی پیاو دەکات.

❖ هەموو دۆزینەوەیەکی تایبەتی، ڕووخێنەرە، بەهێزەکەی،لە بەر ئەوە،زۆر جار پێویستە بەر بەرەکانی بکرێت وەکو دوژمنێکی چاوەڕوان کراو.

❖ هەموو گوڵاوی جیهان،ناتوانێ بۆنی ناپاکی لە لەشی ئافرەتی ناپاك بسڕێتەوە...

❖ هەر کەسێ ئاشتی لە گەڵ دوژمنانی دۆستی خۆی دەکات ، بیری ئازاردانی دۆستانی خۆی هەیە.

❖ هاوسێ ی خراپ،وەکو تاعوون وایە،هاوسێ ی چاکیش بە پیت و بەرەکەتە، ئەوەی هاوسێ یەکی چاکی هەبێ، وەکو ئەو کەسە وایە ئەرزێك و سامانێکی زۆری هەبێ.

❖ هیچ برادەرێك نی یە، بەبێ بروا. ((ئەبیقۆر))

❖ هەرچەندە بەشت بێت لە ژیانا،شتێکی کە لە سەریەوە درووست کە.

❖ هەڵكەندنی ((بیر)) تەنها ئیشە كە مرۆڤــ لە خوارەوە دەستی پیٚ ناكا.

❖ هەموان لە بەردەم پارەدا، یەك ئایینن. ((فۆلتێر))

❖ هەموومان نەزانین، بە جۆرەی هەموو شتێك. ((وول رودجرز))

❖ هــیچ كــەس، نابێتــە سەربەســت،ئەگەر هــەموو سەربەســت نــەبن هــیچ كەسێكیش،بەختیار نابیٚ تاكو هەموو بەختیار نەبن. ((هربەرت سبنسەر))

❖ هەركە ترس نەما، قەشە لە یاد دەچێتەوە.

❖ هەندێك زۆرجار ڕاستی دەڵێن، هەندێكیش هەرگیز ڕاستی ناڵێن.

((شیشرۆن))

❖ هاوكاری كردن لەگەڵ پیـاوی بەهێزا،هــەموو كـاتیٚ كـارێكی سـەلامەت نـی یە.((فیدر))

❖ هیچ گەورییەك نی یە ئەگەر ڕاستی لە گەڵدا نەبیٚ. ((لێسنگ))

❖ هەر برادەرین، مادام یەكتری دەبینین. ((ئەریستبنیتس))

❖ هیچ كاتێك لە وێدا شەڕێكی باش نەبووە،یا ئاشتی یەكی خراپ.

❖ هەل، دز، درووست دەكا. ((فەرنسی))

❖ هەموو تازەیەك جوانە. ((فەرەنسی))

❖ هەڵۆ، مێش ڕاو نانیٚ. ((لاتینی))

❖ هەتاو لە بەر هەمووان دەردەچیٚ. ((لاتینی))

❖ هەر مرۆڤێك، دەتوانیٚ هەڵە بكا. ((شیشرۆن))

❖ هەموو خراپەیەك بناغەیەكی ماقووڵی نی یە. ((لیغی))

❖ هێشتاكە مرۆڤــ لە درووست كردنی شارەكانی نـەبووەوە، هــەولی ئـەوەی دەدا لیٚ ی دوور كەوێتەوە. ((دكزۆف وودكراش))

❖ هەموو مرۆڤێك تووش هەڵە دەبیٚ، لە بەر ئەوەیە لە سەر قەڵەم لاسـتیكی سڕینەوە دادەنێن.

❖ هۆیە بچووکەکان زۆر ئاکامی گەورەیە، وون بوونی بزمار بۆتە هۆی وون بوونی نالّی ئەسپەکە، وون بوونی نالّەکە بۆتە هۆی وون بوونی ئەسپەکە،وون بوونی ئەسپەکە بۆتە هۆی وون بوونی سوارەکە.

❖ هاتنە ژوورەوە لەو کاتەدا کە ئەکتەر دەورەکە دەبینیّ، وەکو ئەوە وایە دەست بخەیتە سەرشانی ویّنە درووست کەریّ کە خەریکە ویّنەیەکی هونەری دروست دەکا. ((ساشاگیّتری))

❖ هیچ کیّوی یەك نی یە،نەبیّتە شارستانی یەت،ئەگەر بۆ ڕۆشنبیری یەت گویّ ڕایەلّ کات. ((هۆراس))

❖ هەموو شتیّك تەواو دەبیّ، تەنها هونەرمان بۆ دەمیّنیّ، پەیکەری بیوەیی لە عەرشی پادشاهان زیاتر دەوام دەکا،پارەیە لە کاغەز نەبیّ لە ئەمەبراتۆریەتی ((تایبیریۆس)) زیاتر دەژی. ((تیۆفیل گۆتییە))

❖ هەموو هونەرمەندیّك فلّچکەی دەخاتە ناو روحیّوەو ئەو سروشتە تایبەتی یەی درووست دەکا. ((هەنری وورد بیتشەر))

❖ هەتاکو ژن لە سەر ئەرز هەبیّ، شتی تازە دەوتریّ. ((دۆبۆفلیّر))

❖ هەق بەهیّزەو دەردەکەویّت.

❖ هەر مرۆڤیّك، سیّ جۆر لاویّتی هەیە، لاویّتی لەش،لاویّتی دلّ، لاویّتی ئەقلّ، بەلاّم زۆر بە داخەوە،کەم جار ئەم سیّ شتە یەك دەگرن. ((جۆلّ رۆمان))

❖ هیوای بیّ بەخت، بۆ بەختی کامەرانی، وەکو هیوای تاوانکارە بە فریشتەی ئاسمان.

❖ هەموو پیاویّکی ژیر، ئەو ژنەی هەلّی بژاردووە خۆشی دەویّ. ((هۆمیرۆس))

❖ هیچ شتیّك لە کچ پیرۆزتر نی یە، لە دلّی باوکیّکی پیردا. ((بوریبیریس))

❖ هەرکە پیاو تووشی دڵداری بو، ڕاستی هیچ نابینیّ،ئەگەر لە هەموو ژیرەکان ژیر تر بێت. ((ستەندال))

❖ هەر مرۆڤێك بە ڕێگای خۆی دڵداری دەکا. ((مەدام دۆسینینیە))

❖ هەست کردن بە برادەری، وەکو ئەوەیە هەست بکەیت وورگت هاوساوە لە گۆشتی گوێرەکەدا... بەڵام هەست کردن بە دڵداری وەکو ئەوەیە هەست بە خۆشی ((شەمپانیا)) بکەیت. ((سمۆئێل دجۆنسون))

❖ هەر کەسیّ ڕاستی ببینیّ لایەنی نەگرێت ترسنۆکە.

❖ هەرگیز نەتەوەکان نامرن.

❖ هاوڕێتی مرۆڤی باش، لە گێرەشێوێنی دەتپارێزیّ.

❖ هەموو شتێك پێویستی بە هۆشە،هۆشیش پێویستی بە تاقیکردنەوەیە.

❖ هیوا، وەك بەخت وایە، بەخەون نایەتە دی،بەڵکو بە قیرتاو کردنی شەقامەکان نەبیّ.

❖ هەندیّ کەسان ئەگەر مافی خۆیان وەرگرن، داوا دەکەن بۆ لە هەڵە بیّ بەشن.

❖ هەموو کەسیّ دەتوانیّ بەسەر خەما زالّ بیّ،تەنها ئەو کەسە نەبیّ کەتووشی بووە.

❖ هەست بە نەزانین،پالّ بە خاوەنەکەیەوە دەنیّ بەرەو زانین.

❖ هەوڵدانی شاردنەوەی هەر شتێك لە ژنەکەت، وەکو هەوڵدانی شاردنەوەی ڕۆژە لە کەڵەشێر.

❖ هەواڵێك کە دڵێك دەرەنجێنیّ، تۆ لیّ ی بێدەنگ بە مەیدرکێنە.

❖ هیچ مرۆڤێکی گەورە، ناژیّ بەبیّ سوود. ((کارلایل))

❖ هاوریی خراپە کەران، جگە لەخراپە هیچی تر فێر نابیّ.

❖ هەموو مرۆڤێك گرنگیان هەیە، ئەوەیە بیروڕای ئەساسی یەکەم، لە نێوان هەموو بیروڕایەکی دیموکراتی یەت. ((تشترتۆن))

❖ هیچ شتێك ئەوەندەی زانست جوان نی یە،بە مەرجێك کردەوەی جوانی لەگەڵدابێ و لەوەش جوانتر ئەوەیە کە زانست، حیلمی لە گەڵدا بێ. ((عەرەب))

❖ هەموو شتێك پێویستی بە عەقلە،عەقڵیش پێویستی بە تاقی کردنەوەیە. ((عەرەب))

❖ هەموو دەست پێ کردنێك سەختە. ((ئینگلیز))

❖ هەندێ لە ژنان شێتن،بەڵام خوای گەورەو میهرەبان خولقاندوویەتی بۆ هاورێتی پیاو.

❖ هیچ شتێك وەکو کات ژمێری زەنگدار،لەسەر پێت ڕاناوەستێنێ.

❖ هیچ شتێك نی یە لە خۆشەویستی بەولاوە،کە ئەو کەسەی خۆشمان دەوێ ژیانمانی پێشکەش بکەین. ((تۆلستۆی))

❖ هەڵەی مرۆڤ ئەوەیە، وا بزانێ بۆ یەکێکی تر ئیش دەکات.

❖ هەل، دەر گایەك نی یە لە بەردەممتا بکرێتەوە، بەڵکو دەبێ هەنگاوێکی دلێرانە بنێ ی.

❖ هەڵەکانت زۆر گەورە دیارە لای خەڵکی،هەر وەکو تۆش هەڵەکانی ئەوان بەگەورە دەزانی.

❖ هیچ مەترسە ئەگەر خەڵکی باسی خراپەی تۆی کرد، لەوە بترسە کە خۆت باسی خراپەی خەڵکی بکەیت.

❖ هاوسێ ی خراپ،خراپە، هاوسێ ی چاك، گەنجنەیە. ((هەسیۆد))

❖ هەتاو هەموو ڕۆژێك تازەیە.

❖ هەر یەکە لە ئێمە حیسابانێکی هەیە، هیوای پێ دەڵێن. ((ئەخیلۆس))

❖ هونەرى ژيان،لە تێكۆشان دەكا،نەك لە سەما،چونكە هەميشە بە پێوە ئامادە بين، بۆ گەڕانەوەى لێدانەكان كە لە ناكاودا دەيبينين. ((ئەريستبنيتس))

❖ هيچ كەس، تف لە ريش خۆى ناكا. ((ئەڵمانى))

❖ هيچ ماڵێك بێ مشك نى يە. ((ئەڵمانى))

❖ هەژار زۆرى پێويستەو ڕەزيل هەموو شتێك. ((ئەڵمانى))

❖ هەموو كەرێك وا هەست دەكا، ئەسپەكانى پاشايە. ((ئينگلين))

❖ هێلانەت لە نزيك كۆشكەوە، دروست مەكە. ((ئەسپانى))

❖ هيچ بەندينخانەيەك جوان نى يەو هيچ ئەونێيكيش ناشرين نى يە. ((ئيتالى))

❖ هەركەسێك بەرى ماڵى خۆى پاك كاتەوە،هەموو شارەكان پاك دەنبەوە. ((پۆلۆنى))

❖ هەنێ ووشە، لە شير زياتر دەبڕێ. ((ووتەى عەرەب))

❖ هەڵ مەسە بەو ئيشەى، كەنايزانى. ((صين))

❖ هەست كردن بە شەرمەزارى بە جۆرەى مرۆڤ،كارێكى زۆر گرنگە. ((منسێوس))

❖ هەڵسان و دانيشتن لەگەڵ پياو خراپاندا، وەكو نووستن وايە لە نێوان چەقۆو شيردا، هەرچەندە تووش برينداريش نەبيت، بەلاّم هەموو كات دەترسى.٠

## - و-

- وولآتەكەم هەموو جیهانە بە تەواوی،دانیشتوەكانیشی هەموو ئادەمیزادە٠ ((ولیام لوید گاریسۆن))
- ووتەكەم هەموو جیهانە، دینیشم ئەوەیە چی چاكە ئەوە بكەم٠ ((تۆماس باین))
- وەرە دلّدارم بەو لەگەلّما بژی، با بۆ خۆمان ئەو هەموو خۆشەویستی یە، بەكاربێنین. ((كریستۆفەر مارلۆ))
- ووشە، وەكو گولّی جوانە، هەروا رەنگیشی هەیە. ((ئەرنەنست ریس))
- وەكو دەلّێن، پارە پارە درووست دەكا. ((ئادەم سمیس))
- وەرزەكان دەگەشێنەوەو سیس دەبنەوە. ((تفیسۆن))
- ووشە، وەكو تیشكی ((ئێكس)) وایە، ئەگەر توانیمان بە چاكی بەكاری بهێنین، ئەوا بە ناو هەموو شتێكا دەڕوا.

## - ز -

❖ زمـان، دەتـوانێ ووشـەیەك بـەرەڵلا بکـا، لـە ئەسـب تیـژ تـر بـێ.
((صینی))

❖ زێـڕ بـە ئـاگر تـاقی دەکرێتـەوە، لـە کـاتی تەنگانـەدا دڵـی گـەورە تـاقی دەگرێتەوە. ((سینیکا))

❖ زۆربەمان ئەوە دەکەین،کە زۆربەی خەڵکی چاوەرەوانێتی کە بیکەین، بەم جۆرە یا دەبین بە پیاو چاك، یا تاوانبار، یا هەردوکیان.

❖ زانست خەتەرێکی گشتی یە، ئە وخەتەرە بەو جۆرەیە کە چاکە.

❖ زۆر ئاسانە مرۆڤـــ ساتێك لـە سامانەکەی گـەرێ، بـەلاَم کۆکردنـەوەی، هەوڵ و تەقەلایەکی زۆری دەوێ. ((لیف))

❖ زۆر گرانە بڵێ وا دەبێ، بە تایبەتیش دووا ڕۆژ. ((ستۆرم بیترسن))

❖ زۆر برادرایەتیت ئازاری داوم، ببە بە دوژمن بە ناوی برادەری یەوە.

❖ زانست بە هێزە.

❖ زانستی یە، کانی ی، خۆشەویستی بیرو باوەری سەربەستی و مرۆڤایەتی.
((دانیال و یستر))

❖ زۆر پیاو ویستی خۆی بکوژێ، بەلاَم تەنها وێنەکانی دڕی.
((جۆڵ رۆنار))

❖ زۆر گرانـە بڵـێن کـێ زیـاتر خراپـەت لەگـەڵ دەکـا دوژمنـەکانتان کـە بـە خراپترین شت هەڵدەستن، یا ئەو برادەرانەی کە چاکترین شت لەگەڵدا دەکەن.
((بلوار - لتیۆن))

❖ زۆر گرانـە هـەموو شـتێك چـنگك کـەوی بـەبێ هـیچ، بـەختیاری پێویـستە نرخەکەی بدەی.

❖ زۆر جار دڵداری لەبەر رووناکی کزدا درووست دەبێ، رووناکی لە دوو یا سێ رۆژدا نامێنێ، بەڵام دڵداری، لە دایك دەبێ. ((ستندال))

❖ زنجیرەی دوژمن بە یەکێتی، دەبچڕێ.

❖ زوربەی پیاوەکان،دوو روویان هەیە، روویەك کە ژنەکانیان دەیانناسن روویەکەی تریان، وا دەزانن ژنەکانیان نایانناسن.

## - ژ -

❖ ژیان درێژە ئەگەر پڕ بێت. ((سینیکا))

❖ ژیان خۆشە، بۆ ئەوەی خۆشی بوێ و ناخێکی پاکی هەبێ. ((لیۆن تۆڵستۆی))

❖ ژن درۆ ناکا، تەنها تەمەنی و نرخی کراسەکەبی و پارەی مێردەکەی نەبێ. ((ماری لۆردۆ نووای))

❖ ژن هێنان ژەمێکی نان خواردنە، شۆربا لە حەلوا باشترە کە لە کۆتاییدا پێشکەش دەکرێ. ((تۆمالی))

❖ ژن و مێردی سەرکەوت و، پێکهاتووە لە پیاوێ، گوێی لەهیچ نەبێ و ژنێك نەبینێ

❖ ژنی ژیر ئەو ژنەیە کە شوو بە پیاوێکی ناشرین دەکاو، دڵ و دەروون خراب، بۆ ئەوەی ئەگەر تەڵاقی دا، خەفەتی جیابوونەوە نەخوا.

❖ ژن هەرچەندە شێتیش بێت دەتوانێ پیاوێکی زیرەك ڕابکێشێ، بەڵام پێویستە بۆ ژن زۆر ئاگای لە خۆ بێت، ئەگەر پیاوێکی بێ ئەقڵ ڕابکێشێ. ((کبڵنگك))

❖ ژن بیست ساڵ بەسەر دەبا تاکو کوڕەکەی بە پیاو دەبێ، ژنێکی تر بە بیست دەقیقە شێتی دەکا. ((هێلین ڕۆلاند))

❖ ژیری ڕاستی، ئەوە نی یە تەنها بەچاو دەیبینێ، بەڵام دەبێ بزانی چی ڕوو دەدا. ((یەتەرنیس))

❖ ژیان لەگەڵ فەلسەفەدا یەك ناکەون، هیچ بەختیاری یەك نی یە، بەبێ دەس بەتاڵی. تەنها ئەوە کە بێ سوودە،هەر ئەویشە خۆشیمان پێ دەدات.

((چیخۆف))

❖ ژنی چاك و تەندروستی چاك، گەنجینەی پیاوە. ((جۆان))

❖ ژن، كلیلی ماڵە. ((تۆماس فۆلەر))

❖ ژن عاشق، لە پاش گەزبوونەوەی پیاو دەبووریّ، بەلاّم پیاو ئەوە ناتوانیّ، چونكە ئەوەیە جوودایی لە نێوان خیانەتی ژن و خیانەتی پیاودا. ((ستندال))

❖ ژنان زانان لە دلّداری دا،بەلاّم پیاوان دتوانن فێری ئەوە بن گویّ نەدەن. ((دوومێر))

❖ ژیر لای ئێمە ئەوەیە،كە ڕێمان پیّ ی دەدات گێل بین.

❖ ژیان هیچ شتێك ناكا، بەلاّم هیچ شتێك وەكو ژیان نی یە. ((ئەندریّ مالرۆ))

❖ ژیر ئەگەر بیر نەكاتەوە دەبیّ بە شێت، شێتیش ئەگەر بیر نەكاتەوە بە ژێر دەبیّ. ((شرشنگك))

❖ ژنان دین بۆ سەیركردن، هەروا دێن بۆ ئەوەی سەیری یان بكرێت. ((ئۆفید))

❖ ژیری، نی یە بە پیاو بلّیّ ی ((دەژیم)) چونكە كات بەسەر چوو، ژیان بەیانی هەیە، ئەمرۆ بژی. ((مارسیالّ))

❖ ژیانێك كە سوودی نەبوو، لە پێشەوە مردنە. ((گۆتە))

❖ ژن بەبیّ پیاو سیس دەبێتەوە، پیاویش بەبیّ ژن،وور دەبیّ. ((ئەنتووان چیخۆف))

❖ ژن شتێكە بە سرووشت دەجولّێتەوە، بۆیە من زۆر باش دەزانم كە لەسەر یەك حالّە دلّداری یە تاسەر نامێنن. ((بترارك))

❖ ژیان، هەر لەبەر چاوی ئەوانە تارێك دیارە، كە بە چاوێكی ڕەشەوە سەیری دەكەن.

❖ ژیان تەونە، مروڤێش تالّێكە لەو تەونە.

❖ ژیان پێوەری بە درێژی ناکرێ، بەڵکو بە ئیشکردن و چاکە کردن لەگەڵ کەسانا، کە دەیکەی.

❖ ژیان هەبێ، هیوا هەیە. ((ئینگلین))

❖ ژن هێنان، وەکو سوپا وایە، هەموو کەسێ بێزاری دەر دەبرێ، بەلاّم سەرت سوور دەمێنێ، کە ژمارەی ئەوانە دەبینن کە دێن دووبارە ناویان تۆمار دەکەن.

❖ ژن، بۆ ئامۆژ گاری جوان، خەسوو بۆ بەخێرهاتن کردن، بەلاّم هیچیان بەقەد خۆشەویستی دایك نی یە. ((لیۆ تۆلستۆی ١٨٢٨ ـ ١٩١٠ لە رۆمانی ئانا کارنیا))

❖ ژن، هەرگیز لەو پیاوە تورە نابێ، ئەگەر پیاوێ خۆشەویستی پێشکەش بکا. ((سیرفانتس))

❖ ژن ئەو پیاوە هەڵدەبژێرێ، کە هەڵی بژاردووە. ((پۆڵ جیراڵدی))

## - ی -

❖ یەکە ئاژەڵ کە ڕوومەتی لە شەرما سوور هەڵدەگەڕێ ی مرۆڤە.

❖ یاسا توونده، بەڵام یاسایە. ((لاتینی))

❖ یەك ووشەی چاك، سێ ی مانگی زستان گەرم دەکاتەوە. ((یابانی))

❖ یاسا، چی دەسەڵاتە، ئەگەر پارە پاشا بێت. ((بترنیۆس))

❖ یەکەم میر، خوێن ڕێژ بوو کراسێکی سووری لەبەر کرد، بۆ ئەوەی لە ژێر ئەو ڕەنگەدا، گوناهەکانی بشارێتەوە.

❖ یەکەم مەرجی دڵداری کامەران، ئەوەیە کە مرۆڤ پێوە بتلێتەوە.

❖ یەك باوك، بە قەد سەت مامۆستا زیاترە. ((جۆرج هەربەرت))

❖ یەکەم خۆشەویستیمان،هیچ خۆشەویستی گەورەمان نی یە. ((ستندال))

❖ یەك سەنتیمەتری خۆشی،سەر کەوتووترە لە بستێ خەفەت،چونکە پێکەنین لە شتە تایبەتییەکانی مرۆڤە. ((رابلێەر))

## - ك -

❖ كامەرانترین مرۆڤ كامەیە ؟ ئەو كەسەیە ڕێزی لێهاتوانی دەگرێ و بەشداری خۆشی یان دەكا، وەكو خۆشی خۆی بێت. ((گۆتە))

❖ كامەرانی بیرێكی وون بووە لە ئەوروپا. ((سان جوست))

❖ كامەرانی مرۆڤ،لە ژیاندایە،ژیانیش ئیش كردنە. ((لیۆن تۆڵستۆن))

❖ كار كردن،گرنگترین شتە لە جیهانە... لە بەر ئەوە پێویستە هەندێك هەڵگرین بۆ سبەی.

❖ كامەرانی، لە نزیك ئاگردانەكەمانەوە دەڕوێ، لە باخچەی نامۆیان دا دەبچڕدرێ. ((دۆگلاس جیرۆڵد))

❖ كاتێ ووشەمان ویست،دڵداری فێرمان دەكا چۆن دەیخەینە قالبی نووسینەوە،كاتێ لەشەرما سوور هەڵدەگەڕێن،دڵداری ئەمری پێدەكاكە بینووسین. ((ولیام مازەر))

❖ كەس لە ئێوە ناڵێ ((نە ))لە پاش ووتنی ((بەڵێ)).

❖ كە ئێمە لە ژیان نەگەین، چۆن لە مردن دەگەین.

❖ كات بدە برادەرەكانت خۆشی بۆ ژنەكەت،وا بكە مێشكت بحەسێتەوە،بە جۆرێك بتوانی ئیشی ڕۆژانەت بە جوانترین شێوە بەڕێوەبەری. ((فیدرۆس))

❖ كاتی ئەوەم نی یە پارە كۆكەمەوە ((ئاغاسین))ئەو كاتەی كە پارەیە زۆریان داپێ ی بۆ ئەوەی زنجیرە ووتارێك دەگرن.

❖ كەم جار بیروڕای خەڵكی یەك دەگرن،تەنها لە كڕینی دیاری ژن هێنان نەبێ.

❖ كۆنترین وكورت ترین ووشە،لەهەموو شتێ زیاتر بیركردنەوەی دەوێ.((فیتاگۆرس))

❖ كات ژمێر، سەر زەنیشتم دەكات. ((شكسپیر))

❖ كراس قەشە درووست ناكا.

❖ كویلەی ناسك، دەبێتە جەوركەر ئەگەر بۆی لوا. ((هاربێت پیتشرستۆ))

❖ كامەرانی، ئەو ئاوازە ناسك و ئەفسوناوی یەیە كە تەلی ژیان دەینێرێ.

❖ كینە خەنجەرێكە مرۆڤـ لە دڵی خۆی دەدا.

❖ كەسێ بزانێ قسە بكا، دەبێ بشزانێ كەی قسە دەكا. ((یۆنانی))

❖ كاتێ خۆشی تەواو دەبێ، دەگەڕێتەوە بۆ ئازار. ((تشوانگ تزو))

❖ كـاتێ مرۆڤـــ خرایــە بەهەشــتی (عــدن)ەوە بــۆ ئــەوە خــراوە ئــیش بكات،ئەمەش بەڵگەیە كە مرۆڤـ بۆ پشوودان لە دایك نەبووە. ((فۆلتێر))

❖ كاركردن،یاسای ژیانەو چاكترین بەریەتی. ((لویس مۆریس))

❖ كراسی دزراو،نارێكە بۆ دزەكە. ((فەرەنسی))

❖ كەر،لە ناو دركا نانوێ. ((تیوقریتس))

❖ كاتێ چێشت كەرەكان،شەڕ دەكەن،مریشكەكان دەسووتێ. ((ئیتاڵی))

❖ كۆبوونەوەیەك بوو، لەو كۆبوونەوانە، دوو جار بكۆكە پـێش ئـەوەی قـسە بكەی،پاشان بێ دەنگ بە.

❖ كات، بەرگدورێكی خاوەن بەهرەیە، بۆ چاك كردنەوە. ( (فیس بۆڵدۆین))

❖ كورتترین خۆشی، لە هەموو خۆشی یە، خۆشترە. ((فاركیۆهار))

## - گ -

❖ گیروگرفتی دارایی،تاکە شتە،کەمرۆڤ و ئاژەڵ لە یەك دەکاتەوە.((مارسێل ئێمیە))

❖ گۆشە،خۆی شتێکە. ((شکسپیر))

❖ گاڵتە،پێچکەی عەرەبانەی ژیان چەور دەکات و یارەمەتی دەدات کە بە نەرمی بسووڕێ.

❖ گەورەیی لە ڕاستیدا ئەوەیە،پیاو گەورەی خۆی بێ. ((دانیال دێمۆ))

❖ گوڵلە،شێتەو سونگی پاڵەوانە. ((سۆفارۆف))

❖ گومان لێ کردن، یەکەم پلەی باوەڕکردنە. ((سمۆئیل کونسون))

❖ گرنگ ئەوەیە گۆرانی یە کۆنەکان و نەفرەت لێ کراوەکان گۆڕکەین و تابوتێکی گەورەم بۆ بێنن،ئایا دەزانن بۆچی ئەو تابوتە بەو زلەو گەورەیی یە بێت ؟ لە هەمان کاتدا خۆشەویستی و خەفەتی تێدا دانێم. ((هاینی))

❖ گاڵتە بە جێگەی بریندار دەکا،ئەو کەسەی کەهیچ کاتێ بریندار نەبووبێ. ((شکسپیر))

❖ گیتی، کتێبێکی جوانە،بەلاّم سوودی نی یە بۆ ئەو کەسەی کە نەتوانێ بیخوێنێتەوە. ((گوڵدۆنی))

❖ گیروگرفتی مرۆڤـ ـی دەوڵەمەند ئەوەیە، دەبێ لە گەڵ مرۆڤـ ـی دەوڵەمەندا بژێت. ((لۆگان سیس))

❖ گەورەترین داوای مرۆڤـ لە ژیاندا سێ شتە، خواردن، جوانی، برادەری، مرۆڤایەتی بۆ ئەو کۆمەڵە دەگەڕێتەوە کە ئەو سێ شتەی تێدا بێ،ئەگەر لە ژیانیدا ئیشی چاکە بکا.

❖ گەوج ئەوەیە،تووڕە دەبێ و زۆری لێك دەداتەوە،بەلاّم ژیری خاوەن هۆش ئەوەیە کە پێشوازی تووڕەیی و لێك دانەوە ناکات.

❖ گرنگترین شت لە جوانیدا ئەو پارچەیەیە،وێنەکێش ناتوانێ هەستی خۆی پیشان دا هەرچەندە هەولّیش بدا ئاگاداری بکا.

❖ گەش بین، ڕەنگ دەبینێ،گەرچی ئەو ڕەنگە نی یە. ڕەش بین ڕەنگیش دەبینێ و بڕوای پێ ناکات. ((بابە رۆنە))

❖ گرنگ ترین شت لای ئێمە ئەوەیە،ئێمەش باوەڕمان وەکو ئەوانی تر بێ.

❖ گەورەترین بەختیاری کە دلّداری پێمانی بەخشی، هاوڕێتی ئەو ئافرەتەیە کە یەکەم جار خۆشمان ویستووە.

# - ل -

❖ لە بەختەوەری ژن ئەوەیە ڕزگاری بووە، لە شووکردنی بەژن.

❖ لە بێ ئـەقڵی پیـاو، ئەوەیـە، دووای ژنـی مێـردار دەكەوێ،هیـچیش گـوێ نادەن تەنها بەو ژنەی شووی كردووە و دووای دەكەوێ.

❖ لە وێدا ژن هەیە لە بەر خۆشەویستی خۆی دەكوژێ، بـەڵام هەمیشە هـەر ژنن. ((ئەتین ڕای))

❖ لە شاری كوێران، ڕووتان پاشان.

❖ لە كڵێسەدا، لە گەڵ قشەكان و لە مەیخانەدا لە گەڵ مەی خۆرەكاندا.

((دانتی))

❖ لەوە خۆشتر نی یە تۆ بە دزی یەوە كارێك بكەیت،پاشـان هەواڵەكـەی بـە ڕێكەوت بلاوبێتـەوە. ((تشارلزلام))

❖ لە مرۆڤـ پێویستە تێكوشان،ئاسمانیش پێویستە،سەركەوتن بدا.

((هۆمیرۆش))

❖ لە ماڵا هیواو ئاواتم ئەمەیە. ژنێك، بە هەموو ئەقڵێوە. پشیلەیەك، لەنێوان كتێبدا بەڕێوە بڕوات. برادەر،لە هەموو وەرزێكدا. بێ ئەمانە ناتوانم بژیم.

((ئەبولینێر))

❖ لە هەموو هەورێك زریان نابێ. ((شكسبیر))

❖ لە هەموو هەورێك باران نابێ. ((كورد))

❖ لەش سوودی نی یە، ئەگەر ئەقڵ نەبێ.

❖ لە بازاردا قسە باوی نی یە، تەنها سامان نەبێ. ((هێروتداس))

❖ لە هـەموو دەمێكـاو لـە هـەموو وولاَتێكـدا، ژن بڕیـاری ئـەوە دەدا لەسـەر هەڵەیەك لێ بوردن هەبێ یا نەبێ. ((سمۆئێل تێلەر))

❖ لە کاتی باوکە (ئادەم) ەوە، هیچ خراپەیەك نەبووە، ئەگەر ئافرەت دەستی تێدا نەبووبێت.

❖ لەبەردەم کارێکی هونەریدا، پێویستە بوەستین وەکو لە بەردەم میرێکدا دەوەستین، ئەگەر پەیڕەوی ئەوەمان نەکرد، ئەوا تەنها گوێمان لە دەنگی خۆمان دەبێ.

❖ لە شەڕدا بیرکەرەوە،چۆن دەتوانی هەموو مرۆڤــ ڕزگار بکەیت.((تشین تشێکۆ))

❖ لەسەر داری ڕزیو، نیگار درووست ناکرێ.

❖ لەو ژنانە بترسە رەوشتیان خراپە،بەلاًم باوەڕت بە هیچ ژنێك نەبێ.

((ئیتالی))

❖ لەبەر چاوی خوا هیچ مرۆڤێك بێزراو نی یە. ((لاوتسی))

❖ لە وولاًتە بە پیتەکاندا زۆر جار، ڕێگاو بانەکانیان، قووراویە.

((فەرەنسی))

❖ لە نێوان هەموو پیشەیەکدا، لە سوالًی ناشرینتر نی یە. ((ئەلًمانی))

❖ لە ناخی هەموو کەسێکدا، ترسنۆکی و ئازایەتی هەیە. ((کارلایل))

❖ لە هەلًبژاردنی برادەرا لەسەرخۆ بە بۆ گۆرینەوەشی لەسەرخۆ بە.

((بنیامین فرانکلین))

❖ لەوێدا دوو گیتی هەیە، ئەو گیتی یەی کەبە شریتیّ یا بە راستی دەیپێوین، ئەو گیتی یەکەش بە دلّ و مێشك، هەستی پیّ دەکەین. ((لیّ هەنت))

❖ لەوێدا هیچ شتێك نی یە،لیّ پرسراو بیّ، دەربارەی خۆشی کۆن، لە بیرێکی لاواز بەولاوە.

❖ لە دەم چاوی پیاو و ژندا، خوا دەبینم. ((والًت ویتمان))

❖ لە نێوان ئەو دەسکەوتووانەی ئادەمیزاددا،چەندە جوانە منالْ لە چاوی ئادەمیزاددا.
((شیشرۆن))

❖ لە برادەرێتیدا ئەو هەڵانە کە ئازارە بۆ برادەرەکانمان دەیبینین،لە خۆشەویستیدا تەنها ئەو هەڵانە دەبینین کە توشی خۆمان دەبێ.
((لابرۆیر))

❖ لە دڵداری دا پێویستە لە سەر پیاو ڕاست بکا،لە برادەریدا پێویستە تێ بگا.
((ئەبیل بۆنار))

❖ لە نێوان هەموو ڕێگەکاندا،کە دەبێتە خۆشەویستی ژن دڵ سووتانە.
((بۆمۆنت ویفلیتشەر))

❖ لە هەموو ئازارێ گەورەتر، ئەو ئازارەیە،لە کاتی ناخۆشی و لێ قەومانە، هەندێ کاتی خۆشیت بیر کەوێتەوە.
((دانتی))

❖ لە هەموو بەختیارێ یەکی گەورەتر،لەم ژیانەدا،دۆستایەتییە لەبەختیارێ یەتی،دۆستایەتی ئەوەیەپیاو یەکێکی هەبێ کە بەدزی یەوە بەڕێی بخا.
((ئەلیساندو ماترۆنی))

❖ لاوەکان باوەڕیان وایە لە نووسینی شانۆگەریی ئاسانتر نی یە،ئەمەش ڕاستە،بەلاَم لە سەرکەوتن گرانتر نی یە.
((کابوس))

❖ لە هەموو شتێ جوانتر لە سروشتدا،ماوەم بدەن بلێم ژنێکی جوانە.
((ماکۆلی))

❖ لە هەموو جێگایەك دادپەوەری هەبوو، سەربەستی لەوێدایە کە ئێمە ڕازین.
((دزرائیلی))

❖ لە تاریکاییدا چەند جوانە مرۆڤ باوەڕ بە ڕوناکی بکا.
((ئەدمۆن رۆستان))

❖ لە بیابانا گرفتاری دزان بی،چاکترە لەوەی لە ناو کۆشك و تەلارا هاوڕێی نەزان بی.
((چینی))

❖ لێبوردن و لە بیرچونت هەبێ،لێبوردن بۆ مێشك و لە بیرچوونەوە بۆ جەرگت باشە.

❖ لە پێش ژن هێنانما شەش تیورم هەبوو دەربارەی منداڵ، ئێستاش شەش منداڵم هەیە و هیچ تیۆەرێك ((نظرية))م نی یە. ((دکون رۆشسترون))

❖ لە وێدا زنجیرە رۆمانێکی پۆلیسی هەیە تاوانبار لە یەکەم بەشی دا دەگیرێ،مەبەستم رۆمانی ژن هێنانە.

❖ لە قسەکانی فەیلەسوفی بەریتانی ((فەرنسیس بیکۆن)) دەربارەی کتێب :لە وێدا کتێب هەیە پێویستە تامی بکەین هەندێکیان قووت بدەین،چەن کتێبێکی کەم هەیە پێویستە بیجارین و هەزمی بکەین.

❖ لەم بووارەدا دانیال ئۆکۆنیل دەڵێ ((لێم گەرێن با سروودی میللەتێ بنوسم لاشم گرنگ نی یە یەکێ یاسای بۆ دادەنێ.

❖ لە وێدا هونەر هەیە بۆ خوێندنەوە،وەکو لە وێدا هونەر هەیە بۆ بیرکردنەوە، هونەریش هەیە بۆ نووسین. ((دزرایللی))

❖ لە هەر جێگایەك ئاشتی هەبوو، خوا لەوێ یە. ((جۆرج هربرت))

❖ لە کوێ دەژین،یا چۆن،ئەوە گرنگی یەکی گەورەی نی یە،ئەوە گرنگە مرۆڤ بژی

ئەرنست دیمنت))

❖ لێدانی خەڵکی پیشەیەکی ناشرینە، چی چەناباز بێت یا شۆفێری ئۆتۆمبێل بێ.

❖ لە وێدا جلێك هەیە بۆ رۆمان،وەکو جلێك هەیە بۆ لە بەر کردن.((دیجۆن دراین))

❖ لە دڵدرییەکیان،پرسی،چی خۆشە ؟ ووتی ((ماچێك لە ناکاوا)) لە بێ روویەکیان،پرسی چی لای تۆ خۆشە ؟ ووتی ((خوانێکی ڕازاوەی بێ پارە.٠٠ لە

تاجرێکیان،پرسی لای تۆ چی خۆشە ؟ ووتی ((کارێك سوود بکا)) لە شوانێك یان،پرسی،چی لای تۆ خۆشە ؟ ووتی ((دۆڵێك گیادار بیت لە گەڵ شیرو ماستا)) لە ڕۆژنامەنووسێکیان،پرسی،چی لای تۆ خۆشە ؟ووتی ((شتێك یا نهێنی یەك ئاشکەرای کەم و ووتەیەك ڕێکخەم))٠ بەهەژارێکیان ووت،چی لای خۆشە ؟ووتی ((پارچە قوماشێك ئێسکمی پێ داپۆشم و خواردنێ سکمی پێ پڕ بکەم٠

❖ لە سەر ڕێگا،لابدەی درك بە پێتا دەچێ٠

- م -

❖ مرۆڤ،ساڵێك كۆ دەكاتەوە،بەڵام نازانێ دوور نی یە پێش ئەوەی شەو دابێ بمرێ.

((لیۆ تۆلیۆی))

❖ مرۆڤ -ی چاك، زۆر جار شەرم دەكا،تەنانەت لە بەردەم سەگەكەیدا.

((ئەنتۆن چیخۆف))

❖ مرۆڤی سەربەست،زۆری لێ ناكرێ،زۆر كەریش ئەوەیە زۆر لە سەربەست دەكات.

❖ مرۆڤ لە ئاساسدا ئاژەڵێكی كیوی و ترسناكە،چونكە بە مالیێتی دەیناسین بە هۆی بوونی پێشكەوتنەوە،بەڵام ئەو كاتەی ڕژێمی یاسا رووخا،ئەو كاتە بەرەڵڵایی دەس پێ دەكا ئەو كاتە ڕاستیەكەی دەردەكەوێ،مرۆڤ لە پڵنگ و كەمتیار،كەمتر نی یە لە دڕندەییدا،كە هیچ (ڕەحمی) نی یە.

❖ مێژووی زانیاری،زنجیرە مۆسیقایەكی گەورەیە،دەنگی جۆراوجۆری میللەتان یەك لە دووای یەك دەردەكەوێ. ((گۆتە))

❖ مرۆڤ،نازی بە بێ بڕواكردن. ((ئەنتۆنی چیخۆف))

مرۆڤ،چۆن دەتوانێ خۆی بناسێ ؟ئەوە بە بیركردنەوە نی یە،بە ئیش كردنە،هەوڵ بدە ئەوەی لە سەر شانتە جێ بە جێ ی كە ئەو كاتە ڕێزی خۆت دەزانی. ((گۆتە))

❖ مرۆڤ نابێ كۆڵ بدا لە ڕێگەی بیرو باوەڕدا. ((م. ع))

❖ منداڵان، دەیانەوێ وەكو باوكیان بن، ئەوەش بكەن كەباوكیان دەیكەن.

((ولیام كوبت))

❖ مامۆستا ((بۆ)) وتی : دەتەوێ فێرت كەم زانست چی یە ؟ ئەو كاتەی شتێك دەزانی،بڵێت دەیزانم،ئەو كاتەش كە نایزانی، بڵێت نایزانم،ئەوە زانستی یە.

((كۆنفۆشیۆس))

❖ مرۆڤـ بە درێژایی تەمەنی، لە ئەرز دەخوا،بەڵام ئەرز بە یەك تیکە دەیخوا.

❖ مرۆڤـ ـی سەرکەوتوو لێوی دەجولێنێ و مرۆڤی دووا کەوتوو هەر دوو ناو لەپی دەجولێنێ.

❖ مردن هەقە،ئێمەش ناتوانین ئەوەی ڕەوایە چاکی کەین. ((گراهام گرین))

❖ مێژوو درووست کراوی سەرکەوتن یا کەوتنی کاتی نی یە،بەڵام جولانەوەی گەورەیە و گەلان بەرەو سەرکەوتن یا لە ناو بردن دەبا. ((لویس برۆمفیلد))

❖ منداڵ، لە کوێدا بە ئاسوودەیی بنوێ، ئەگەر لە کۆشی دایکی دا نەبێ.

❖ مۆسیقا ئەو کاتە دەس پێ دەکا، کە زمان نامێنێ. ((هۆفمان))

❖ من هەمیشە نیوە دێڕی یەکەمی شیعرەکەم جوان ڕێك دەخەم بەڵام زۆر بە گران ئەوەکانی تریان ڕێك دەخەم. ((مۆلێیر))

❖ مرۆڤـ دەتوانێ هەموو جیهان بناسێ بەبێ ئەوەی لە ماڵی خۆی بێتەدەر.

((لاوتسی))

❖ مەبەستی زانست،تەنها گەڕانە بە دووای بیرێکی وون بوودا.

((مەنسیۆس))

❖ مشت ومڕ،لە گەڵ خێزانەکەتا مەکە ماندووبیت ولە سەرخۆ بیت.

❖ منداڵی شەڕانی،هەمیشە منداڵی دراوسێ یە.

❖ مەڕۆ بە شوێن ئەوەی بە چاو دەیبینی،بڕۆ بە شوێن ئەوەی کە بە هۆش دەیبینی.

❖ مۆسیقا،چاك لە دڵ دەدا،وەكو لەگەڵ دەڵدارەكەتا بیت. ((ستندال))

❖ مـن پەشـیمان نیم،كـە یـەك ژیـانم هەیە،ئـەویش لـە ڕێ ی وولاّتەكەمـدا پێشكەشی دەكەم. ((ناسان هایل))

❖ مرۆڤـ بیرەوەری هەموو شتێكە. ((فیتاگورس))

❖ ماوەی ژیان ئەوەیە بەرەو پێشەوە بڕوات. ((سەمەوئیل دكسونسون))

❖ من بۆ گاڵتە لە گەڵ ژندا درۆ دەكەم،ئای كە شتێكی جوانە.

❖ من حەزم بە هاوڕێتی هەیە. ((مۆنتسكیۆ))

❖ من دژی ڕوون كردنەوەی درێژم،چونكە ئەوەی ڕوونی دەكاتـەوەو ئـەوەی گوێ لێ دەگرێ هەڵخەڵەتاوە. ((گۆتە))

❖ من لەو باوەڕەدام هـەمووان بزانن،یـەك بەیەكدی چـی دەڵێن،لـە جیهانـدا چوار برادەر نەدەما. ((باسكاڵ))

❖ مرۆڤـ —ی ئازاد بەختی خۆی درووست دەكـا، هـەموو مـرۆڤێكیش كـوڕی ئیش و كارەكەیەتی. ((سرفانتس))

❖ ماڵ وەكو دست و پێ وایە،یا بەكاری بێنە یا لە ناوی بەرە.

((هەنری فۆرد))

❖ ماڵی چاك،كڕیاری حازری هەیە. ((بلۆتس))

❖ مرۆڤـ،بۆ كۆمەڵ درووست كراوە. ((ولیام بادكستون))

❖ مـن لـە دڵێكـی ڕاسـت گـودا هێزێـك دەدۆزمەوە،لـە هێزێكـی نـاو شـارێكی شوورەكراوە بە هێزترە. ((دیكون لیلی))

❖ مرۆڤـ چی یە بێ پەروەردە ؟ كویلەیـەكی ناسـكی جوانـە و دڕەندەیـەكی بیر كەرەوەیە. ((جۆزیف ئەدیسۆن))

❖ من ژیانی ڕاستی،وێنە دەگرم،وەكو ئەو مرۆڤانە كە تێدا دەژین.٠ پێویستە شانۆگەری بنوسرێ،مرۆڤی تێدا بڕوات و بێت،بێن و بڕۆن،نانی ئێـوارە بخـۆن قـسە

بکەن دەربارەی گەرماو سەرما یاری کاغەز بکەن.ژیان پێویستە وەکو ئەوەی هەیەو مرۆڤ چۆنن ئەوها بن،نەك لەو پەڕی ئاڵۆزییدا بێت،لە هەمان کاتیشدا زۆر ئاسایی و ئاسان بێت،وەکو ژیان هەیە. ((چیخۆف))

❖ مێژوو کە هەواڵی مرۆڤی کۆن دەگێڕێتەوە،وادەکات حوکم بە سەر داهاتوودا بدەن. ((یجیفرسۆن))

❖ مەبەستمان لە درووست کردنی دەوڵەت ئەوپەڕی بەختیاری یە، بۆ هەمووان نەك بۆ چینێکی تایبەتی. ((ئەفلاتون))

❖ مێژوو وەکو شێتە،خۆی دووبارە دەکاتەوە. ((بۆڵ مۆران))

❖ نابێ لە کاتی دڵداریدا زۆر جار چاوتان بکەنەوە بۆ ئەوەی زۆر خۆشەویستەکەتان نەبینن هەروا پێویستە گوێش نەگرن،بۆ ئەوەی زۆر نەبیستن،ئەگەر ڕاستیتان دەوێ،دەبێ چاوێك و گوێ یەکتان داخەن.

❖ نووکتە بازی ئامێزێکی کۆمەلآیەتی جوانە. ((ئەندرێ سیفغرید))

❖ ناوداریێتی،کە پەرەو جوانی بێ،لاوازە،نامێنێ،بەلآم سەرکەوتنی بیر، سامانێکی جوان و هەمیشەییە. ((سالوست))

❖ نووستن،دەوڵەمەندی،تەندروستی،بۆ ئەوەی پێوە ڕابوێرین بە ڕاستی،دەبێ نەوەستان هەبێ. ((جان بۆڵ فریدرێك))

❖ نابێ پشیلەی نووستوو هەڵبسێنی. ((فەرەنسی))

❖ نابێ پێلاوە کۆنەکان بخەیتە لاوە،تاکو پێلاوە تازەکان دەگات. ((ئەڵمانی))

❖ ناخۆشی خەڵکی تر،ناخۆشی خۆمان لە بیر دەباتەوە. ((لوقیان))

❖ ناوداریێتی،ئامێرێکە،لە ئامێرەکانی مۆسیقا،دوو دڵی و ڕاڕایی حەز لێ نەکردنە.

❖ ناخۆشی، وون بوونی هیوایە.

❖ نابێ هیچ کەس لە ئێمە لە یەك جۆر زیاتر خەفەت بخوا.

❖ ناوەوەت چی بێ، لە دەرەوەت دەردەکەوێ. ((صینی))

❖ نۆ بەشی ژیرێتی،پێویستە پیاو ژیر بێت لە کاتی پێویستدا.((تیۆ دۆر ڕۆزفلت))

❖ نابێ هیچ شتێکی تایبەتی،لە ڕێگەی شتێکی گشتی دا بوەستێ.

❖ نەبوونی ئەدەب،هۆی هەموو خراپەیەکە.

❖ نزیك ترین شت بۆ چاوی پیاو،ڕووی ئەو ئافرەتەیە کە خۆشی دەوێت.

❖ نیشتمان پەروەری،بە تەنها بەس نی یە،پێویستە ڕق و کینە بەرامبەر کەس هەڵنەگرم. ((ئەدیس کافیل))

❖ نهێنی خۆشەویستی لە لەشدا زیاد دەکا، لە گەڵ ئەوەدا لەش کتێبەکەیەتی. ((دیگۆن دن))

## - س -

❖ سەرکەوتن و ناوداریێتی بە تایبەتی لە دەرەوە جوانن،کاتێ خەو دەبینین،بەڵام کاتێ دەستمان دەکەوێ تەنها هەست بە درك دەکەین.
((ئەلەکسەندەر کوریین))

❖ سەربەستی دەنگی مرۆڤە. ((ئەندرێ بریتۆن))

❖ سەربەستی دەریایێکی هێرش و ئاڵۆزە،ترسنۆکەکان هێمنی جەورکەرەکانی دەوێ. ((تۆماس جیفرسۆن))

❖ سەفەرو کۆچ کردن و گۆڕینی جێگا هێز دەدا بە مرۆڤ. ((سینیکا))

❖ سەفەر کەری چاك و ژیر،هەمیشە وولآتەکەی بێ نرخ ناکا.
((کارلۆ گولدۆنی))

❖ سامان تا سەر هاوڕێ نی یە،بەلآم هاوڕێی باش تا سەر سامانە.
((ڕوس))

❖ سەری بێ ئەقلێ وەکو میوەی سەرمابردوو وایە. ((فەرەنسی))

❖ سروشت هونەری خوایە. ((دانتی))

❖ سەرباز لە کاتی ئاشتی دا،وەکو کوانووی ئاگر وایە لە هاوینا.
((ئەڵمانی))

❖ سەگی تۆپیو گاز ناگرێ. ((ئینگلیز))

❖ سەنوقووقی پڕ، زوو قفڵەکەی دەپسێنێ. ((ئیتاڵی))

❖ سەفەری هەزار میل لە یەك هەنگاوەوە دەستی پێ کردووە.
((ئەخیلۆس))

❖ سەربەستی و زانست و بیرکردنەوەو قسەو باوەڕم بدەرێ.هیچ سەربەستی یەکی ترم ناوێ. ((ملتۆن))

❖ سەربەستی،كاتێ بتەوێ،ڕیشەی هەڵكێشی،درەختێكە زوو سەوز دەبێ.
((جۆرج واشنتۆن))

❖ سەری چاك،بەهەڵە ناخوێنێ. ((شیشرۆن))

❖ سەگەكەت برسی كە،دووات دەكەوێت.

❖ سەرپێچی كردن لە ستەمكار، خوا پەرستی یە. ((ئینگلیز))

❖ سوودی دڵداری چی یە، ئەگەر وا لە پیاو بكا،باوێژێك بدا ؟

❖ سەبر تاڵە،بەڵام بەرەكەی شرینە. ((ڕۆسۆ))

❖ سەبر كردن،چاكترین دەرمانە،بۆ هەموو ڕاڕاییەك. ((بلۆتس))

❖ سێ لە سەر دەی جوانی ئافرەت،بۆ سروشت دەگەڕێتەوە،حەوت لە سەر دەی بە جل و بەرگ قەرزارە.

❖ سەباز،خوێنی پێشكەش دەكا، بۆ ناودارێتی سەركردەیكەی.
((ئیتالی))

## - ش -

❖ شەرەفی هاوسێ کەمان، دەبێ تەماشای بە پیرۆزی یەوە بکرێ،وەکو شەرەفی خۆمان. ((وتەی کۆنە))

❖ شەوان، ئامۆژگاری لە گەڵ خۆیدا هەڵدەگرێ. ((میناندر))

❖ شەڕ لە (کۆشکان)) دایەو ئاشتی لە ((کوخ)) دایە. ((شامفور))

❖ شەقامی ئاسان، ڕۆیشتن بە سەریا گرانە.

## - ع -

❖ عەیبی خەڵکی لە بەردەممانایە، عەیبی خۆمان لە پشتمانەوەیە. ((سینکا))

❖ عاشقی گەورە،ئافرەتی خۆش دەوێ،بەڵام ئەوەی کە ئافرەتی خۆش دەوێ،عاشقی گەورە نی یە، ژنی جوانیش ژیانی ناخۆشی یە، بەڵام هەموو ئەو ئافرەتانەی ژیانیان ناخۆشە جوانن. ((تشانگ تشاو))

## - ق -

❖ قسە،دەفرێ و نووسین دەمێنێتەوە. ((لاتینی))

❖ قسەکردنت لە گەڵ خاوەن ئیشەکاندا،کورت و تێگەیشتو بێ.

((جۆرج واشنتۆن))

❖ قورسترین شت لە ژیانا، بێزاربوون نی یە، بەڵکو ئەوەیە ئەگەر ناچار کرایت بۆ کەیف خۆشی. ((بییر دانینۆس))

❖ ڕاڕایی و خونەگرتن،گەورەترین لاوازی یە لە مرۆڤیدا. ((ئەدیسۆن))

❖ ڕێگەی سەرکەوتن و دابەزین یەکە. ((هەرقلیس))

❖ ڕزگاربونمان و مردنمان، لە ناخی خۆماندایە. ((ئەبکتیتس))

❖ رقت و قینت لە تەمەڵی بێت، چونکە پرشنگدارترین شتە بۆ کۆکردنەوەی ژەنگ.

❖ ڕوون بوونەوە لە هەموو شتێك گرنگترە، بۆ بەکارهێنانی ووشە. ((کوینتیلیان))

❖ رشتەی دڵ، کە پرسیاری لێ کردم دەربارەی ڕۆژ ئاوابوون، وەڵامی دایەوە،بەبێ تۆ بەیانی بوونی نەبوو،ئایا تۆ نرخی خۆت دەزانی ؟ من دەتناسم و دەیانناسم، لە گەڵ سروەدا سزای سەرسوڕمان لە چاویاندا دیارە تاوەکو بەیانیش دەتلێتەوە.

## - ت -

❖ تاوان بۆ ماوەیەکی کەم بەسەر دەچێ،بەڵام دادپەروەری لەسەرخۆ ئەوەندەی پێ ناچێ هەست بە تاوانەکە دەکات. ((درایدن))

❖ تەنها جوانی قەسیدەکان بەس نی یە، پێویستە ئەفسوناوی بێ و ڕووحی گوێگر بەرێ بۆ ئەو جێگایەی کە دەیەوێ. ((هوراس))

❖ تەماشای ئەستێرە دەکەم و تەماشای تۆ دەکەم و لاپەڕەی دووا ڕۆژت دەخوێنمەوە. ((جاك ليندن))

❖ تۆڵەسەندن چاکە بۆ ڕەوشتی ئادەمیزاد و لەوێوە لێ بوردن لە دایك دەبێ. ((گراهام گرين))

❖ توڕە،مەبە لە خۆشەویستەکەت،لەو توڕەبوونە هیچت دەس ناکەوێت،تەنها ئەوە نەبێت بەجێت دەهێڵێ و لە داخانا پشتت دەچەمێتەوە.

❖ تەنگ و چەڵەمەی هیچ وولاتێك بە تەواوی ناو نابڕێ،بە هۆی ئافرەتەوە نەبێت،نەخۆشی و نەخوێندەواری دەتوانرێ نەهێڵریت،ئەگەر ئافرەتان بەبێ وەستان ئیشیان کرد. ((غاندی))

❖ تەنها ئەو کاتە نەبێ کە لە دایك دەبین ڕووناکی دەبینین،هەموو شتێك بەزیرەکی و زانیاری و پێگەیشتن فێر دەبین. ((فيدور دۆستۆيفسكی))

❖ ترس دەشێ زیاتر ماندومان بکا، لە سوواری ماینێك بۆ سەفەرێکی درێژی بێزارو. ((گراهام گرين))

❖ تەمەن، چاوەڕێ ی پیاو ناکات هیچ کاتێ، بەڵام چاوەڕێ ی دەکات کە دەگاتە سێ ساڵ.

❖ توڕە بوون، لە پێشا شێتی یە، لە پاشان پەشیمانی بوونە.

❖ تەمەن، لەوە کورت ترە کە جێ ی بەرەڵڵایی تێدا بێتەوە.

❖ تەنها لە وێدا چەن كەسێك لە دەوڵەمەند زیاتر بیر لـە سـامان دەكەنـەوە، ئەویش چینی هەژارە. ((ئۆسكار وایڵد))

❖ تۆزێ خۆشەویستی بدە بە منداڵ،قانجازت بەرامبەر ئەو خۆشەویستی یـە زۆر دەبێ. ((دجۆن ڕاسكن))

❖ تیمار كردن چاكترین شتە كە ژن دەیكا، تەنها برین نەبێ.

((باری دووریفینی))

❖ تـەنها ئـەوە بـەس نـی یـە كـە پیـاو جوسـت و چـالاك بێـت، مێرولـەش چالاكە،ئەوەی گرنگە جوست و چالاكیت بۆچی دەكەی. ((هەنری دایڤد سۆرۆ))

❖ تاقی كردنەوە زانستی یەكی ڕابوردووە. ((بالۆ))

❖ تیجارەت وەكو ئۆتۆمبێل وایە،پێویستە لێ ی خۆڕی تاكو بەرهەم بدات.

((مۆریس))

❖ تەماشاكەن هـەموو شـێتەكان فەیلەسـوف بـوون، هـەموو فەیلەسـوفەكان شێت بوون. ((ئەدگار ئەلەن بۆ))

❖ ترس، دووڵی یەو گومانە، زۆرجاریش لە لەشدا دەبێ، لـە ڕاسـتی دا لـەش هەموو كات هێمنە،ئەگەر لە نێوان بارو دۆخێكی زۆر نەگونجاو خەتەردا بێتیش.

❖ تورەبوون،جۆرێكە لە ترشی،ئەو مەركانەیـەی تێـدا زیـاتر دەیخـوا لـەوەی بیرێژی بەسەر شتێكی تردا. ((ج٠ك٠ تشترون))

❖ تەنها ئەوانەی كە نوقستانن تەماشای دیاری یەكە دەكەن نەك ئەوەی كـە بەخشیویەتی. ((كاترین دۆسیینی))

## - ح -

❖ حەز دەکەم ببم بە شاتۆبریان، یا نەبم بە هیچ ((فیکتۆر هۆگۆ، لە سەر یەکێ لە دەفتەرەکانی قوتابخانەکەی نووسیویەتی لە ١٠-٧- ١٩١٦ دا

❖ حەز دەکەی لە ڕامیاری بزانی، مێژوو بخوێنەرەوە.

❖ حوکم ڕانی،واتە تای هەر دوو ترازوو وەك یەك بن.

## - خ -

❖ خۆشەویستی یەکەم،هێز دووای ئەو، ئەم دوو شتە گەورە ترین بەختیارین لە جیهاندا.

❖ خوا هەموو ئەرزی داوەتە ئادەمیزاد، بۆ ئەوەی خۆشیان بوێ، لە بەر ئەوەی دڵمان بجووکە، وای لە هەریەکە لە ئێمە کردووە،پارچە ئەرزێکمان خۆش بوێ بە پێچەوانەی ئەرزەکانی ترەوە.

❖ خۆشەویستیش کورت و درێژی هەیە. ((هێلین هەنت))

❖ خۆشەویستی زۆر جیاوازی لە گەڵ ئێمەی پیاودا هەیە.

((ڕۆبەرت براوننگ))

❖ خۆشم ویستی کە ناسیتم،ئێستاکە دەتناسم، لە بەر ئەوەی کە ناسیتم،من زۆر خۆشتم دەوێ.

❖ خۆشەویستی هەموو کەسێك، جوانە. ((فادە))

❖ خۆشەویستی دڵدار، وەکو خۆشەویستی ڕاوچی یە، کە نەچیرەکەی ڕاو دەنێ. ((سکوث))

❖ خوا زانستی ژنی خستۆتە دڵێوە، چونکە کرداری ئەو زانیاری یە، هەمیشە کردەوەی خۆشەویستی یە. ((لامارتین))

❖ خۆشەویستی گەل ،یەکەم گەنجینەیە کە میر لە کاتی تەنگانەدا بیدۆزێتەوە. ((نیقۆلا ماکیافللی))

❖ خوێن، بە دووای خوێندا دەڕوا. ((دیفۆ))

❖ خۆشم ویستی کە بێ یار بووم، ئایا چی ڕوودەدا ئەگەر ((مخلص)) بووایەم. ((ڕاسین))

❖ خەفەت ناخۆم کەخەڵك نامناسێ، بەڵام خەفەت دەخۆم چونکی خەڵك ناناسم. (( کونفوشیوس))

❖ خۆزگە هەموو کەس خۆی بناسیایە. ((م٠ ع))

❖ خۆشەویستی هەردوکمانی بەرەو مردن برد. ((دانتی))

❖ خوا دەم و چاوێکی داوە پێت، خۆت دەم و چاوێکی تر بۆ خۆت درووست دەکەی. ((شکسپیر))

❖ خزمەت بکە، خزمەتت دەکەن، ئەگەر تۆ خەڵکت خۆش ویست و خزمەتیانت کرد، تۆ ناتوانی خۆت بشاریتەوە و ڕابکەی بەرامبەر ئەو پاداشتەی کە دەتدرێتێ. ((ئەمرسۆن))

❖ خۆشەویستی لەیەکەم جاردا، زۆر جار لە دووەم جاردا چاك تر دەبێ.

❖ خوا سەربەستی بەوانە دەدات کە خۆشیان دەوێ و هەموو کات ئامادەن بیپارێزن و بەرگری لێ بکەن. ((دانیال و بیستەر))

❖ خۆشەویستی،پاڵەوان درووست دەکات،بگەڕێ بەدووای خۆشەویستیدا. ((هندی))

# بەشی سێ یەم

## - پێشەکی -

خوێنەری بەڕێز — بەشی یەکەم و دووەمی ووتەکانی ژیان، کەوتە بەر دەست و چاوی ئێوەی ئازیزو خۆشەویست،بۆیە بڕیارم دا بەشی سێ یەمیش ئامادە بکەم — ئەویش ئەم بەشەیە،واتە بەشی سێ یەم.

هەر وەکو لە بەشی یەکەم و دووەمدا وتمان — ووتەکانی ژیان بریتیە لە بەرهەمی گەورە پیاوانی ئەم جیهانە، دەربارەی ژیانی کۆمەلآیەتی و ئابوری و ڕامیاری و هەموو لایەنەکانی ئەم ژیانە.

لەم بەشدا هەر لە سەر هەمان ڕێگا ڕۆیشتوین بۆ سوودی گشتی و هەموو لایەك.

ئەم بەشەیان زیاتر لە سەر ئافرەت دەدوێ بە تایبەتی زۆربەی ووتەکانی

((فەرەنسی))ن،بۆئەوەی زیاتر لە جیهانی ئافرەت،بەو باوەڕەی کە(ئافرەت نیوەی کۆمەڵە.

دیسانەوە دەڵێم، ئەو ووتانە هی گەورە پیاوانی جیهانە،جا مەرج نی یە،ئەوەی لەم کتێبەدا هاتووە،من خۆم باوەڕم پێ هەبێ،مەرج ئەوەیە بۆ من و هەموو کەسێك سوود لە چاکەکان وەرگرین و پەیڕەوری بکەین،ئەوانەی بە چاکی نازانین پێویستە لێی

دوور بکەوێنـەوە، هەرچـەندە هـیچ ووتەیـەك بـە خـۆڕایی نـەوتراوە،بێگومان هۆیـەکی هەبووە کە لەو دەم و بارو دۆخەدا ووتراوە.

هەروا داوای لێ بوردن لـەو بـراو خوشـکانە دەکـەین ئەگـەر کـەم و کورپییـەك هـەبوو لێمان ببورن.

محمد عبدالرحمن زەنگنە

کەرکوك — ١٩٨٦/١/١٢

## - ئە -

❖ ئەو دەمەی،ماچ دەکریٚ،بەختیارییەکەی ون ناکا،هەموو دەم وەك مانگ تازە دەبێتەوە. ((ووتەیەکی ئیتاڵی یە))

❖ ئەویندارى مۆسیقا و گۆرانی پیاوێکە،ئەگەر گوێی لێ بوو ژنێك لە حەمامدا گۆرانی بڵێ، لە کونی دەرگاکەوە نزیك دەبێتەوە گوێی لە سەر دادەنێ.

❖ ئێمە ماوەی ئەوە نادەین کە ناو دڵمان بخوێننەوە،تەنها بۆ ئەوانە نەبێ کە ناوی خۆیانی تێدا دەبی دەبیننەوە. ((ئەلکۆنتیس دیان))

❖ ئەی کچ لە کاتی ماچ کردنا، هەست بە سوورِ خواردن دەکەی ؟

– نە ء

– کە واتە باش ماچ نەکراوی. ((موستەنگیت ١٨٧٥-١٩٥٦))

بۆ یەکێ لە کچە بچووکە ئەکتەرەکان ووتراوە.

❖ ئێمە نازانین پاشە ڕۆژ چیمان تووش دەبێ، ئاوڵە یا پارە.((بیتروالد دوفیرفیل ١٩٦٢))

❖ ئەو ژنانەی،مێردەکانیان بە جێیان هێشتوون هەست بە خۆشی دەکەن، ئەگەر هەندێ شت دەربارەیان بزانن. ((ئوسکار وایلد))

❖ ئەو کاتەی ئافرەت خۆی دەداتە دەستەوە،زۆر جاریش لەوێدا شتێك وەردەگرێ. ((ئەندریە ترای ١٩٥٣))

❖ ئەو کەسانەی کە بە پەلەن، هەرگیز بە تەواوی لە دایك نەبوون.

((ووتەیەکی ئینگلیزیە))

❖ ئێمەی پیاو، کاتێ بەختیار دەبین،هۆیەکی تایبەتی هەیە،بەلاّم ئێوەی ئافرەت،ئەگەر بەختیار بوون،ئەو بەختیارییەتان،هۆی پیاوە.

((فەرەنسیس دوکرواسیە ١٩٥٢))

❖ ئەو مەنجەڵەی، غل بێتەوە، سەرقاپەکەی دەدۆزێتەوە.

((ووتەیەکی فەرەنسی یە))

❖ ئەو کەسەی دڵدارێکی هەبێ لەوە خۆشترە نی یە،بەلاّم خۆشتر ئەوەیە لە دڵداری یەکەم ڕزگاری بێت. ((ولیام وشرلی ١٦٤٠–١٧١٦))

❖ ئەو جەورەی سوودمانی تێدایە،دەڵێن بەختە،ئەو جەورەی غەیری خۆمان سوودی لێ دەبینێ پێی دەڵێن ناوزڕان. ((ئەلفرید کابۆ ١٩١٣))

❖ دەرمانخانە،تاجری هیوایە، بۆ ئەوانەی نەخۆشن بێ فەرق و جوودایی.

((ئەریە بریفۆ ١٩٤٧))

❖ ئەو پیاوەی لە تاوانێك بەرەڵلاّ دەگرێ،ئەوە لە پیاوێك زیاتر شەریفە ؟

بەر بوون

((شەرەف)) و پاکێتی زیاتر دەکا. ((جۆرج بیرو لویس فرنۆی ١٩٢٦))

❖ ئەم بیرو باوەڕە لە بەر بکە،مەسلەحەتی تاوانبار پیرۆزە،مەسلەحەتی کۆمەڵ دوو جار پیرۆزە،مەسلەحەتی داد پەروەری سێ جار پیرۆزە.((ئەناتولّ فرانس ١٨٩٧))

❖ ئێمە هەمیشە لە پێش یەکێ ترەوەین. ((فران نوهان ١٩٢٩))

❖ ئەو پیاوەی دوو چاری نەخووشی دلّداری بووە، لە ڕاوچییەوە دەبێتە نێچیر. ((ئۆسکار فۆریل ١٩٠٧))

❖ ئەوە بەڵگەی دڵدارییە، ئەگەر ژن و مێر توانییان باری یەکتری هەڵگرن.

((ناتالی کلیفۆرد بارنی))

❖ ئەم پیاوە ئەوەندە زیرەکە،بە کەڵك هیچ شتێك نەماوە لە جیهاندا بیکا.

((ح٠ش٠لشتنبەك))

❖ ئەگەر ویستت نهێنی ئافرەتێك بزانی،لە لای ئافرەتێکی کە بە باشی باسی بکە.

((م٠ع))

❖ ئەو کاتەی ژنێکت هەیە،واتە تۆ، هی ئەو ژنەی.

((گاڤارنی ١٨٠٤-١٨٦٦))

❖ ئایی،هیچ کاتێ جنیو بە ژنێکی کەوتو مەدە،کێ دەزانێ ئەو هەژارە،لە ژێر چی بارێکدایە.

((فیکتۆر هۆگۆ))

❖ ئەو ژنانەم خۆش دەوێ، قسە ناکەن داواکارییان زۆر نی یە.

((بروسبیر میریمیە ١٨٢٥))

❖ ئەگەر ناتەوێ بخۆی بۆ ئەوەی بژی،هیچ نەبێ بخۆ بۆ ئەوەی من بژیم

((لە بەردەمی یەکێ لە چێشتخانەکانی لشبۆنە نووسراوە))

❖ ئای،بریا پیاو بیتوانایە بە تەنها بۆ (مانگی هەنگوین برۆیشتایە).

((جۆلّ روونار))

❖ ئازا،کەمجار دەربەستی ژیانێتی،کەمتریش دەربەستی کەسانی کەیە.

((ئەدریان دیکورسیل))

❖ ئەو پیاوەی لە گەڵ ژنەکەیدا کاری خۆشەویستی کرد بە قەمچی لێی دا،ئەوە باوەڕی فەلاحێکی دڵ ڕەقە.

((مارسیل ئەشار ١٩٥٢))

❖ ئەگەر بێزار بوویت،دان بە مافی خۆتا بنێ.

((ئەلکۆنتیس دیان ١٨٩٨))

❖ ئەو كەسی دڵ نیا بێ، با هەورە تریشقەش بێ دەنوێ.

❖ ئەو كەسە نامۆیە،كە خۆشەویستی نی یە.

❖ ئەگەر سەرسام بین لە هەندێك،چۆن هاوڕێی ژیانی هەڵبژاردووە ئا ئەوانە خۆیان هەڵیان نەبژاردووە. ((ناتالی كلیفۆرد بارنی ))

❖ ئەگەر پیاو بیزانایە،ژیان كاتی دەس بەتاڵی چۆن دەبەنە سەر،قەت ژنیان نە دەهێنا. ((ئۆ٠٠ هنری)) ١٨٦٢ — ١٩١٠

❖ ئەگەر ژنەكەت ڕۆژێك زۆر بێزاری بەرامبەرت دەربڕی، بۆ دادگا ببیە لە وێدا هەموو شتێك دەبینی.

❖ ئەوە هونەرمەندێكی گەورەیە،چونكە خەڵكی بە درۆكانی بڕوا دەكەن.

❖ ئەگەر ئافرەتێك پێتی ووت، لە خۆشەویستیدا دەمرم بۆ لێی ناگەڕێی تاكو بمرێ.

❖ ئەگەر شەیتان دەس بە خۆشەویستی بكات، لە خراپە دوور دەكەوێتەوە.

❖ ئەگەر ویستت سەربەستی لە پیاوێك وەرگریتەوە ژنێكی دەوڵەمەندو جوانی بدەرێ.

❖ ئەگەر دووبەركی ڕووی دا لە نێوان ژن و مێرد دا،دەبێ مێرد چی بكات ؟

❖ ئەگەر دونیا بۆت پێكەنی،ناخۆشیێكانت لە یاد نەچێ.

❖ ئەی ژن تۆ خەونی شەو و ئازاری ڕۆژمی. ((ئەلفرید دی مۆسێیە))

❖ ئەگەر كەری پێشكەوت ژیری دەگەڕێتەوە.

❖ ئەگەر برادەرێكی دڵسۆزت دۆزییەوە،واتە گەنجینەیەكت دۆزیوەتەوە.

❖ ئەوەی دوو چاری ناخۆشی نەبوو بێ،ڕێزی خۆشی ناگری. ((تورك))

❖ ئەی ژن،وەكو ئەوەی بڵێی پێش تۆزێك ناز بكەیت و بڵێت من لە پیاو جوانترم، بەڵێ تۆ لە پیاو جوانتری لە چاوی پیاودا بەلآم لە چاوی خوشكەكەتا،ناشرینترین پیاو لە

تۆ جوانترەو بۆ ئەو خۆشەویسترە،ئەگەر پەیكەری گوڵ بیت لە جوانیدا پەری بەهەشت بێت لە لاویدا. ((عەباس مەحمود ئەلعەقاد))

❖ ئەی ژن، دڵت لەو پیاوە چەكەرە بكات كە دڵی لە تۆ زیاتر كەسی خۆش ناوی. ((تالێری))

❖ ئەوەی واز لە ژن بێنێ،وازی لە خەفەت هێناوە. ((لوقمان ئەلحەكیم))

❖ ئەگەر بە ژن بوترێ لە ئاسمان شایيە،هەلدەسن و پەیژەی بۆ بەرز دەكەنەوە. ((عەرەب))

❖ ئەوین وەكو هەورە تریشقە وایە، هەموو كات بە سەرتا نادات.

((ئابیل ئەرمان ١٨٦٢–١٩٥٠))

❖ ئەگەر ویستت بە درۆزنت دابنێن، هەمیشە ڕاستی بڵێ.

((لۆگان.ب.سمیس))

❖ ئەمە چێشتخانەی ((والدرۆف ئەستۆریا))نی یە،بەلآم ئەگەر چێشتخانەی ((والدرۆف ئەستۆریا)) ببوایە، تۆ لێرە نە دەبووی. ((والدرۆف ئەستۆریا)) ((چاكترین ئوتێلی نیویۆرك–ە)).

❖ ئەو كەسەی ژنێكی تەمەن كەم (مندال) بهێنێ،شەیتان پێدەكەنێ.

((ئەڵمانی))

❖ ئەو كەسەی ژنێكی دەوڵەمەند – بخوازێ، سەربەستی خۆی فرۆشتووە.

((ئەڵمانی))

❖ ئەو كەسەی بە ڕاستی ژنەكەی خۆش ویست لەماڵەوە بە جێی دێڵێت.

((ئەڵمانی))

❖ ئەگەر شەیتان نەیتوانی بڕواتە جێگایەك، ژن دەنێرێ. ((صینی))

❖ ئەگەر ویستت شتێك بڵاو بێتەوە، بە ژنەكەت بڵێ. ((ئەستۆنی))

❖ ئەگەر بە قسەی دایكت نەكەی، بە قسەی باوەژنت((ئەڵمانی))

❖ ئەو نهێنیەی كە ژن بڵاوی ناكاتەوە، ئەو نهێنییە كە نایزانێ.

((سربی))

❖ ئەگەر ویستت تەمەنی ژن بزانی. لە هاوڕێكەی بپرسە. ((ئینگلیز))

❖ ئەو پیاوەی هەموو شتێك بە ژنەكەی بڵێ، هێشتاكە تازە ژنی هێناوە.

((ئینگلیز))

❖ ئەگەر لە پیاو تێگەیشتی. ژن بخوێنە. ((فەرەنسی))

❖ ئەمانە چی دەربارەی ژن دەڵێن :

وێنەگر — دەم،چاوێكی هەیە وەك فریشتە وایە.

كارەباچی — تیشكەكەی وەكو تیشكی خۆر وایە.

بەقاڵ — وەكو شكر شرینە.

میوە فرۆش — گۆنای وەكو سێوە.

زێڕەنگەر — وەكو دووڕ وایە وێنەی نی یە.

مۆسیقا ژەن — دەنگی لە ئاوازی تار خۆشترە.

زانا ((عالم)) — ئەوە توێشی ژیرییە.

دەوڵەمەند — جوانێكەی گەنجینەیەكە تەواو نابێ.

تاجیر — جوانترین كەل و پەلە، ئاسمان ناردوویەتی.

دوكتۆر دان — لە باتی مرواری پێدەكەنێ.

سەرتاش — پرچێكی زۆری هەیە.

❖ ئیش كردن،خوشكی خەون نی یە. ((بۆدلێر ١٨٧٥))

❖ ئەوەی ڕێگای دوور دەبڕێ بۆ ژنێك، یا هەڵخەڵەتاوە،یا هەڵدەخەڵەتێنێ.

❖ ئەگەر هەموو گیرو گرفتەکانمان بە یەکەوە کۆبکەینەوە، هەر یەکە لە ئێمە ڕازی بێ بەشێك لەو گیرو گرفتە بگرێتە ئەستۆ،هەموو خەڵك گیرو گرفتە تایبەتییەکانی خۆی قەبوڵ دەکرد. ((سوقرات))

❖ ئەوەی کە من دەیزانم، ئەوەیە کە هیچ نازانم. ((سوقرات))

❖ ئەوەی نووسیومە،بیخوێنەرەوە،ئەگەر پەرەگرافێکی زۆر بە دڵت بوو ئەوا بیسڕەوە. ((سموئیل))

❖ ئیرلەندە تەنها گەورەیی قەشەکان و لە خۆ بایی ژنان دشکێنێ.

((ئیرلەندی))

❖ ئارەقم خواردەوە بۆ ئەوەی لە یادم بڕوا و وێنەکەت نەبینم، بەڵام بە داخەوە،کە سەرخۆش بووم دوو جار تۆم دەبینی. ((مارسیل ئەشار))

## - ئا -

❖ ئا لێرەدا ژنەكەم درێژ بووە ((مردووە)) لێگەڕێ با درێژ بێت، چونكە حەساوەتەو،هەر وا منیش حەساومەتەوە. ((ئینگلیز))

❖ ئافرەت ،قامیشێكی خەوتووە. ((ئان ماری كاریێر ١٩٦٢))

❖ ئافرەت ئاگر دانێكە، سەرەوەی لە مەڕ مەڕە. ((ووتەیەكی ڕوسییە))

❖ ئافرەت ئەو پیاوەی خۆش دەوێ كە زاڵ دەبێ بە سەریا،بە بێ ئەوەی هیچ لەو پیاوە تێ بگات،زاڵ نابێ بە سەریا. ((مارسیل بریفۆ))

❖ ئا، ئەوەتا من دەبینن،ئەگەر لە من ویسترا پیاوێكم خۆش بوێ،نەك ((دوكامبری)) مێردم،وەكو ئەوە وایە بە زۆر پەنجا دارم لێدەن،حەزیش دەكەم پەنجا داری كەشم لێدرێ لە بەر خۆشی.٠ ئەمەیە بیرو باوەڕم. ((هەنری میلاك ١٨٦٩))

❖ ئازاری دڕكێك،بۆنی هەزار گوڵ لە یادی مرۆڤ دەباتەوە..

❖ ئافرەتی خراپ، ئەو ئافرەتەیە كە خۆشمان ناوێ،بەلاّم بە تەواوی لە بەردەمیانا ڕووت دەبێتەوە. ((جۆڵ ڕۆنار ١٨٩٧))

❖ ئافرەت، ئەو كاتەی نەفەسی دەبڕێ، كە لە سەر پشتی پاڵ دەكەوێ.

((ڕوسی))

❖ ئافرەت سستەرە،بە پیشەیی،هیچ كەسێك ڕای ناكێشێ بە لای خۆیدا، ئەگەر دڵی بریندار نەبێ.

❖ ئارەق خۆرەوە،لە تەنگ و چەڵەمەیەكەوە ڕا دەكات بۆ تەنگ و چەڵەمەیەكی تر. ((م٠ع))

## - ب -

❖ بێ ئەقڵەکان، ژیرن لە کار و باری ئافرەت دا.

❖ بەرد، ڕێگەی بێ دەسەڵاتەکان دەگرێ،بەڵام بە هێزەکان پاڵی پێوە دەدەن. ((مستەفا کامیل))

❖ بڕوام وایە،مەسەلەکە لەکۆتایی دا،دڵدارییە،چونکە هەر کاتێ بیرەوەری خۆشەویستییەك بکەمەوە ئەو بیرەوەرییە بە سەرما زاڵ دەبێ. ((فلادمیر))

❖ بە قوومار کردن،توانیم شەبقەیەك وەکو پاپۆڕەوانەکان بکرم،بەڵام ئەوەی دۆڕانم دەمتوانی پاپۆڕێکی پێ بکرم. ((ترستیان بریار))

❖ بۆ بەد بەختی،پێویستە بمری، تا کو بژی. ((مارسیل ئاشار ١٩٣٨))

❖ بۆچی،چەنە بازی ژن دەوەستێ، کە وەکو وتراوە دەڵێی چەنە بازی بیبیمەتووە،ئەو کاتەی پیاوێکی لێ نزیك دەبێتەوە. ((جورج کۆرێلین))

❖ بێ دەنگی یەك شتە،کە ژنان ڕقیان لێیەتی. ((ماری ویلسۆن لیتل))

❖ بە ڕاستی بەزەیمان بەو ئافرەتەدا دێتەوە،ئەو کاتەی چاوەڕوانی یەکێك دەکاو نازانێ کێیە. ((ڕابەری دڵداری))

❖ بە جۆرەی ئەوە کە ڕاستت لێ دەوێ درۆزن ڕوو بە ڕووی درۆزن دەبێتەوە ئەمەش یاری کردن نی یە،بەڵکو پێشبڕکێ یەکی شەریفانە نی یە.

((ئاتییس رای ١٩٢٥))

❖ بەرد لە ژن مەگرە، ئەگەر ئەو بەردە،بەردێکی گران بەها نەبوو.

((ئامینا دۆ ١٩٣٩))

❖ بۆنی ژن، خواردن نادا، بەڵام دڵ ڕەقی لە یاد ناچێ.

((نموونەیەکی ڕۆژ هەڵاتیە))

❖ با پیاو نموونەی ئاش جێ بەجێ بکا، وەکو لادییەکان دەڵێن :ئەگەر لەم ئاشە نەتوانێ باراش بهاڕێ،بڕۆ ئاشێکی کە. ((جاك تاهورو ١٥٦٥))

❖ بەخشندە ئەو کەسەیە،ئەگەر بەڵێنی دا،جێ بەجێی دەکات،ئەگەر دەستی ڕۆیشت لێی دەبورێ.

❖ بەچاو بەستراوی زۆر باش خۆشەویستی دەکەین،ئیتر کردنەوەی سووری چی یە. ((ئەدولف دە دیتۆ ساڵی ١٩٨٥٣))

❖ بۆ هەر جێگایەك دەڕۆی، ژن لە گەڵ خۆتا بەرە. ((ئیرلەندی))

❖ بیست ساڵ سەرکەشی ژن، دەیکاتە پارچە پارچە،بیست ساڵیش بە شوو کردن،وای لێ دەکات جۆرێك بێ لە بەرز بوونەوە. ((ئۆسکار وایلد))

❖ بێوە ژن، شورە (سیاج)یەکی نزمە،هەموو کەس بە سەریا باز دەدا. ((ئەڵمانی))

❖ باشترین شت کە پیاو هەیبێت ژنێکی چاکە، خراپترین شت کە پیاو هەیبێت ژنێکی خراپە. ((ئەڵمانی))

❖ بەڵێنی ژن، لە سەر ڕووی ئاو دەنووسرێت. ((یۆنانی))

❖ باوەڕ بە ژنی بێ دەنگ و سەگێ زۆر بوەڕێ مەکە.

❖ باوەڕ بە سەگی نووستو مەکە، بە جولەکەیە کە سوێند دەخواو ئەو سەرخۆشەی نوێژ دەکا و ئەو ژنەی دەگری. ((پۆڵەندی))

❖ باوەڕت بە ژنەکەت هەبێ،مادام دایکت چاو دێری دەکا. ((یابانی))

❖ بتهۆڤن دەڵێ : ئەی ژن،من هەست بە جوانی سروشت ناکەم، تەنها ئەو کاتە نەبێ کە دەس لە گوڵەکانی دەدەی بە پەنجە جوانەکانت.

❖ بێوەژنی دەوڵەمەند، بەچاوێك دەگری،بەوی تریان خۆشحاڵ دەبێ.

❖ بەختیاری لە گوێی ئاگردانا،پەرە دەستێنێ،نەك لە باخچەی نامۆیان دەبچڕدرێ.

((جیرۆڵد))

❖ بەرگری کردن درۆیەکی هونەری یە.

❖ برادەر، ئەو پیاوەیە هەمیشە، جێی باوەڕمانە و ئێمەش جێی باوەڕی ئەوین. ((فەرەنسۆی بێربیە))

❖ بە خراپە باسی برادەرەکانم مەکەن، منیش وەکو دەتوانم.

((شاشاگێتری))

❖ باکەش بین،بین،چونکە پزیشکایەتی ئەوەندەی دەرمان دۆزیوەتەوە لە نەخۆش زیاتر. ((ئەلفرید کابۆ))

❖ بە درێژایی ئەو تەمەنەی کە دۆستم هەبوو،خیانەتی مێردەکەمم قبوڵ دەکرد. ((مارسیل ئوکلێر ١٩٧٥))

❖ بۆ دلداری،ئاگات لە دەم و چاوت بێ، بۆ ئەوەی ئاگات لە دەم و چاوت بێ،دلداری بکە. ((دوکتۆر جولیان بیزانسۆن ١٩٤٩))

❖ با هەر ناسراوێك بێ، هەر ژنێك بێ، لە بریتی هەر شتێکی جوان دا بێت لە جیهاندا،بەلام هەموو شەوێك هەبێ. ((هەنری مونتولان ١٩٣٨))

❖ برادەری مەگۆڕە، بە زێریش بی.

❖ بە جۆرەی ژن،ماچ،کۆتایی هەوڵە بە جۆرەی پیاویش هەولی کۆتاییە.

((هێلێن ڕۆلاند))

❖ بڕوام وا بوو وێنەی خاچ درووست دەکەم،چاوی خۆم دەرهێنا.

((ئەسپانی))

❖ بمرە چی پێویست لە سەر ئێمەیە ؟! ((نووسینێکی ئەمەریکاییە پڕوپاگەندەیە لەکاتی ناشتنی مردوو دا))

- بۆ پیاوی ئازا،کات نی یە. ((بۆدوان دوبێنێ ١٨٢٣))
- بە هەڵەدا مەچووین ئەگەر بڵێین ژن نیوەی پیاوە، چونکە پیاوی ژندار تەنها نیوە پیاوە. ((ڕۆمان ڕۆلآن ١٨٦٦-١٩٤٤))

## - پ -

❖ پزیشك،نەخۆشی چاك دەکاتەوە، بەلآم نەخۆشەکە دەکوژێ.

((فەرەنسیس بایکون ١٩٥٧))

❖ پێویستە سەیری سامان، لە سەرەوە بکەین،بەلآم نابێ هەرگیز لە بەر چاوماندا ون بێ ((ئەندریە ریفو ١٩٥٧))

❖ پیاوی دڵ گەورە،ئەگەر پارەشی نەمێنێ،شتێك ڕوو دەدا،ئەوەش ئەوەیە خۆی دەمێنێ،وەکو هەزار پێ وایە،هەرچەندە چەندێ لە پێکانی نەمێنێ.

((شوشویهمو))

❖ پەرەسێلکە، بەهار درووست ناکات. ((هەنری بوللیس))

❖ پاڵەوانی ڕاستی ئەو کەسەیە،لە جەژنێك لە جەژنەکان،ئەو کەسە بێت کە دەدات. ((بۆجۆڵ ١٨١٨))

❖ پێویستە مرۆڤـ یەکێك بێ،نەك هیچ نەبێ. ((ئەدوار هربۆ))

❖ پێم بڵێ بە چی پێ دەکەنی،پێت دەڵێم تۆ کێیت. ((مارسیك بانیۆڵ))

❖ پاش ئەوەی مرۆڤـ، بۆ شتێ دەگەڕێ، بەبێ ئەوەی دەستی کەوێ،وا ڕێ دەکەوێ،شتێك دەدۆزێتەوە کە بە دووایدا نەدەگەڕا. ((جیرۆم.ك.جیرۆم))

❖ پیاوێك،ژنانی زۆر خۆش ویستووە، لە بەر ئەوە هیچ لێیان نابورێ.

((جۆرج ئارمان ماسۆن))

❖ پێویستە وەکو ووتراوە، حەوت جار زمانت بجووڵێنی پێش قسە کردن،پاشان بێ دەنگ بیت. ((هەنری دۆرینییە ١٩٢٧))

❖ پارێزەر،بەرگری لە بێوەژن دەکات،کاتێك یەکەمیان مێردەکەی کوشتووە، دووەمیان کاتێ دایك و باوکی کوشتووە. ((لۆرفێك ئۆفۆلۆیل))

❖ پیاوان ژنان ڕاو دەنێن، ژنان ڕاو دەکەن.

((فیكتۆر هۆگۆ ١٨٠٢ –١٨٨٥))

❖ پارێزەرەكان،وەكو دوو دەمی مەقەست وان، یەك یەكتری نابڕن،بەلأم ئەو كەسە دەبڕن كە لە نێوانیانەوە دەڕوا. ((ئۆكستین برۆهان، كچە ئەكتەرێكە))

❖ پێویستە وەك چۆلەكە سووك بێ، نەك وەكو پەر. ((پۆڵ فالێری ١٩٣٠))

❖ پیاو بە بێ ژن.. سەرێكی بێ لەشە، ژنیش بە بێ پیاو لەشێكی بێ سەرە. ((ئەڵمانی))

❖ پیاو دەتوانێ ژن لە پیاو بپارێزێ.. تەنها لە خۆی نەبێ. ((صینی))

❖ پیاوێك ژنێكی دەم و چاو ناشیرینی خواست، بۆ ڕۆژی دووەم بووكە بە مێردەكەی ووت:

– دەتەوێ خۆم بە كێ پیشان دەم، خۆم بە كێ پیشان نەدەم ؟

– مێردەكەی ووتی :تۆ سەر بەستیت خۆت بە هەموو خەڵكی پیشان دەی تەنها بە من نەبێ.

❖ پاكی پیاو، مانوو بوونێتی. ((بتونیوس))

❖ پیاوی ژندار ئەو كاتە سەربەستە كە بە تەنها لە سەر جێگاكەی دەنوێ.

❖ پیاوی هەڵخەڵەتاو لە ماڵەكەیدا، وەكو ئەو كەسەیە حوكمی سێدارەی بە سەرا بدرێ.

❖ پیاو لە ژن هێنانی یەكەمدا،ژن هێنانێكی چاك نابێ،پێویستە دووبارەی بكاتەوە.

((ئەلفرید كابۆ))

❖ پیاو لە سروشتەوە، كلیلێكی دەست كەوتووە، هەر بیست و چوار سەعات ژنەكەی هەڵدەگرێ. ((فیكتۆر هۆگر))

## - ج -

❖ جێگای نووستن،باشترین جێگایە بۆ بەیەك گەیشتن.((ئەلسەر تۆماس فرێری ١٥٨١-١٦٣١))

❖ جوان ترین کچ لە جیهاندا،ناتوانێ،ئەوەی ونی کردووە بتداتێ. ((ئارمان سیلفستەر))

❖ جوانترین کراس،لە بەر دەکرێ،بۆ ئەوەی دابکەنرێت. ((جان کۆکتۆ))

❖ جۆری دڵداری، وەکو جۆری کارچکە، نازنین لە جۆرە باشەکانن یا ژاراوییە،ئەو کاتە دەزانین کە کات بە سەر چووە. ((تریستان بەرنار))

❖ جوانترین کچی جیهان، ناتوانێ لەوەی زیاتر هەیەتی بتداتێ، ئەوەشی داوە. ((ئاتیین ڕای ١٩٢٥))

❖ جیهان هەمووی بەختەوەر نابێ،تەنها ئەو کاتە نەبێ کە خەڵکی لە خۆشەویستی خۆی بگەرێ بۆ خۆشەویستی خەڵکی کە. ((تۆڵستۆی))

❖ جنێوو ناتوورە، هیچ زەرەرت پێ ناگەیەنێ،بەڵام کاتێ مێشکی پێوە خەریك دەکەی زەرەرت پێ دەگەیەنێ. ((کۆنفۆشیۆس))

❖ جێگا،شتێکی جوانە، ئەگەر تێی دا نەنوین، تێی دا دەحەسێنەوە. ((ب.ج. لۆرۆ ١٩٧٨٦))

❖ جێگا،ژەن پارچە کەلوپەلێکە، لە ناویا دەحەسێنەوە بە تەنهایی، بەڵام ئەگەر دوو کەس بێن ماندوو دەبین. ((ئەندریە بریفۆ ١٩٤٧))

❖ جوادایی لە نێوان خزمەکارو گەورەکەیدا،ئەگەر یەك جۆرە جگەرە بکێشن،تەنها ئەوەیە یەکێکیان پارە دەدەن. ((روبرت فروست))

❖ جوانی ئاسمان بە ئەستێرەوەیە، جوانی ژنیش بە پرچەوەیە. ((ئیتاڵی))

❖ جارێکی تر باوك و دایك نادۆزیتەوە.. بەلاّم ژنان بە ئارەزووی خۆت دەدۆزیتەوە. ((ڕۆمانی))

❖ جارو بار ئاسمان لە کونی دەرزییەوە دەبینرێ.

## - چ -

❖ چاودێری کچ، ئاسانترە لە هی ژن. ((پۆڵەندی))

❖ چەکی ژن،زمانێتی، چۆن دەیەڵێ ژەنگ بگرێ، لە بەر ئەوەی کە بە کاری نەهێنێ. ((فەرەنسی))

چاك وایە هەردەم ڕاستی بڵێی، تەنها ئەو کاتە نەبێ کە بە باشی درۆ نازانی.
((جیرۆم.ك. جیرۆم))

چەندە پارێزەر ئەو داوایە بە ڕاست دەزانێ، کاتی پارەکەی لە پێشەوە وەردەگرێ. ((باسکاڵ ١٦٧٠))

چەنە بازەکان، ڕاستییەکان لە بیرەوە دەردەکەن،بۆیە ئاوەکەیان بە هەموو لایەکدا بڵاو دەکەنەوە. ((جۆڵ رۆنار ١٩٠٣))

چەندە بەختەوەرم کە پیاو نیم،ئەگەر پیاو بوومایە ناچار دەبووم کە ژن بهێنم.
((مەدام دۆستاڵ ١٧٦٦–١٨١٧))

❖ چاکتر وایە مێردێکی هەڵخەڵەتاو بیت، نەك مێردێکی مردو.
((مۆلێیر ١٦٦٠))

❖ چاك وایە لەکردارێکی باش زۆر بین،نەك لە کردارێکی خراپ بە تەنها
((ترزیستان بەرنار))

❖ چەندم پێ خۆشە، خۆتم بدەیتێ،بەلآم بریا ئافرەت بتزانیایە چۆن خۆت ئامادە دەکرد. ((شارڵ شانستۆن))

❖ چاك وایە لە گەڵ هەمووانـدا هەڵە بکەیت، نەك بە تەنها زیرەك بێ.
((مارسیل ئەشار))

- د -

❖ دڵی ژن، بە قەد چاوی دە پیاو دەبینێ. ((سویدی))

❖ دایە شوو دەکەی.٠ یا ئەم محەلەبییە دەخۆی ؟ دایکی وتی : کوڕم خوات لێ ڕازی بێ.٠ من دانم هەیە تاکو محەلەبی بخۆم ! ((یەکێ بە گاڵتەوە بە دایکی دەڵێ))

❖ دایکی زیرەك، کچەکەی تەمەڵ دەکا.

❖ دەم و چاوێکی بە پێکەنین، باخچەیەکە لە ناوەڕاستی زستانا. ((دانیمارکی))

❖ دەس لە مل یەك دەکەین، ڕۆژێکیش لە یەکتری بێزار دەبین،ئەویش دڵدارییە. ((فیکتۆریان ساردو ١٨٣١- ١٩٠٨))

❖ دیاری بچکۆلانە برادەری بە هێز دەکات، دیاری گەورە خۆشەویستی گەورە دەکات. ((دیکولی))

❖ دەریا ماسی نارگرێ. ((تورك))

❖ دەوارێکی بێ ژن، وەکو ڕەبابەیەکی بێ تارە. ((ڕومانی))

❖ دبلۆماسی کان،هەموو شتێ دەخەنە ڕووە،تەنها هەڵ چوونی خۆیان نەبێ. ((فیکتۆر هۆگۆ))

❖ دانانی مۆسیقا، وەکو دڵداری وایە. ((ئاتیین رای ١٩١٤))

❖ دوور نی یە ژن کراسی ئاهەنگی سەما لە بەر بکات، بە بێ ئەوەی بزانێ سەما بکات، کراسی هەمەڕەنگە لە بەر بکا بە بێ ئەوەی تینو بێ مایۆ لە بەر بکا، بە بێ ئەوەی مەلەوانی بزانێ، ڕووت بێتەوە،بە بێ ئەوەی بزانێ دڵداری بکات،بەڵام کاتێ کراسی بووکێنی لە بەر دەکا،ئەو دەمە یەکسەر دەزانێ چۆن بە کاری دێنێ.

((گۆرانییەکی فەرەنسیە))

❖ دەس لە سەر دڵە، نەك دڵ لە سەر دەسە. ((جۆل جۆی))

❖ دوو ڕوویی پیس ترین دەردی کۆمەڵایەتییە،بەم شێوەیە دەڵێ،بەویش شێوەیەکی تر دەڵێت.

❖ دڕندەترین باوك،ئەوەیە کە مناڵەکانی بەرەڵلا دەکات.

❖ دڵداری پەیمانە، لە گەڵ ماندوو بوون. ((مەدام دی ليناس))

❖ دەتوانی مرۆڤێك لە نیشتمان ببچڕی،بەلاّم ناتوانی نیشتمانەکەی لە دڵیا دەرکەی.

❖ دەترسم ژنم هێنا،ببم بە پیاوێکی هەڵخەڵەتاو،چونکە ئەمساڵ پیاوی هەڵخەڵەتاو زۆر دەبینم. ((بۆمارشێە))

❖ لەوانە دەبوورم کە دژی ڕایەکەی منن،بەلاّم لە وانە نابوورم کە دژی ڕایەکەی خۆیانن. ((تاليران ١٨٥٤ –١٨٣٨ ))

❖ دڵداری بە بێ قوربانی، وەکو هەویر ترشە، بە بێ ئارد،ئەویش نانی لێ دروست ناکرێ.

❖ دڵداری واتە تەماشا کردنی دوو کەس بۆ یەك لا.

❖ دڵداری، لە لای ژن ڕۆمانێکە خۆی پاڵەوانێتی،لە لای پیاویش ڕۆمانێکە خۆی دانەرێتی.

❖ دڵداری، ئەو هەڵەیە یە کە پیاو دەیکات، ئەوەیە کە بە یەك ژن دا دەمرکێتەوە.

((پۆڵ جيرالّدی ١٩٥١))

❖ دڵی ژن وەکو ناوکی قۆخە، پڕ بە دەم قەپاڵ لەو قۆخە دەگرن و لە پڕێکا دانیان دەشکێ. ((جۆڵ روونار ١٨٩٨))

❖ دەتوانین تەمەنی بکەینە سێ بەشەوە :–

لە بەشی یەکەمدا،خەون بە دڵدارییەوە دەبینن، لە بەشی دووەمدا دڵداری دەکەن، لە بەشی سێهەمدا بۆی دەمرن. ((ئەنتوان ڕۆسان بروسبیر ١٨٢٩))

❖ دوو شت سوودیان نی یە، مانگە شەو لە زستانا و مندالّی هەژار.

((هیندی))

❖ دەتەویّ نهیّنی سەرکەوتنم بزانی لە گەلّ ژناندا ؟ ئەوەیە من هەلّسوکەوتم لە گەلّ کارە کەرەکاندا، وەکو شاژنەکانەو لە گەلّ شاژنەکاندا وەکو کارە کەرەکانە.

((برۆفیّلّ ١٧٧٨ –١٨٤٠))

❖ دزەکان،ڕیّزی سامان دەگرن،ئەوان ئارەزوویان نی یە،تەنها لە سامانی کەسانی تر نەبیّ و زیاتر ڕیّزی دەگرن. ((تشسترتۆن))

❖ دوور نی یە بە ئەدیبی گالّتە جاڕ،وەکو ((جۆلّ فیّر)) ووتراوە، دارۆچکەیەکی گولّە،گولّەکەی لە ژوورەوەیە و دڕکەکەی لە دەرەوەیە. ((رۆبیر ئەسکاربیّت ١٩٦٠))

## - ر -

❖ ڕۆژنامەگەری،پیشەیەکە، کە مرۆڤ نیوەی تەمەنی بە قسە دەباتە سەر کە لێی نازانێ، ئەو نیوەکەی کە دیزانێ، بێدەنگە. ((هەندی بیرۆ ١٨٨٥-١٩٥٨))

❖ ڕووتەوە بوون،کۆتایی لەشە. ((دانیال دارك،مەدام ماری ڕێنیە ١٨٨٣))

❖ ڕێگەم لە گاڵتەدا،ڕاستی ووتنە،ئەمەش باشترین گاڵتەیە لە جیهاندا. ((برنارد شۆ))

❖ ڕێکەوتینەوەو،دەسمان کردە مل یەکتری.لەو کاتەوە ئێمە دوژمنێکی تەواوین. ((لۆساج ١٨٠٩))

❖ روتشیڵدی دەوڵەمەند دەیووت :لە وێدا سێ ڕێگە هەیە بۆ وێران کردن،قومار،ژن،ئەندازیار،هەر دوو ڕێگەی یەکەم و دووەم : خۆشە،بەڵام ڕێگەی سێهەم پارێزراوە. ((ئۆگست دیتۆف))

❖ ڕێز گرتنی ژن، بەڵگەیە بۆ پیاوی ژیر. ((بیکۆ))

❖ ڕۆژان هەرگیز بە دوواوە ناڕوا. ((یابانی))

❖ ڕاڤە، زانست و خۆشییە. ((ئیتاڵی))

❖ ڕاستی،شەیتان شەرمەزار دەکات. ((شکسپیر ١٥٩٧))

❖ ڕاست گۆ، ڕێزی لێ گیراوە، درۆزن زەلیلەو نەفرەت لێ کراوە.

❖ ڕۆژ، زێڕی هەژارانە. ((کلیفۆرد بارنی ١٩١٠))

❖ ڕەزیل، دوور نی یە سامانێکی زۆر کۆبکاتەوە،بەڵام لێ گەڕێ با شتێك ڕوو بدات،دەبینی وەکو مشکێکی پلیشاوە لە نێوان شەقامەکاندا فڕێ دراوە.

❖ ڕاستی ناسووتێ، ئەگەر لە نێو ئاگریشا بێت. ((هیندی))

❖ ڕق و کینە، گرێکە لە دڵی ((حەسوود))دا دەسووتێ تاکو بە خۆڵەمێش دەبێ.

- ٥ -

❖ هێز، گەورە پیاوان دروست دەکات، بەڵام ئەوەی کە دروستیان دەکات مانەوەی هەستی گەورەیە. ((نیتشە))

❖ هەق، کردارو بە دڵ دەزانین. ((باسکاڵ))

❖ هەموو شتێك کۆتایی هەیە :-

- کۆتایی تاقی کردنەوە - ((امتحان)) - ئەنجامە.
- کۆتایی ئاسمان - بەتاڵییە.
- کۆتایی جیهان - کۆتاییە.
- کۆتایی مرۆڤـ - مردنە.
- کۆتایی گریان - حەسانەوەیە.
- کۆتایی چاندن - دوورینەوەیە.
- کۆتایی تاوان - سزادانە.

❖ هەموو ئافرەتێك، لە تاریکیدا، وەکو یەکن. ((ووتەیەکی کۆنە))

❖ هەر دەم بیر لە بەختیاری بکەمەوە، لە بەردەمما ژنێکی جوان دەوەستێ و هۆشی پیاوێکی هەیە. ((قاسم ئەمین))

❖ هەموو خەڵکی شێتن، یەکێك یاد لە ژن خواستن دەکاتەوە، ئەوی تریان بیر لە تەڵاق دان دەکاتەوە.

❖ هیچ کاتێ ژن لە وێنەی خۆی نادۆزێتەوە، تەنها ئەو کاتە نەبێ، کە دەیەوێ بڵێ ئەو وێنەیە لە خۆی دەکات. ((جان گێربالْ دومرگ))

❖ هیچ کەسێك سزا نادرێ، ئەگەر یەکێکی کوشت لە بەر پێکەنین.((ووتەیەکی ڕوسیە))

❖ هەموو کات پێویستە گرنگی بە زانینی تەندروستی بدەین، مرۆڤ لە نەخۆشی دەپارێزێ، مرۆڤ خۆی هۆیەکی نەبوو.

❖ هیچ جۆرە بۆنێک بە کار نەهێنە،ئەگەر بیری ئەفسوناویت نەبوو((وتەیەکی ئەسپانییە))

❖ هەموو ژنێك، سامانەکەی، لە نێو لنگێتی. ((بلزاك))

❖ هیچ ژنێکی نەزانمان نەدی، بە تایبەتی دەربارەی جوانی.((ج·ساینال دوبای ١٨١٣))

❖ هەر کە بە ئافرەتمان وت جوانی، باوەڕی وایە زیرەکیشە. ((جۆڵ ڕونار))

❖ هەموو پیاوێك، کوڕی ژنە. ((ڕوسییە))

❖ هیچ دارێك برنجی کولاّو ناگرێ.

❖ هەموو ڕاسییەك، هی ئەوە نییە گوێی لێ بگیرێ.((سۆزان برۆهان ١٨٠٧-١٨٨١))

❖ هەژاری عەیب نی یە، بەلاّم عەیب ئەوەیە کە تەماعی نەبێ. ((صینی))

❖ هەڵەکانی ئەوانی کە، زیاتر لە چاومانا پرشنگدار ترە. ((یۆنانی))

❖ هاوڕێتی مرواریییەکە، لە ناو دەریادا،بریسکەی ئەمکدارییە.

❖ هەواو بەخت و ژنان هەموو وەك مانگ دەگۆڕێن. ((فەرەنسی))

❖ هیچ شتێك وەکو دڵداری، بەش کردنی گران نی یە. ((ناتالی کلیفۆرد بارنی))

❖ هیوات بە ژنێك نەبێ لە ناو جێگادا و ئەسپێك لە ناو ئاودا. ((وتەیەکی ئەسپانی یە))

❖ هـــەموو جـــۆرە ڕەوشـــتێك،لە شـــەڕو دڵـــداری داچـــاکە((دگـــۆن فلیشەروفەرەنسیس بۆمۆنت ١٩٣٤))

❖ هەندێك بۆ ڕێز گرتنی مردووەکانیان، کراسی ڕەش لە بەر دەکەن، هەندێك مرواری و زێڕ هەڵدەگرن. ((گاستۆت ئەندریولی ١٩٥٣))

❖ هەندێ ژن هـەن، خیانـەتیان ئەوەیـە، کـە تـەنها پەیوەنـدیان بـە مێـردە کانیانەوەیە. ((ساشا گیتری ١٩٤٨))

❖ هونەری ترس ئەوەیە، ترست پێوە دیار نەبێ. ((بییر فیرۆن ١٨٦٢))

❖ هەر چەندە ژن چاك بێ، پێویستە چەورو گریس کرێ.

((ووتەیەکی ئیتاڵییە))

❖ هەر چەندە قەشە، هەژار بێت،ئەو هەمیشە سەرکەوتووە بە سەر زۆربـەی پیاودا، چونکە ژنی نی یە. ((هەنری دۆمونترلان))

❖ هـەر کەسـێ بێـوەژن بێنـێ، هـەمووکات سـەرێکی مـردوو لـە قاپەکەیـدا دەبینێ. ((ووتەیەکی ئەسپانییە))

❖ هیچ بەختەوەرێك وەکو ئەو نەبوو، وەکو ئەو پیـاوە دەڵـێ کـە خەسـووی مرد بوو لیستەی پارەی تەرمەکەیان هێنا بوو بۆی. ((جیرۆم کلابکا جیرۆم))

❖ هەژار،کێیە؟هەژار ئەو کەسەیە کە قایل نی یە بەوەی کە هەیەتی.

((ئۆجین ماریۆ ١٨٩٥))

❖ هەموو ئادەمیزاد ئەکتەرن،دوور نی یەچەندئەکتەرێك نەبێ.

((ساشاگێتری ١٨٨٥-١٨٩٥))

❖ هـاوڕێتی پیـاو دڵـداری ژنـەکانیان دەکـوژن، ئایـا چییان دەکـرد ئەگـەر ژنەکانیان ڕازی نەبوونایە؟ ((دیلۆلی))

## - و -

❖ وەكو لە دادگا بین وایە، ژنەكە دادپەروەرەو منیش پارێزەر، من وەستاوم، ئەویش دانیشتووە، من هەر دوو دەستم لە هەوادا بلاو دەكەمەوە و ئەویش هەر دوو دەستی خستۆتە سەر ڕوومەتی، من هاوار دەكەم و لە هاواریش ناوەستم، بەلام ئەو لە سەر خۆیە و لە خەوێكی خۆشیدا، چونكە من بەرگری ڕووداوێكی دۆڕاو دەكەم، من ژنێكم خۆش دەوێ، ئەویش منی خۆش ناوێ.

## - ژ -

❖ ژیان بە نرخە، بەلام مردن هەرزانە. ((جان دولان ١٩٠٠))

❖ ژن هێنان و مەعكەرۆنی، تەنها بە گەرمی خۆشە. ((ئیتالی))

❖ ژن ڕاڕایە تاكو مێردێك دەدۆزێتەوە، بەلام پیاو ڕاڕا نابێ لە دووای ژن هێنان نەبێ.

((برنارد شۆ))

❖ ژن هێنان، كردارێكی ژمێر یارییە، كۆی ژنێك دەرهێنانی پیاوێك.

((فەرەنسیس دوكرواسە))

❖ ژن یەكەمجار لە نێوان بالماندان، ڕۆژێك دێت لە سەر بالمان دەبن،پاشان لە سەر پشتمان ((ساشا گێتری))

❖ ژن هێنانی دووەم، زۆر جار كارێكی خراپە لە پاش مردن. ((دیكۆلی))

❖ ژن ئەوەی بۆی دەكرێنابینێ، تەنها ئەوە دەبینێ كە بۆ ئەو ناگرێ.

((جۆرج كۆرتلین ١٩٠٣))

❖ ژن، بە ڕاستی خەتەر نی یە، تەنها ئەو كاتە نەبێ كە یەك ژنمان خۆش بێ. ((پۆل جبرالدای ١٩٥١))

❖ ژن. بە سەر شەیتانا سەرکەوتووە. ((ئێرلەندی)) شەیتانی پیاوە.

((ئەڵمانی))

❖ ژن بە چاو داوا دەکاو،دەباو ڕق هەڵدەگرێ و دەکوژێ.

❖ ژن لە یەك دەمدا (٧٧)ڕای هەیە. ((ڕوسی))

❖ ژن و شووشە.٠ هەموو کات لە خەتەر دایە. ((ئەسپانی))

❖ ژن وەکـــو دادوەر وان،کـــەمجار بـــرادەری موخلیـــسیان هەیـــە.

((صینی))

❖ ژن، زۆر جار بە بێ هۆ شکات دەکات، بە قەست درۆ دەکات، بە دزییەوە پێدەکەنێ.

((ڕوسی))

❖ ژنی سەرباز، نە ژنە، نە بێوە ژنە. ((ڕوسی))

❖ ژنی، دەوڵەمەند، پێویستی بە مێرد هەیە. ((ئەلبانی))

❖ ژن، گوژاڵك دەخوا. ((هۆڵەندی))

❖ ژن، کلیلی پیاوە. ((ئەستونی))

❖ ژن و پرد.٠ هەمیشە پێویستیان هەیە بە چاك کردنەوە. ((ئینگلیزی))

❖ ژن، لە کاتی تەنگانەدا، لە پیاو قایم ترە. ((ئینگلیزی))

❖ ژن، کلیلی هەمووماڵێکە. ((ئینگلیزی))

❖ ژنی ناشیرین، نەخۆشییە بۆ گەدە، ژنی جوانیش سەر ئێشەیە.

((ئینگلیزی))

❖ ژنان فێری گریان دەبن.٠٠ بۆ ئەوەی درۆ بکەن. ((ڕۆمانی))

❖ ژنی چاو شین، لە پورتوگالدا.٠هەڵەی سروشتە. ((پورتوگالی))

❖ ژن، زەرەرێکی پێویستە. ((فەرەنسی))

❖ ژن و پارە پیاو ون دەکەن. ((فەرەنسی))

❖ ژن، بیر لە یادی ئەو پیاوە دەكاتەوە، كە ڕۆژێك بیخوازێ، پیاویش یاد لەو ژنە دەكاتەوە كە شووی پێ نەكردووە. ((بایگۆن))

❖ ژنی هەستاوی ووشەیەك دەیكوژێ، نەك گولەیەك. ((ئەمین سەلامە))

❖ ژنی ڕۆژ ئاوا :-

- فەرەنسی - دەم و چاوێكی گوڵی هەیە، هاوار دەكات و بانگ دەكات، دەمێكی زیندوو لێو داوا دەكات.

- ئینگلیزی - بالأیەكی بەرز، پڕە لە ژیان و توندو تۆڵی.

- ئەسپانی - چەپكە پرچێكی ڕەش و نەرم بە دەور ملێكی مەڕمەڕی ئەفسووناوی دا دێتە خوارێ.

- ئەمریكی - ڕومێكی سووك بە خۆشەویستی ژیان خۆش ڕابواردن تامەزرۆی دڵداری پیاو.

❖ ژن بەرگری دڵداری پیاو دەكا،پاشان قەدەغەی ڕاكردنی پیاوەكە دەكات. ((ئۆسكار وایڵد))

❖ ژن وەكو شۆربا وایە، نابێ بهێڵی ساردبێتەوە. ((جان ناتۆلی ١٩٤٥))

❖ ژن حەز لەوە دەكات كە گوێی لێ دەبێ، پیاویش حەز لەوە دەكات كە دەیبینێ.

((مارسێل ئاشار ١٩٥٥))

❖ ژن پێویستی بە شارەزایی و فێڵ هەیە، بۆ ئەوەی خەڵكی بسوتێنێ، بۆ ئەو شتە كە دەیداتێ. ((جان جاك ڕۆسۆ ١٧٦٢))

❖ ژنی لاواز، وەكو پارچە دەزوویەكە ((ئۆرلیان شۆڵ، ووتەیە دەربارەی سارە بەرنار))

❖ ژن، لە بیست ساڵیدا، بە ڕێگەی خۆیدا دەڕوا، لە بیست و پێنج ساڵدا گوێ دەگرێ، لە سی ساڵیدا، وەڵام دەداتەوە، لە سی و پێنج ساڵیدا، قسەت بۆ دەکات، لە چل ساڵیدا دەتگرێ، لە چل و پێنج ساڵیدا،قسەت دەفڕێنێ، لە پەنجا ساڵیدا،تەماشای هەڵەکانت دەکاو پەشیمانەو دەڕوا. ((دیگۆلی ١٩٥٢))

❖ ژنان باوەڕیان وایە، ئەگەر ڕاستی یان وت، وەکو ئەوەی ڕووت بن وایە.
((ئەمیل بۆنتیش ١٩١١))

❖ ژن، هەموو نی یە،بە جۆرەی ئەوە کە نیوەیە. ((جاك ئۆدبیرتی ١٩٤٧))

❖ ژن،تیمساحێکە،پێویستە فرمێسکەکەی، ووشك بکاتەوە. ((یەکێك))

❖ ژنان بە باشی درۆ دەکەن، لەو کاتەدا درۆ دەکەن، باوەڕیان وایە ڕاستی دەڵێن. ((هەنری درۆیینییە ١٩٢٧))

❖ ژنی ڕووت، بە زوویی ئەویندار دەبێ. ((پۆڵ ئێلوار ١٩٢٥))

❖ ژنی لاواز، وەکو تاڵە دەزوویەکی گرێدراوە.

❖ ژنەکان، چیان دەوێ ؟ ڕابواردن زۆر خۆشە لای پیاو، بەلاّم لە سەر ئێمە ئەوەندە ناکەوێتەوە.
((کچە ئەکتەر جان کۆسیم، ناسراوە بە گوسان ١٧١١– ١٧٦٧))

❖ ژنان دووای ئامۆژگاری خراپە ناکەن،بەڵکو لێی تێدەپەڕن.
((ئابیلێ ئارمان ١٨٦٢ – ١٩٥٠))

❖ ژنان لە گوێ دا پاکەن، لە هەموو ئەندامەکانی لەشیان زیاتر. ((مۆلێیر ١٦٦٣))

❖ ژن،ئەگەر ڕاستیان پێ بڵێ – دەڵێن ئەمە بێمەیاییە. ((ئەمیل بۆنتیش))

❖ ژنی دواین پاك، ڕۆژ بە ڕۆژ داوێن پاکتر دەبێ. ((جان ئانۆی ١٩٤٥))

❖ ژنی داوێن پاك، وەکو ئەو بانگ کردنانەیە،کە جێ بە جێ نەکراون.
((ئۆکستین برۆهان ١٨٢٤–١٨٩٣))

❖ ژنێك سنگی نەبوو وەکو جێگایەکی بێ سەرینە.

## - ی -

❖ یەكەم ڕۆژی كانوونی دووەم، ئەو ڕۆژەیە، كە ژن ڕابوردومانی لە بیر دەچێتەوە، ڕێزیش بۆ ساڵی تازە دەگەڕێتەوە. ((ساشا گێتری))

❖ یەك دڵدار، ئەوە خۆشەویستیە، دوو دڵدار ئەوە ئارەزووە، سێ دڵدار، بازرگانییەتە. ((ووتەیەكی فەرەنسییە))

❖ یەكە نهێنی، كە دەتوانین بە ژن بڵێین بە بێ ترس، ئەوەیە، كە بڵێین جوانی. ((شارل لۆمێل ١٨٣٣))

❖ یەك ژن، لە شارێكدا بە قەد سەد پیاو قرەباڵغی دەكات. ((پۆڵەندی))

❖ یەكێ لە ئەدەبییەكان دەڵێ : ئەی ژن ئەگەر نەتوانی ببیتە ئەستێرە لە ئاسمان. ببە مۆمێك لە ماڵەكەتا.

❖ یارمەتیم بدە، یارمەتی ئاسمان دەدەم.

((جان ریگۆ ١٨٩٧ – ١٩٢٩))

## - ك -

❖ كارێكی زۆر ئاسانە، ئەگەر من مێردم بە (بوار و بیر) نەكرد، لەوێدا دوو داماو دەبن،ئەگەر مێردەكەیش بە جێ هێشت، تەنها یەك داماو دەبێ.ئایا من مافی ئەوەم هەیە دوو دڵ بم؟

((كچە ئەكتەرێكی فەرەنسی))

❖ كاتێ پەرداخەم بەتاڵ بێ،دڵم پێی دەسووتێ، كاتێكیش پڕ بێ، من بەتاڵی دەكەم.

((راوول بۆنشۆن))

❖ كچ لە پازدە ساڵیدا پێ دەگات، پیاویش لە سی ساڵیدا ژیرە.

((فیلیب دوو دۆك))

❖ كۆمەڵ دوو چینی گەورەن، ئەو چینەی كە خواردنیان زۆرەو ئارەزووی خواردنیان نی یە، ئەو چینەكەی ئارەزووی زۆر خواردنیان هەیە، بەلأم خواردنیان نیە.

((شامفور))

❖ كاتێ ئافرەت دەگری، نازانین سوود بەخشە یا زەرەو مەندە.

((ئایین ڕای ١٩٠٩))

❖ كاتێ فلأن كەس لە گەڵ ڕاكەی مندا نی یە، من دڵم پێی دەسووتێ، كاتێكیش لە گەڵ ڕاكەمدایە ئەو تووشی ڕاڕایم دەكا.

((ئۆرییان شۆڵ))

❖ كەمجار ژن هێنان ئەقڵە، بەلأم تەلأق دانە هەمیشە تەلأقی ئەقڵە، چونكە ژن و مێرد یەكتری باشتر دەناسن.

❖ كاتێ پزیشك دەڕوواتە ماڵێك،نیشانەی خاچ درووست دەكاو پاشان سەر هەڵدەبڕی و دایدەگرێتەوە بەلای ڕاست و چەپدا تەماشا دەكات بزانێ خاوەن ماڵ دەوڵەمەندە.

((ئەلبێرت كاریگ))

❖ كام ئافرەتەی زۆر ئازایە، لە سەر جێگا خۆی دەداتە دەستەوە.

((ئاتیین رای ١٩١٤))

❖ كچێنی، چۆلەكەیەكی بێ كلكە، كاتێ كلكی بدەینێ دەفڕێ. ((بیرۆن))

❖ كاتێ قوومار دەكەم، وا هەست دەكەم، بیست دڵدارم هەیە.

((ئوتێروی جوان))

❖ كراسی دزراو، بۆ دزەكە نابێ. ((فەرەنسی))

❖ كوڕەكەم، كوڕمە، تاكو ژن دێنێ، كچەكەم كچمە بە درێژایی تەمەنی.

((ئوسكوتلەندی))

❖ كۆشی دایك. لە جێگای گوڵ سەمەلات ترە. ((ئەستۆنی))

❖ كاتێ شەراب كۆن دەبێ، تامی خۆش دەبێ،بەلاّم دڵداری كۆن، ترش دەبێ.

((جان ئانۆ ١٩٥٥))

❖ كاتێ دبلۆماسی دەڵێ ((بەڵێ)) واتە دەڵێ ((دوور نی یە)) كاتێك دەڵێ ((دوور نی یە)) واتە دەڵی ((نابێ)) كاتێكیش دەڵێ ((نابێ)) ئەوە((دبلۆماسی)) نیە. ((هـ.ل. نكن))

❖ كلك شتێكی زیادەیە، تەنها بۆ مەیموون بە كەڵكە بۆ پیاوی دەوڵەت زەرەرە.

((قسەیەكە فڕێ دراوە بۆ یەكێك لە سەر كردەكانی فەرەنسا و لەو ناوەش دا مرد))

❖ كاتێك، مرۆڤ پڵنگ دەكوژێ پێی دەوترێ ((وەرزش)) بەلاّم كاتێ پڵنگ مرۆڤ دەكوژێ پێی دەڵێن كێوی ((وەحشی)) برنارد شۆ ١٩٠٣))

❖ كاتێ شەرەفم بێزارم دەكات،لە سەری دادەنیشم((پادشا لویس ی یازدەهەم ١٤٢٣– ١٤٨٣))

❖ کاتێ پیاوێکی پیر کچێکی بچووك دەخوازێ پێویستە چاوەڕوانی هەموو شتێك بێ،بەڵام کاتێ ژنێکی پیر،لاوێك دەیخوازێ پێویستە چاوەڕوانی هیچ نەبێ ((گۆرانی بێژێکی فەرەنسی))

❖ کچ، لە شووشە ناسکترە. ((م٠ ع))

❖ کاتێ پیاوو ژن،یەکتری دەخوازن، دەبنە یەك کەس، بەڵام گرانترین شت ئەوەیە، کامیان یەکەمن. ((وتەیەکی ئینگلیزی یە))

❖ کاتێك پیاو ماندوو دەبێ لە درۆ کردنا بۆ ژن، پێویستە وا هەست بکات، کە گرنگێتی داوەتێ،ئەمەش وەکو ئەوە وایە کەجۆرە گوڵێکی پێشکەش بکەی ((ستیف باشتۆر ١٩٢٥))

❖ کای کۆن سووتانی زەحمەتە، کوژانەوەش زەحمەتترە. ((سرفانێس ١٦١٣))

## - گ -

❖ گەورە كچ، وەكو شیر وایە، ئەگەر مایەوە ترش دەبێ.

((جان بێیر دوكومان))

❖ گەورە كچان بە خۆ هەڵكێشان كۆتاییان دێت كە دەڵێن كچێنی خۆیان بە سەبرو ئارامەوە پاراسوە، وەكو ئەو كەسانەی كە تووشی نەخۆشییەكی هەمیشەیی بوون.

((لویس لاندرۆن ١٩١١))

❖ گەورە زۆرسوودمان پێ دەبەخشێ،ئەو كاتەی كە ئازارمان نادات.

((بۆمارشیە ١٧٧٥))

❖ گەرمی ژنی ئاسایی زۆر تەڕە. ((بلوتاوك))

❖ گوڵ زیاتر لە ژن ڕاسترن. ((ووتەیەكی ئیاڵی یە))

❖ گرنگ نی یە چۆن قەڵەم بە دەستەوە دەگرێت، گرنگ ئەوەیە چی دەنووسێ ((یابانی))

❖ گریانی موخلیس هەرچەندە درێژا بكێشێ، كاتێك دێت كە بۆدرە بە سەر هەر دوو ڕوومەتی دەخا. ((هانری دۆفرنۆی ١٩٢٠))

❖ گەڕان بە دووای ڕاستیدا، كەوتە ناو ئەو بیرەوە كە تێدایەتی.

((بۆمارشێیە))

❖ گەورە پیاوان، دوو جار دەمرن، جارێكیان وەكو پیاو، جارێكیان وەكو گەورە پیاوان ((جۆڵ فالێری ١٩٤١))

❖ گەیشتان بە ئافرەت خۆشە،بەلاّم بوونیان لە گەڵمانا ناخۆشە.

((ئەلبێر گینۆن١٨٦٣-١٩٢٣))

## - ل -

❖ لە ماڵی دەوڵەمەند، ئەسپ بگرەو لە ماڵی هەژار ژن. ((ئیاڵی))

❖ لە سەر ژن پێویستە، هەردەم لە تەنیشت ژنەوە بوەستێت،واتە یارمەتی بدەیَ.

❖ لە هەولێ دانمانا بۆ بەختیاری، ناڕەحەتی گەورە دەبینین، ئەو كاتەی كە ئەو بەختیاریە دەدۆزینەوە. ((ڕۆناڵد جۆرج))

❖ لە وێدا ژن هەیە، وەكو شانۆگەریی وایە، شایستەی دووبارە كردنەوەیە، دوو بارە كردنەوەی لە جاری ووەمدا،زیاتر خۆشی دەدەن. ((ئاتین ڕای))

❖ لە شەڕو دڵداری دا،لەش لە یەك دەكەویَ، هەر ئەوەشە ئامانج دەدات.

((مارشاڵ دۆمۆ نلۆك ١٥٠١– ١٥٧٧))

❖ لە دڵداری دا تەنها سامان مەرج نی یە، پێویستە بەڵگەی هەبیَ.

((جۆرج ئەرمان ماسۆن))

❖ لە دڵداری دا، لاوان نرخی ئیشەكانیان دەداو پیرەكان نرخی ئەوەیان دەدا كە نەیان دەكرد. ((بۆمارشیە))

❖ لە سەر مێرد پێویستە بە ژنەكەی بڵێ،ڕووت بەرەوە پاشان قسەی لێ دەكەین. ((نۆیلێ كوارد))

❖ لە جیهاندا خۆشەویستی نی یە وەكو خۆشەویستی ژنیَ شووی كرد بیَ، ئەمەش هیچ مێردێك هەستی پیَ ناكات و ڕێزی ناگریَ.

((ئۆسكار وایڵد ١٨٥٦– ١٩٠٠))

❖ لە وێدا سیَ شت هەیە ئافرەت دەتوانیَ دروستی بكا، شەبقە،زەلاتە،دوو رەركی ژن و مێردایەتی. ((مارك تۆین))

❖ لە وەتی دونیا،دونیایە،پیاو هەر جارێ شتێ چاك فێر دەبێ،بەلاّم ژن تەنها یەك شت فێر دەبێ، ئەویش ژنە. ((هەنری میلاك ١٨٣١ – ١٨٩٧))

❖ لە پیاو شتێك دەس دەکەوێ، لە ژن هەموو شتێك چاوەڕوانی دەکرێ.

((هەنری دورینییە))

❖ لە وێدا ئامۆژگاری خراپ هەیە، نابێ بە ژنی پاك بوترێ.

((ئەلفرید کابۆ ١٩٠٦))

❖ لە دڵداری دا،ژنان شکاتی ئەوە دەکەن کە کەمە نەك شکاتی زۆری.

((کیۆم بۆشییە ١٥٤٨))

❖ لە وێدا کچان دەتوانن خۆیان بفرۆشن، بەلاّم ناتوانن خۆیان بە دەستەوە بدەن.

((شامفوود))

❖ لە سەر ملێکی چرچ، مرواری دەگرێ. ((ووتەیەکی ئەڵمانیە))

❖ لەمەو دووا نە بۆ کچی ژیر، نە کچی بێ ئەقڵ، لە دڵی منا جێگەی نی یە،یەکەمیان زۆر کراسەکەی هەڵدەبڕێ و دووەمیان لە پاش بە سەر چوونی کات، هەڵی دەبڕێ. ((چەند دێڕە شعیری بیسییر مۆتان –ە))

❖ لە سوو خۆرێك دەستە سرێکم لێ وەر گرت،داوای دوو چەرچەفی لێ کردم.

((ئۆریلیان ئۆل))

❖ لاوازی هەندێك، وورگی هەندێك دروست دەکات.

((تیۆدۆر دۆبانفیل ١٨٢٣–١٨٩١))

❖ لە بگرەو بەردە، خوێن دەتەقێتەوە. ((جۆڵ رونار))

❖ لوقمان –ی حەکیم ئامۆژگاری کوڕەکەی کردو وتی :

– هیچ گەنجینەیەك، لە سامان باشتر نی یە.

– هیچ شتێك، لە ئەدەب بە سوود تر نی یە.

- هیچ دەرهاوسێیەکیش،لە هۆش باشتر نی یە.
- هەر کەسێك لێرە نەبو، لە مردنەوە نزیکە.
- هیچ شتێکیش، لە برادەر بە سوود تر نی یە.
- هیچ خراپەیەکیش، لە درۆ خراپتر نی یە.
- هیچ خوا پەرستییەك، لە بێ دەنگی باشتر نی یە.
- هیچ شتێکیش لە ڕەزیلی، ناشرینتر نی یە.

❖ لێبڕان مردنێکی کەمە.مردن، لێبڕانێکی هەمیشەییە.

((ئەلفۆنس ئاللیلە))

❖ لێرەدا سێ ڕا هەیە کەمن گرنگیان دەدەمێ، ڕات،ڕام،چاکترین ڕای.

((فردرێك دوو فیلانی))

❖ لە دڵی هەموو پیاوێکدا، بەرازێکی نووستو هەیە.

((قسەیە،دەدرێتە پاڵ شارڵ مونسلیە ١٨٢٥-١٨٨٨))

❖ لە دواییدا بۆم دەکەوت کە مرۆڤ و ئاژەڵ لە یەك دەکرێتەوە،گیرو گرفتی پارەیە. ((جۆڵ روونار ١٩٠٤))

❖ لۆکریس، قەیسەر،بۆمبیۆس،ئەنتۆنیۆس و ئەمانەو زۆر پیاوی تریش هەڵخەڵەتا بوون و دەیانزانی هەڵخەڵەتاون، بەلام هەراو هووڕایەکیان درووست نە دەکرد((مۆنتاین ١٥٨٨))

❖ لە سەر یەکێ لە تۆپەکانی پادشا لویس-ی چوار دەهەم ئەمە نووسرا بوو. ((ئەمە دووا ڕۆژی نووسینی پادشاکانە))

❖ لاوەکان،لە گەڵ هیواکانیانە دەژین و پیرەکانیش لەگەڵ بیرەوەریکانیانە((فەرەنسی))

❖ لە ژنی ڕیش دارو لە پیاوی بێ ڕیش بترسن.

❖ لە فەیلەسووفێك دەگێڕنەوە کە ژنێکی بینیوە خۆی هەڵواسی ((خنکاند))وە،بە دارێك،فەیلەسووفەکە وتی، کاشکی هەموو دارێك ئەم جۆرە میوەی بگرتایە.

## - م -

❖ ماچێك لە کاتی خۆیدا، زۆر دەس گوشینمان لێ دوور دەخاتەوە. ((ئیتاڵی))

❖ مێرد یەکەم منداڵە بۆ ژنەکەی. ((بنکین))

❖ ماڵ نی یە، ئەگەر ژن نەبێ. ((بۆلگاری))

❖ مرۆڤ لە دایك بووە، بۆ ئەوەی بژی، نەك ژیان لە خەڵکی تر قەدەغە بکات. ((باسترناك))

❖ مەیموون لاسایی مرۆڤ دەکاتەوە، بۆیە دەڵێن دەمو چاو کرژە.

((ئەمیل بۆنتیش ١٩١١))

❖ ماچی بە هێز، نێرراوی دڵە. ((ئەسپانی))

❖ ماچ ترزاووی گەرمایی دڵە، بەوەدا دەزانین ماڵمان چەندە خەتەرە.

((ئەرمان سیلفستەر ١٨٣٧- ١٨٧٤))

❖ مرۆڤ یەکجار لە دایك دەبێ و یەکجار دەمرێ، جا با ئەو مردنە بە سەر بەرزی بێ. ((م.ع))

❖ من گەورەیانم پێویستە دووایان کەوم((ئەم قسەیە بۆ لۆدرۆ رۆلان دەگەڕێتەوە ١٨٠١-١٨٧٤))

❖ مادام ماف لە لایەنی تۆیە، مەترسە،ئەگەر بە تەنها ڕوو بە ڕووی هەموو جیهان ببێتەوە. ((غاندی))

❖ مەرەکەبی پێنوسی نووسەر پیرۆزە، وەکو خوێنی شەهید.

((شکسپیر))

❖ من لێرە، وەکو لە ماڵی تۆدا بم وایە، بەڵام لە بیرت نەچێ، من لە ماڵی خومدام. ((جۆڵ روونار ١٩٠٣))

❖ مـن (کەرامـەتی) ژنـان دەپەرسـتم، بـەڵام بـۆ خۆشـی (کەرامـەت)،نـابێ ئافرەتەکان بە تەنها بخەون.
((گۆتە ١٧٩٤ — ١٨٣٢))

❖ مامان دەڵێ:منداڵ بە ئاسنتر دەردەچێ لە وەی بە ژوورەوە دەچێ.
((بیروالد دۆفرفێل ١٦١٢))

❖ مانگەکان بە جۆرەی دلدارەکان، وەکو ساڵان وایە :

❖ من ڕادەبوێرم، کەواتە خەو دەبینم،من ئازار دەچێژم کەواتە من هەم.
((ماری فالێر ١٨٩٩))

❖ مەرج نی یە پیاو گەورە بێ، تەنها کە پیاوە، ئەوە جوانەو بەسییەتی.
((ئەلفرید کابۆ ١٩٠٣))

مرۆڤـــ بێزار نابێ،ئەو کاتەی گیرو گرفتی هەبێ.
((ئەناتۆل فرانس ١٨٨١))

## - ن -

❖ ناودارێتی ئەوەیە لە لای ئەوانە ناسراو بی کە ناتناسن.

((شامفوور ١٧٤٠ — ١٧٩٤))

❖ نوێژکردن، کورت دەکەینەوە زۆر جار بەم جۆرە، هەر کەس بۆ خۆیەتی و خواش هی هەموومانە. ((ئەدریان دیکورسیل ١٨٦٨))

❖ ناتوانرێ، لە دارێکەوە بۆ دارێك باز بدرێ،بەڵام لە پیاوێکەوە بۆ پیاوێك دەتوانرێ.

((ووتەیەکی ئەفریقییە))

❖ ناودارێتی باش، هەڵدەستێ بە جێی کراس. ((ووتەیەکی ڕوسییە))

❖ نەمانی چاوم لە مانی چاترە، چونکە بە مانی تووشی ئازار دەبم.

((هیندی))

❖ نەزان، منداڵە، ئەگەر چی پیریش بێ.

❖ نابێ هیچ کەس بە باشی باسی خۆی بکات، پێویستە ئەوە چاپ بکات.

((گۆڵ فالیس ١٨٣٢— ١٨٨٥))

## - س -

❖ سێ جۆر پیاو لە ژن ناگەن، لاو، پیر، بە ساڵا چوو.

❖ سێ شت لە ماڵدا نەفرەت لێ کراون، کەمی، دووکەڵ، ژنی خراپ.

❖ سەربەستی دان... تەنانەت ژنی چاکیش تێك دەدات.

❖ سروشت بە ژنی، درووست کردم، بەڵام ئیشەکانم سەرکەوت بە سەر ئازاترین پیاودا. ((شا ژن، سەمیر ئەمیس))

❖ سەر لێ شێوان بۆ ئەو کەسەیە کە قەرز زۆر دەکات.

❖ سەرکەوتنی هەندێك بێزارم دەکات، بەڵام کەمتر ئەگەر بە هەقی خۆی بێ.

((جۆڵ روونار ١٩٣٠/٣/٢٠))

❖ سەبر کردن، باوکی منداڵێکی جوانە. ((وتەیەکی کۆنە))

❖ سێ شت مرۆڤ، ئارەزووی لێیەتی، تەندروستی و سامان و حەسانەوەی مێشك.

❖ سێ شت دادپەروەری جێ بە جێ دەکات.پارێزەرو شاهید و ڕزگار بوون.

❖ سێ شت ئیشی ژنە، دوروون، زێڕینگەر، مێرد.

❖ سامان هەمیشە میوەیەکی گەیشتووە. ((ئینگلیز))

❖ سزای درۆزن هەر ئەوە نی یە، کەس باوەڕی پێ ناکات،بەڵکو خۆشی باوەڕ بە کەس ناکات.

❖ سەر مایەداری ئیشی زۆر کەسەو،یەك کەس کۆی دەکاتەوە.

❖ سەبرکە،سەبرکە، کات هەموو شتێك دەگێڕێتەوە.کات ژنەکەمی گێڕایەوە.

((مۆریس جۆڵ لومیتە ١٩١٠))

❖ سەگەکان، هیچ عەیبیان نی یە، تەنها یەك عەیب نەبێ، ئەوەش باوەڕ کردنیانە بە مرۆڤ. ((ئیلیان.ج. فنبەرت))

## - ش -

❖ شەیتان، زۆر جار قازان و قاپ درووست دەکات، بەلاّم هەموو جار سەر قاپەکەی درووست ناکات. ((ووتەیەکی ئیتالّییە))

❖ شوو کردن، هەمیشە بیرەوەرییەکی پێویستە.

((ئان –ماری کاریر ١٩٦٢))

❖ شەیتان نازانیّ، ژنان لە کویّ چەقۆ تیژ دەکەن. ((لاتینی))

❖ شەوی ژن گواستنەوە، یەکەم شەوە کە پێویستی بە ((پرۆڤە))ی گشتی نی یە. ((جیرار دو رۆهان – شابو ١٩٤٤))

❖ شەیتان پێویستی بە (دە) سەعاتە تاکو پیاوێك هەڵخەڵەتێنیّ،بەلاّم ژن یەك سەعاتی بەسە بۆ هەڵخەڵەتاندنی (دە) شەیتان. ((ئەلّمان))

❖ شەیتان دە سەعات هەولّ دەدا، پیاوێك لە ڕیّ دەربکات، ژنێك یەك سەعاتی بەسە بۆ ئەوەی دە پیاو لە ڕێگا دەربکات. ((یابانی))

❖ شۆڕش و بومەلەرزە، لە هەموو جیهاندا یارمەتی زانیاری مێژوو جوگرافیا دەدا.

((ئەمینا دۆ ١٩٣٩))

❖ عەیبی پیاو ئەوەیە، موخلیسە، ئیخلاسەکەشی لە ژنێکەوە بۆ ژنێکی کە دەبات.

## - ف -

❖ فەرەنسی یەکان دەڵێن، ئەی ژن ئەگەر مێردەکەت سپی بوو، لە گەڵ ڕۆن فرۆشا قسە مەکە.

❖ فیکتۆر هۆگو دەڵێ، ئەی ژن، ئەگەر جیهان بچووك بوەوە،تۆ بە گەورەیی دەمێنیتەوە.

❖ فلاَن کەس نایەتە بەر ڕۆژ،چونکە ماندو دەبێ و سێبەرەکەی ڕادەکێشێ.

((مارسیل باینۆڵ))

❖ فەرقێکی گەورە هەیە لە گەڵ ئەو کەسەدا کە دەیەوێ کتێبێك بخوێنێتەوە و ئەو کەسەی کتێبێکی بۆ خوێندنەوە دەوێ.

((گلبەرت کایس تشترتۆن ١٨٧٤ – ١٩٣٦))

❖ فەرمانبەر وەکو کتێب وایە، لە کتێبخانەدا، ئەوەیان کەم سوودە کە لە سەرەوەیە.

((مۆڵ ماسۆن ١٨٩٦))

❖ فرمێسکی ئافرەت بەڵگەی درۆیەتی.

## - ق -

❖ قامیشی ڕاو، دارێکە، سەرێکی قوولابی پێوەیە، سەرەکەی کەش بە دەستی بێ ئەقلێکەوەیە. ((سمۆئیل دەۆنسون))

❖ قازانج تامی خۆشە، لە هەر لایەکەوە بێ.

((ماتۆران رینییە ١٩٢٤))

❖ قەت نابێ تەمەنی خۆمت پێ بڵێم، چونکە بە درێژایی تەمەن دەگۆڕێ.

((ئەلفۆنس ئەللیە ١٨٨٥))

❖ قومار چی دزی لە هاوڕێکەی دەکات. ((م٠ ع))

❖ قسە کردن سێ جۆرە : پارچەیەکە لە بەرد، ژوورێکە لە دەریا،پارچەیەکە لە گوڵ.

## - ت -

❖ تۆ شێتی،ئەگەر بتەوێ جیهان بگۆڕی، چونکە سەدەکەمان. پڕە لە نەگونجاو، بۆیە دەمەوێ لەم سەدەیە خۆم بکێشمە دواوە.
((مۆلێر))

❖ تەمەڵ ئەو کەسەیە، کە هیچ ئیشێك ناکات.
((ڕۆدوڵن سالیس ١٨٥٣-١٨٩٧))

❖ تەنها بێ ئەقڵەکان مافی خۆکوشتنیان هەیە، بەوەش هیچ شتێك ناسڕنەوە.
((هەنری دوفرنۆی ١٩١١))

❖ تاکو ئێستاکەش حەزم لە بۆنی گوڵ هەیە بەڵام گوڵ نابچڕم.
((سانت بۆف ١٨٠٤-١٨٦٩))

❖ ترسنۆك،پیاوێکە بەرامبەر ترس، بە هەر دوو قاچی یاد دەکاتەوە.
((جۆزیف ئەدیسۆن ١٦٧٢-١٧١٩))

❖ تۆ کوڕی مامی، ئەگەر قەرز بدەی، کوڕی ئافرەتێکی خراپی ئەگەر داوای بکەیتەوە.
((ئەنتوان لوازیل))

❖ تەماشای مرۆڤ بکە وەکو هەیە، نەك وەکو بووە. ((صینی))

❖ توندو تیژی ژن، لە جوانییایەتی. ((جان جاك ڕۆسۆ))

❖ تۆ ئەی پاکی، هیچ نیت، تەنها ووشەیەك نەبێ. ((برۆتۆس))

## - خ -

❖ خواردن لە گەڵ یەکێکدا کە دڵی نەبا، وەکو ئەوە وایە هونەر بکەیت لە گەڵ پیاوێکی بێ ئەقڵ دا. ((راوول بۆنشۆن ١٨٤٨– ١٩٣٧))

❖ خەسو، شەیتانی ژنە. ((ئەڵمانی))

❖ خوا،پیاوی درووست کردووە درۆ بکەن، ژنیش بۆ ئەوەی باوەڕیان پێ بکەن.

❖ خۆشەویستی و ڕاڕایی و ئازار،هەموو دەس لە ناو دەسن و پێکەوە دەڕۆن. ((ئوفید))

❖ خۆشترین کاتی دڵداری، ئەو کتاتەیە، کە بە پێپلکانەکاندا سەر دەکەوین. ((جۆرج کلیمەنسۆ))

❖ خوا پیاوی درووست کرد،کاتێ بینی تەنهایەکەی هێشتا بەس نی یە، ژنی کرد بە هاوسەری بۆ ئەوەی زیاتر هەست بە تەنهایی بکا. ((پۆڵ فالیری))

❖ خوا مرۆڤی درووست کرد، بۆ ئەوەی ببێ،بەلاّم شەیتان ژنی دروست کرد. ((فیکتۆر هۆگۆ))

❖ خواردنەوە بە بێ تینۆتی و هەڵسان بە دڵداری لە هەموو کاتێکدا،ئەوەیە ئەی ژنی بەڕێز، کە لە ئاژەڵ جوودامان دەکاتەوە. ((بۆمارشیە))

❖ خۆت بە بڵێسە دەزانی، بەلاّم کوژێنەر بوی. ((ئەلکسەندەر دمای کوڕ))

❖ خەڵکی دەکرێنە سێ بەشەوە، لە خو بایی بوو، خۆ بە گەورە زان،ئەوانی تر، من هیچ ئەوانی ترم نەبینیوە. ((ئۆگست دیتۆف ١٩٣٧))

❖ خوای گەورە، مووی لە سەر چەناگەی پیاو ڕوواندووە بۆ ئەوەی لە گەڵ ژندا لە یەك جوودا بکرێتەوە. ((ئەبکێتس))

❖ خۆشەویسترین مرۆڤ، لە دڵی منا، ئەوانەیە کە ئارەزووی گومەت دروست کردنیان هەیە.

# بەشی چوارەم

## پێشەکی

پێشکەشە بەو خوێندوارانە کە هەمیشە مێشکیان زاخاو دەدەن بە ئەدەبی کوردی ڕەسەنمان.

ئەوا ئەمجارەش بەشی چوارەمی (وتەکانی ژیان)مان خستەبەر دەستی ئازیزان و خۆشەویستانمان هیوادارم جێی ڕەزامەندی هەموو لایەك بێ.

**محمد عبدالرحمن زەنگنە**

**کەرکوك**

**١٩٩١/٥/١٢**

## - ئە -

❖ ئەوەی بەزەیی بە ئاژەڵێكی بێ دەسەلاتا نەیەت، ناتوانی بەزەیی بە مرۆڤـ دا بێت.

((ئەبراهام لینكوڵن))

❖ ئەو شتەی پێویستە لێی بترسین، ترس خۆیەتی.

❖ ئەگەر بەلاوی كات و ون بكەیت، لە پیریدا كات وونت دەكات.

((شكسپیر))

❖ ئیش كرد گەورەترین دوژمنی مرۆڤـ دەكوژێ، بێزاری، شەڕ، هەژاری.

❖ ئەگەر ئازایەتی لە ڕاستیدا نەبێ، لە درۆدا نی یە. ((عەرەب))

❖ ئەوین، دەریایەكە، قولایی یەكەی نازانین، تەنها ئەو كاتە نەبێ كە دەمانبا.

❖ ئەگەر كات هەڵبژێری، واتە كۆت كردۆتەوە. ((بیكۆن))

❖ ئەگەر دەرگایان لێ داخستی، لە كونی دەرگاكەوە تەماشا مەكە، یا دەرگاكە بشكێنە یاخود برۆ. ((تونی كویك))

❖ ئەو دەرگایەی بۆت ناكرێتەوە،كلیلی مەدە.

❖ ئەگەر ویستت خەڵكی پێت پێكەنێ،دەبێ دەم و چاوت گرژ بێ.

((كازانۆفا))

❖ ئەگەر منداڵ، لە باوكی كرد، گومان لە دایكی ناكرێ.

((وێژەی ئەسپانی))

❖ ئەگەر گوێت دا بە لەشت و ئاگاداریت كرد، تەمەنت درێژ دەبێ.

❖ ئێمە یەكجار دەژین، دوور نی یە كەمتریش. ((مارسیل نەشار ١٩٤٢))

❖ ئەوەندە جوان نی یە، کە بتکوژێت و ئەوەندەش ناشرین نی یە کە بتترسێنیٚ.

((سرفانتیس ١٦١٣))

❖ ئەو هەژارانە، پێویستە لە سەریان خۆشحالٚ بن، چونکە گەدەیان باشە شکاتی لە دەس ناکەن لە وێدا بە ملیۆنەها هەیە هاوار لە گەدەیان دەکەن.

((جان نانۆی ١٩٣٩))

❖ ئەگەر دەتەویٚ نهێنی ژیان بزانی و چۆن تێدا بەختیار دەبیٚ، من هەمووی لە یەك ووشەدا کۆدەکەمەوە ئەویش، ئیشەو لە ئیشیش بەو لاوە نی یە.

((ئەدوار لابولای))

❖ ئەو کەسەی نەتوانیٚ بەباوکایەتی هەڵسیٚ، مافی ئەوەی نی یە ژن بهێنیٚ و ببێتە باوك.

((رۆسۆ))

❖ ئەو کەسەی بە هەنگوین زیاد بخواو (نیفراط) بکا، دۆست نی یە.

❖ ئەو کەسەی بەڕاستی ئامۆژگاریت بکا خۆشەویستە.

❖ ئەگەردوو ئافرەت بە یەك گەیشتن و ئەوا قسەیان نابڕێتەوە، ئەگەر بوون بە سییان، شەڕیان نابڕێتەوە.

((صینی))

❖ ئەگەر دەتەویٚ دوژمن پێت نەوێریٚ، ڕەوشتی خۆت چاك بکە.

((ئەفلاتون))

❖ ئەوەم پێخۆشە کە بڵێن بۆچی پەیکەری بۆ نەکرا، نەك بڵێن بۆچی پەیکەری بۆ کرا.

❖ ئەوانەی بەگژ ئازادی دا دەچن، ئەوانە یارمەتی دەدەن.

❖ ئەوانەی بەرد لادەبەن، پەنجەی خۆیان دەڕوشێنن.

❖ ئەگەر هەژار بووی، بیر بکەرەوە کیٚ لە تۆ شایان ترە.

❖ ئەگەر ڕەخنەی دوژمنان و گلییان نەبوایە، لە زۆر ئیشدا سەر نەدەکەتم و ئەگەر ناڕەزایی ئەوانیش نەبوایە هەر سەر نەدەکەوتم. ((ریشیلۆ))

❖ ئەگەر گوڵت دەوێ، نابێ لە دڕکەکەی بێزار بی. ((تورك))

❖ ئەو کەسە باش دەنوێ، ئەگەر هیچی نەبێ لە ناو چوونی بترسێ.

❖ ئەو کەسەی بە کەم ڕازی نەبێ، بەزۆریش ڕازی نابێ.

❖ ئەو کەسەی نهێنیەکانی بشارێتەوە، دەگا بە ئامانجی.

❖ ئەگەر لە خۆشیدا بین، ئەو خۆشییە بەردەوام نابێ، ئەگەر نەمان شاردەوە. ((شکسپیر))

❖ ئەو چۆلەکەی لە دەستایە، لە دووانی سەر دار باشترە. ((سەرفانتس))

❖ ئەو کەسەی برادەرەکانی بەجێ بهێڵێ،خۆی بەجێ هێڵراوە.

((موغیرە کوڕی شەعبە))

❖ ئەی ئافرەت، وەرە بۆ باخچەکەم، چونکە دەمەوێ گوڵەکانمت پێ پیشان دەم.

((شریدان))

❖ ئەوە بە خەڵك مەکە،وەکو ئەوەی دەتەوێ پێت بکەن دوور نی یە هەست و نەستی ئەوان وەکو تۆ بن. ((بەر ناردشو ١٩٠٥))

❖ ئەگەر باران ڕاوەستا، ئاوی جۆکەلە ڕوون دەبێتەوە. ((وێژەی تورکی))

❖ ئەو ئافرەتە جوانە یاری لە گەڵدا بکە، کۆتایی یەکەی بە بزە دێت.

((ئەناتۆل فرانس))

❖ ئەگەر دەریا، ووشك بێ، لم بەجێ دێڵێ، ئەگەر پیاویش نەما، یاداشتی بەجێ دێڵێ.

❖ ئەگەر ئاشتیت ویست، بۆ شەڕ ئامادە بە. ((وێژەی لاتینی))

❖ ئەوەی زۆر پێکەنێ، زۆریش دەگرێ. ((وێژەی عەرەب))

❖ ئەگەر یەکێك بۆ یەکمجار خراپەی لە گەڵتا کرد، بەهەڵدا چووە، ئەگەر بۆ دووەم جار هەڵەی لە گەڵتا کرد، تۆ بەهەڵەدا چووی. ((وێژەی صینی))

❖ ئەوەی هیوای نەبێ، ڕقی لە سبەینێیە. ((وێژەی ئینگلیز))

❖ ئەوەی زۆر ئازار بچێژێ، زۆر فێر دەبێ.

❖ ئەگەر لە یەکێکی تر، پرسیار کرا، تۆ وەڵام مەدەرەوە، چونکە سووکی بۆ پرسیار کەرو وەڵام دەرپێشان دەدا.

❖ ئەو ئافرەتەی، گاڵتە بە مێردەکەی بکا، ناتوانێ لە خۆشیدا بەردەوام بێ. ((بەلزاك))

❖ ئەو ڕۆژەی ئیشی تێدا ناکەین، وەکو ئەو شەوەی کە ناخەوین مانوومان دەکا.

❖ ئەگەر توانای یارمەتیت نەبێ، با هەمیشە زمانت سوپاس بکا.

❖ ئەو ئافرەتەی موخلیسە بۆ مێردەکەی، موخلیسە بۆ خۆی.

❖ ئەو کەسەی تەنها بۆ خۆی بژی، بە جۆرەی خەڵکی مردووە.

❖ ئەمڕۆ لە کۆشکدا سبەی لە قەبردا.

❖ ئەگەر ئافرەت دادوەر بێت و پیاویش وولآتەکەیەتی. ((لامارتین))

❖ ئەگەر ئافرەت ڕقی هەڵسا، دەبێتە چەکێکی خەتەر، لە گەڵ نارنجۆکی ئەتۆم. ((ئاسەر میللەر))

❖ ئەو پیاوانەی چەندە بە نرخن، کە خۆشەویستیان بۆ خوا بە قەد خۆشەویستی ئافرەت ببوایە. ((کۆنفوشیوس))

❖ ئێمە هەمیشە چاوەڕوانی ئافرەتین کە خۆشەویستی و بەختەوەریمان بۆ دێنێ. ((شکسپیر))

❖ ئەو ژیانەی کە نرخی هەبێ ئەوەیە بۆ خەڵکی کە بژین. ((ئەنیشتاین))

## - ئا -

❖ ئـافرەت وەكـو گوڵـە، ئەگـەر لـە جێگـەی خـۆی هەڵكێـشرا، لـە ژیـان دەوەستێ.
((شكسپیر))

❖ ئافرەت، شیعری خواوەندە و پیاویش پەخشانێتی. ((ناپلیون))

❖ ئـافرەت، دەژی بـۆ ئـەوەی لـە خۆشەویـستیدا بەختـەوەر بێ،پیـاویش خۆشەویستی دەكا بۆ ئەوەی لە ژیاندا بەختەوەر بێ. ((جان جاك ڕۆسۆ))

❖ ئافرەت، بە بێ خۆشەویستی.٠ مردووە. ((ئەفلاتون))

❖ ئـافرەت، سـێ شـتی لـە پیـاو دا خـۆش نـاوێ، ژنانـە. لـە خۆبـایی بـو، نەزان،ژنانە چونكە بەرهەڵستی دەكا،لە خۆبایی بو، لاسای دەكاتەوە،نەزانیش، لە بـەر ئەوەی زوو تێ ناگا چی دەوێ.

❖ ئافرەت،چـل سـاڵ خۆشەویـستی دەشـارێتەوە بـەلاّم ڕقـی كـات ژمێرێـك ناشارێتەوە.

❖ ئافرەتە زۆر جوانەكان، بۆ ڕۆژی دووەم كەمتر سەرسامان دەكا.
((ستندالّ ١٧٨٣ – ١٨٤٣))

❖ ئامۆژگاری، كەس مەكە ئەو كاتە نەبێ،كە داوات لێ دەكەن.

❖ ئازایەتی،ئەوە نی یە، دڵت ترسـی تێـدا نەبێ،بـەلاّم ئازایـەتی ئەوەیـە زاڵ بیت بە سەر ترسا.

❖ ئافرەت،بەزێڕەكانی بە راورد ناكرێ، بەڵكو بە ئەدەبی.

❖ ئافرەتی ناشرین،دەم و چاوی لـە ئاوێنـەدا دەبینـێ و ئـافرەتی جـوانیش دەم و چاوی لە چاوی خەڵكیدا دەبینێ. ((بەرناردشۆ))

❖ ئافرەتێكم دەناسی، زۆر تورە بـوو هەڵدەچـو لـە بـچوكترین هـۆ، هەرچـی دەرمانی هێمنی و چارە سەر هـەبوو، سـوودی نـەبوو بـۆ چـاك بـوو نـەوەی بـەلاّم لـەم

دوواییەدا چاك بووە و کە یەکێك لە پرۆفیسۆرە تایبەتییەکان پێی ووت :زوو تورە بوون دیاردەیەکە لە تەمەن گەوریی.

❖ ئافرەت دەتوانێ نهێنی خۆی زیاتر بپارێزی لە نهێنی یەکێکی تر.

((لایروبیر))

❖ ئافرەت، جوانترین دیاریە کە خوواوەند بە مرۆڤی پێشکەش کردووە.

((سوکرات))

❖ ئافرەت، ئەگەر بۆ سێدارەش ببرێت،داوای ئەوە دەکات ماوە بدرێت تاکو خۆی ئارایشت بکا. ((ئینگلین))

❖ ئافرەت، سێ جۆرە پیاوی ناوێ،بێ ئەقلّ،لەخۆبایی بوو،ژنانە.

((بسمارك))

❖ ئادەمیزاد،ئەوەی هەیەتی چاودێری دەکاو دەیپارێزێ، بەلاّم سۆشیالیست لە شتەکانی خەلّکی تردا. ((مالکروم دوشازال ١٩٥٠))

❖ ئافرەت وەکو مانگ وایە، لە بەر رووناکی پرشنگدار دەبێت.

((وێژەیی ئەلّمانی))

❖ ئاگادار بە تاوان مەکە،چونکە پالّت پێوە دەنێ بۆ دزی و پاشان بۆ خۆشاردنەوە.

((فەرەنسوێ سۆمییە ناز ناو بهەتری سۆم ١٨٤٤– ١٩٠٧))

❖ ئافرەتی خراپ، وەکو بەهارات وایە، کەم کەم نەبێ بۆمان هەزم ناکرێ.

((لویس سیباستیان مرسییە ١٧٤٠– ١٨١٤))

❖ ئافرەت مرۆیەکی بچوك نی یە،بەلاّم پیاو سەرکەوتو ترە. ((نیکۆلّ))

❖ ئافرەت هاورێتی ئافرەت لای نرخی نی یە،تەنها ئەو کاتە نەبێ کە ئەو ئافرەتە هیچ پیاوێکی خۆش نەوێ. ((هەنری دوفرنوێ ١٩١١))

❖ ئافرەت،هەندێ شتی هەیە دەیشارێتەوە، بۆ ئەوەی دەریخات. ((مونتاین))

❖ ئافرەتی چاك و پاك، خۆدەدەن بە دەستەوە و چاویان نوستووە، بۆ ئەوەی خۆ بە دەست دانەكە نەبینێ. ((گاستۆن دوكافییە ورویێر دوفلیوس))

❖ ئافرەت،خۆی دەدا بەدەستەوە و نامرێ. ((شارل دوبرنار))

❖ ئافرەت،بزە دەیگرێ كاتێ دەتوانێ، بەلاّم هەر كاتێ ویستی دەگری. ((كارلایل))

❖ ئافرەت،لە ئیش و كارماندا شەریك ناكەین،چونكە خۆیان ئەوەندە ئیشیان هەیە كە بەسیان بێ. ((لودفیك ئوفولویل ١٩٥٨))

❖ ئادەمیزاد، نەگۆشتی دەخورێ نە پێستی بەكەڵك دێت،كەواتە چی تری هەیە لەزمان شیرینی بەولاوە. ((تورك))

❖ ئافرەت،خۆی فێری كردم، ئافرەت چییە. ((كبلنك))

❖ ئافرەت،گوڵێكە بۆنی دەرناچێ،ئەگەر لە سێبەردا نەبێ. ((لایتبای))

❖ ئافرەت، دەڵێ ی مرۆڤایەتییە و پیاو سەربەستی. ((سمیلس))

❖ ئافرەت،وەكو منداڵە،ئەگەر دووای كەوتی ڕادەكا، كە تۆ لیی ڕات كرد دووات دەكەوێ

((فولتێر))

❖ ئافرەتی جوان،چاو پێی خۆشحاڵە،ڕەوشت باشیش،دڵ پێی خۆشحاڵە یەكەمیان ئەو شتە جوانە و بەنرخانەیە كە دەكرێ بە قەداو دووەمیان،كانزایە. ((ناپلیون))

❖ ئافرەت،قوربانی بە هەموو شتێك دەدا لە پێناوی ئەو پیاوەی كە خۆشی دەوێ بەلاّم گوێی بەوە نی یە كێ باوەڕی پێیەتی لە خۆشەویستەكەیدا.

❖ ئافرەت وەکو کات ژمێری جوان وایە، دیمەنی جوانە، دەم و چاوی جوانە جولانەوەی جوانە،بەلاّم چاك کردنەوەی گرانە.

❖ ئافرەت،لەغاوی جیهانی بە دەستەوەیە، هەر کاتێ ویستی چاکی دەکاو هەر کاتێ ویستی تێکی دەدا.

❖ ئافرەت، لە ژیاندا بە سێ پلەدا تێ دەپەڕێ،یەکەم خەون بە دلّدارییەوە دەبینێ،لە دوومیندا تاقی دەکاتەوە لە سێهەمدا لێی پەشیمان دەبێتەوە.

❖ ئای.·خۆشەویستەکەم،چەندە دەنگتم پێخۆشە،کە بێدەنگ دەبیت. ((لامارتین))

❖ ئافرەت ئەو کەسەی خۆش دەوێ،کە خۆشی دەوێ بەلاّم پیاو و ئافرەتی خۆش دەوێ

((هیرار))

❖ ئافرەت، جوانترین دیارییە کە خواوەند بە مرۆڤی پێشکەش کردووە.

❖ ئافرەت،وەکو قوماش وایە، هەلّبژاردنی لە ژێر ڕووناکی مۆم دا دەبێ.

❖ ئارفەت، وەکو کوتر وایە، لەو کاتەیدا بیر لە پیاو دەکاتەوە، خەون بە هێلانەوە دەبینێ.

## - ب -

❖ باڵندەی نامۆ، خێرا هێلانە دروست دەكا. ((تورك))

❖ باوەڕ بەو برادەرە مەكە كە بەربەرەكانی و دوژمنایەتیت دەكاو دووای ئاشت دەبێتەوە.

((ئینگلین))

❖ با نەزان،چی دەڵێ با بڵێ، زانین نرخێكی هەیە و ئینكار ناكرێ. ((دەلافۆنتین))

❖ بۆ دونیا ئیش بكە،وەكو بڵێی هەتا هەتایە دەژیت و بۆ دووا ڕۆژ ئیش بكە، وەكو بڵێی سبەی دەمری. ((ئیمام عەلی))

❖ بۆ بردەرەكانت ئیش بكە،زیاتر خۆشتیان دەوێ،چاكەش لە گەڵ دوژمنەكانتا بكە دەبنە برادەرت. ((تۆلستۆی))

❖ بە قسەی خۆش دەرگای ئاسن دەكرێتەوە. ((تورك))

❖ بەختەوەرترین ئافرەت،وەكو بەختەوەرترین وولاتی بێ مێژووە.

((جۆرج ئەلیۆت))

❖ برادەر نا ناسرێ، لە كاتی تەنگانەدا نەبێ. ((جۆن هیود))

❖ بە سەبر كردن بە تێپەڕكردنی كات،گەڵای تو دەبێتە ئاوریشم. ((چینی))

❖ بڕوای خۆت و هەوڵدانە تایبەتیەكانت خۆت بدە دەست ڕۆژگار، ئاگاداریش بە جیاوازی نەكەی لەنێوانیان دا.

❖ بەنرخترین دیاری خوا بە پیاوی دا ئافرەت بو.

❖ باوەڕت بە هەتاوی زستان و دڵی ئافرەت نەبێ. ((بولگاری))

❖ باوەڕت هەبێ بەو ئافرەتەی کە تاکو مردن ڕقی لە پیاوێك دەبێتەوە، باوەڕت هەبێ خۆشی دەوێ تاکو پلەی مردن.

❖ بەختیاری مرۆڤــ ژیانە، ژیانیش ئیش کردنە. ((تۆلستۆی))

❖ بەزەیی،جەوری یاسایە،هیچ کەسێك یاسا بە توندی بە کار ناهێنێت تەنها جەور کەران نەبێ ((شکسپیر))

❖ بە باشی چاوت بکەرەوە پێش ژن هێنان، لە پاش ژن هێنان نیوە نووستوو دەبیت.

((ئەمەریکی))

❖ برا هەیە، لە دایکتیش نی یە. ((عەرەب))

❖ بێدەنگی،باشترین شتە بۆ ئەو کەسەی بێقیمەتە. ((بەرناردشو))

❖ بە هەزار دینار ناتوانی،پێکەنینێ بکڕی. ((چینی))

❖ بێدەنگی،چەند خۆشە،کاتێ گوێ لە سەروەی دڵ دەگرین.

❖ باشترین ڕێگا بۆ ئەوەی لە گیرو گرفت ڕزگار بیت،گیرو گرفتەکانت بخەرە گیرفانە دڕاوەکەتەوە. ((کولّیە))

❖ بگرە و بەردە لە گەڵ ژنێکی توڕەدا مەکە،چونکە کاتەکات بە فیڕۆ دەدەی.لە گەڵ ژنێکی ڕازیش بگرەو بەردە مەکە چونکە کاتەکەی بە فیڕۆ دەدەی. ((شیلّدن))

❖ باشترین کەس ئەو کەسەیە لە عەیبی خۆی بگەڕێ نەك لە عەیبی خەڵکی.

❖ بانگە بێدەنگەکان و نەرم و نیانەکانی دایك،ڕێگە بۆ کانیاوی خێر وون ناکەن.

((هەنری وورد پێشتەر))

❖ بە گوێرەی پیاو ژن هێنان کۆتایی ژیانە، بە گوێرەی ژنیش هەوەڵیەتی.

((دییولّی))

❖ بڕوانە پیاو وەکو هەیە، نەك وەکو بووە. ((چینی))

❖ بەندی ڕاستەقینە، ئەو کەسەیە کە نەتوانێ ڕای خۆی بە سەربەستی بڵێ.

((نۆربیدس))

❖ بەختیاری،بە ماڵ و پارەی زۆر نی یە، بەڵکو بە قەناعەتە.

❖ بەنرخترین شت لە ژیاندا، سێ شتە، زانست و خواردن هاوڕێتی.

❖ بە بێ دڵداری ژن مەهێنە،ئەگەر خۆشەویستیت کرد،باوەڕت هەبێ بەوەی خۆشت دەوێ، باوەڕی بە خۆشەویستی هەیە. ((جۆزیف))

❖ برینی دڵداری، چاك نابێتەوە،تەنها بە دڵداری نەبێ.

❖ بۆ لە مردن بترسین،ئەگەر ئێمە خاوەن ماف بین،چاك وایە،مرۆڤـــ لە پێناوی بیریدا بمرێ،نەك بە درێژایی زەمان خائنی وولاتەکەی ترسنۆك بێت و یاریدەدەی نەبێ.

((مانزینی))

❖ بەختیاری،پەپولەیەکە، کە ویستت بیگری لە دەستت دەردەچێ.

❖ بە منالێت مەلێ، تۆ جارێ منداڵی و هیچ تێناگەی.

❖ بناغەی وولاتی هیچ، یەك کات ژمێرە، وولاتی ڕاست تا ڕۆژی کۆتاییە.

❖ نیشتمان پەروەری بە تەنیا بەس نی یە،پێویستە لە گەڵیا کینە و دڵ پیسی لە گەڵ کەسا نەبێ. ((ئەرستۆ))

❖ بەختیاری، لە جوڵانەوەو بەردەوام بوونە لە ئیش و کار. ((ولیەم بلاك))

❖ بەختیاری ئەوەیە،ئەوەی لە سەرتە بیکەی بە ڕەزامەندی و ڕازی بوونت.

((لودفیك هالیفی))

❖ بێ هێزترین کەس،ئەو کەسەیە،نەتوانێ نهێنی خۆی بشارێتەوە.

((عەرەب))

❖ بەڵێنی خۆشەویست، نیوەی ئەمەکدارییە.

❖ بێدەنگی، نیوەی ڕەزا بوونە.

❖ بۆن کردن، نیوەی چێژتنە.

❖ باوکایەتی :هەریەکە دەزانێ دایکی کێیە و چاوی ڕووناکی کەوتووە.ئەوەکانی تریشی نهێنیەکە،ئەوە نهێنی خۆشەویستیە. ((بۆ مارشیە ١٧٨٤))

❖ بزە، زمانێکە،پێویستی بە ڕوون کردنەوە نی یە.

❖ بزە،زمانێکە،کە مرۆڤ هەستی پێدەکات بەرامبەر خۆشەویستەکەی.

❖ بزە، زمانی دڵدارییە.

❖ بڕوام وایە،مەسەلەکە لە کۆتاییەدا دڵدارییە،چونکە هەر کاتێ بیرەوەری خۆشەویستی یەك بکەمەوە، ئەو بیرەوەرییە زاڵ دەبێ بە سەرما. ((فلادمیر))

❖ بوکی،گرینۆکە،ژنێکە پێدەکەنێ، بەپێچەوانەوە ڕاستە.

❖ بەرگری،خراپە، بە خراپە مەکەن. ((تۆڵستۆی))

❖ بۆ وەدەس هێنانی ئافرەت بۆ خۆشەویستی، پێویستە وا هەڵسوکەوتی لە گەڵدا بکەی،وەکو تۆ حەز لەو شتە نەکەی. ((بۆ مارشیە))

❖ بەخت،سەرکەوتن درووست دەکات،سەرکەوتنیش وەرگرتن درووست دەکات.

((ئاتین ڕای))

❖ بۆ قەرەباڵغی،خەڵکە بچووکەکان و دەهۆڵەکان هەڵدەبژێرن.

((ج· ش· لیشتبرك ١٧٩٩))

❖ باڵندە، بە باڵەکانی دەفڕێ،پیاویش بە هیمەتی. ((نەینبای))

❖ بە سەربەستیم ووت کوا کوڕەکانت ؟وتی یەکێکیان هەڵواسراو یەکێکیان بە شێتی مردو یەکێکیان لە دایك نەبووە. ((جوبران خەلیل جوبران))

❖ بۆ دڵداری،یەك فرمێسك هەڵدەڕێژین،بەلاّم بۆ بەرژەوەندی خۆمان هەموو فرمێسك هەڵدەڕێژین.

- باشترین برادەر ئەوەیە، كە نهێنی نادركێنێ.
- بێ هێز،هەڕەشە دەكاو ئازا ئیش دەكا.
- برادەر سەنوقێكی داخراوەو كلیلی ڕاڤەیە.
- بەرد قورسە و لم قورسترە،بەلاّم نەزان لە هەر دووكی قورسترە.
- برادەر،وەكو تەندروستی وایە،نرخی نازانی تاكو وونی نەكەی.
- برادەرت زۆر دەبێ، ئەگەر جزدانەكەت پڕ بێ لە پارە.

## - پ -

❖ پێش ئەوەی تورە بیت،تەماشاکە،هۆ هەیە بۆ تورە بونت.
((ئینگلیز))

❖ پێویستە بۆ خۆراک، هەوڵ و ئیش کردن. ((ئیبن خەلدون))

❖ پیاو ئاواتی ئەوەیە، سامان کۆکاتەوە، بۆ ئەوەی بە هەموو ڕەزامەندییەکەوە پێشکەشی بکات،بەو ئافرەتەی کە بەر تورەیەوە دەکەوێ.
((مارك توێن))

❖ پیاو هەندێ جار،پیاوە،مێ، مێیە، لە هەموو کاتێکدا.

❖ پیاو، لە بەرد نان دەردەکا. ((تورك))

❖ پەیمان هەورە و،بەجێ هێنانی بارانە.

❖ پیاو دوو جار خۆشحاڵ دەبێ، کاتێ ژن دێنێ و کاتێکیش ژنەکەی دەمرێ.

❖ پیاو چۆن ئافرەتی دەوێ :

کچ بێ، وەکو مەریەم.

جوان بێ،وەکو کلیۆباترە.

تێکۆشەر بێ،وەکو جان دارك.

سەخی بێ،وەکو فاتیمە.

ئافرەت چۆن پیاوی دەوێ :

دەوڵەمەند بێ، وەکو ڕۆکفلەر.

سەفی بێ، وەکو حاتەم. ((ئەڵمان))

❖ پیاوێك، بە دووای ئافرەتێك بکەوێ دیخوازێ،بەڵام ئافرەتێك بە دووی پیاوێکدا بگەڕێ دەکەوێتە چاڵەوە. ((وتەیەکی هیندییە))

❖ پیاوەتی و چاكە كردن ئەوەیە كە ئەوەی پێویستە بیدەی بە یەكێكی تر بە ڕاستی.

❖ پیاو سێ شتی لە ئافرەت دەوێ،چاكی لە دڵداری و پاكی لە ڕووداو و زەردەخەنە لە سەر لێوان.

❖ پیاو،ئافرەتی زۆر ژیری خۆش ناوێ،چونكی سەری لێ دەشێوێنێ،ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت كە ئافرەتی نەفامی خۆش بوێت.

❖ پێویستە هەموو ئافرەتێك مێردێكی هەبێ، بەشداری خۆشی و ناخۆشی نهێنیەكانی بكات.

❖ پیاو پەسەندی ئەو ئافرەتە دەكات كە لە مەیدانی دڵداریا شارەزایە بەلآم هەرگیز نایخوازێ.

❖ پیاو،بە ڕاستی ئافرەتی خۆش ناوێ، تا هەڵەكانی و ناتەواویەكانی خۆش نەوێت.

❖ پەرتووك، پەنجەرەیەكە،تەماشای جیهانی پێدەكەین. ((چینی))

❖ پێویستە لە ڕێگەی ژیاندا لە نێوان دوواندا، مامۆستایەك بدۆزمەوە.

((كۆنفۆشیۆس))

❖ پیاو،دەتوانێ ژن لە هەموو پیاوێك بپارێزێ تەنها لە خۆی نەبێ.

❖ ((چینی))

❖ پیر بووم و هیچم جێ بەجێ نەكرد،ئێستاش ئەو كاتەم نی یە،هیچ شتێك جێ بەجێ بكەم، هەر وەكو هەوەڵ دەمێنمەوەو لە سەر ئەو هێڵەی كە دۆزیومەتەوە دەڕۆم.

((بۆڵ سیزان))

❖ پێم بڵێ چەند جار ئەو کەسەی ئاگادارە و سامانی دزراوە،یا ئەوەی مەلەوانی دەزانێ خنکاوە،منیش بە تۆ دەڵێم چەند جار زیرەك سەر نەکەتووە، یا ڕاستێك تێکەوتووە.

((ڕوکفرلەر))

❖ پیاو،هەست بە هێزی دەکاو بەشی ژن دەدا،ژنیش هەست بە پیری دەکاو بە سەر پیاودا جەور دەکا. ((بەرناردشۆ))

❖ پێکەنین،ئەو هەتاوەیە،کە هەور لە سەر دەم و چاوی مرۆڤـ لا دەبا.

((فیکتۆر هۆگۆ))

❖ پیاو،حەز دەکا بە تەنها بێت، بۆ ئەوەی بەتەنها بێت،ئافرەتیش حەز دەکا بە تەنها بێت بۆ ئەوەی لە گەڵ یەکێکدا بێت. ((مۆریس دوکوبرا))

❖ پێش ئەوەی ژن بهێنم،شەش تیورم هەبو بۆ بە خێو کردنی منداڵەکانم،بەلام ئێستا شەش منداڵم هەیە و هیچ ڕێگەیەکم نی یە.

((دگۆن وەیلمۆس ڕۆشتەر ڕۆلآن ١٩٠٩))

❖ پێویستە لە کاتی قسە کردن لە گەڵ ئافرەت دا،زۆر ڕێزی بگری، بە پێچەوانەوە جولانەوە کە کەمتر ڕێزی بگری. ((ناتین))

❖ پێویستە درۆزن، بیری تیژ بێ. ((کوتنلیانۆس))

❖ پێم بڵێ، کێ خۆشحاڵ بووە بە سەر کەوتنی برادەرەکەی، بە بێ حەسوودی.

((ئەسخیلوس))

❖ پیاوی چاك، خاوەنی وولآتێکە. ((سنیکا))

❖ پەرەسێلکە،بەهار درووست ناکا، بەلام ووشتر بیابان درووست دەکا.

((ئەلفرێد کابۆ))

- پیاو ژنی خەڵکی خۆش دەوێ،بەڵام کوڕەکەی لە هەموو کەس زیاتر خۆش دەوێ.

((ووتەیەکی جیورجی یە))

- پیاو لە سەر بەرد نانی خۆی دەر دەکا.
- پێم بڵێ،چی جۆرە کتێبێك دەخوێنیتەوە،پێت دەڵێم تۆ کێیت.

## - ج -

❖ جوانی پەلەوەر، لە پەڕەكانیدایە،جوانی پیاو لە زانستیدایە.

❖ جوانترین شت لە دڵداریا ئەوەیە،وەكو لقی دار گوڵە،هەر كاتێ گوڵێكی لێ سیس بووەوە،لەولاوە خونچەیەكی تر دەردەچێ.

❖ جوانی و خۆشەویستی،ئەو دوو شتە لای ئافرەت گرنگە.

❖ جوانترین شت لە شەودا ئەوەیە، كە ڕۆژ لە دایك دەبێ.

❖ جوانترین چاو، درۆزنترین چاو، چاوی ژنە. ((بەرازیلی))

❖ جوانترین شت كە مۆسیقا ژنەكان كردوویانە، بەرهەمی ئێش و ئازارو خەفەتیانە.

((تۆلستۆی))

❖ جیهان،شانۆیە،بەڵام دەورەكان بە خراپی دابەش كراوە.

((ئۆسكار وایڵد))

❖ جوانترین بزە لە پشت هەورەوە،ئەو بزەیەیە كە لە نێوان فرمێسكی ئافرەتەوەیە ڕێگە دەبرێ. ((لامارتین))

❖ جاران،ئافرەت پیر دەبوون،بەڵام هەر جوان بوون،ئەمڕۆ پیر نابن،بەڵام ناشرین دەبن.

((ئەلكۆنت ئاتین دو بۆمۆن))

❖ جوانە مرۆڤ لە پێناوی وولاتەكەیدا بمرێ،لەوەش جوانتر ئەوەیە، لە پێناوی دا بژی.

❖ جنێو، بە هاوسێكەت بدەو قەبر هەڵكەنە.

❖ جوانی ئافرەت، وەكو سامان وایە بۆ پیاو، هێزو دەسەڵاتە.

((ئەكسیل مۆنتە))

## - چ -

❖ چەند جوانە، كاتێ بزە،لە قولأیی دڵەوە پرشنگ دەدا.

❖ چاكە بچێنە، بەختیاری دەدوریتەوە.

❖ چی بارێك قورسە ؟ تورە بوون. ((ژیرێك))

❖ چەند دەتوانی خەفەت، لە خۆت دوور خەرەوە. ((ئینگلیز))

❖ چاك وایە،بڵێی نا، نەك بڵێی دوور نی یە.

❖ چاك وایە، لە برسا بمری، نەك لە ڕەزیلێك داوای نان بكەی.

❖ چاو،باوەڕی بە خۆ هەیە وگوێ هەواڵەكەی بە ڕاست دەزانێ.

((ووتەیەكی سویسرییە))

❖ چەند خۆشەویستی بكەین،ئەوەندە خۆشەویستیمان بۆ خۆشەویستی كەم دەكاتەوە،ئەوەندەی كە دەخۆین،زیاتر حەز لە خواردن دەكەین. ((ئالان لوبرۆ ١٩٣١))

❖ چاكترین كات بۆ ڕاكێشانی دڵی بێوەژن،ئەو كاتەیە كە لە ناشتنی مێردەكەی دەگەڕێتەوە

((تۆماس فۆڵەر ١٧٣٢))

❖ چاك وایەئافرەت وا لێ بكەی سوور هەڵگەڕێ،نەك وای لێ بكەی پێبكەنێ

((ئەلفۆس كار١٨٥٩))

❖ چۆن لە دوپشك دەترسی، ئاوهاش لە وانە بترسە كە غەیبەتت دەكەن. ((عەرەب))

❖ چاودێری دوژمنت بكە وەكو شێری بزانە، ئەگەر مشكیش بێ. ((ئینگلیز))

## - د -

❖ دیۆجنس، وتی لە تالیس —یان پرسی : قورسترین شت چییە ؟

وتی : ئەوەیە مرۆڤـــ خۆی بناسیّ، هەر وا لیّیان پرسی :

سووك ترین شت چییە ؟

وتی ئامۆژگاری خەڵك کردن.

❖ دڵم وەکو مۆم نەرمە،بەڵام بۆ تەنگانە وەکو تاوێرە.

❖ دڵۆپیّ هەنگوین بە توانایە،هەڵگری پێنووس بە تواناترە،گەلیش هەڵناسیّ بـە شۆڕش،تا خاوەن پێنووسەکان هەڵنەسن. ((فۆنس سێیەم))

❖ دڵداری و خۆشەویستی،ئەو کاتە دەزانریّ،کە پێی هەڵدەستی.

((وێژەی ئەسپانی))

❖ دەزانین بە پیری لە دایك ببین و بە لاوێتی بمرین. ((جان کۆکتۆ))

❖ دلبەری کچ دەڵیّ،چۆنت پێخۆشە وام لیّ بکە، بە مەرجێك فێربم.

((دیدرۆ ١٧٦٩))

❖ درۆ باڵی نی یە، بەلاّم ناو زڕان باڵی هەیە. ((چینی))

❖ دەس پێکردن، نیوەی ئیشە.

❖ دایکی کوژراو دەنویّ،بەلاّم دایکی کوژەر نانویّ.

❖ دەتوانی گولّ لە ژێر پێتا داڕزێنی،بەلاّم ناتوانی بۆنەکەی نەهێڵی.

❖ دوو ڕێگا هەیە،بۆ سەرکەوتنی هەمیشەیی،ڕاست گۆیەکی هەمیشەیی و ئیـشی بەردەوام.

❖ دەوڵەمەندی، بە بیّ چاودێری،وەکو قفڵی بیّ کلیل وایە.

❖ دەوڵەمەندی ڕەزیل،وەکو بەهێزی ترسنۆك وایە.

❖ درۆزن، دزە،چونکە دز سامان دەزی و درۆزن ئەقلّ دەدزیّ.

❖ دڵی ئافرەت،سەنووقێکە،پڕە لە شووشەی بەتالّ بۆنی گولاّوی کۆنی لیّ دێت.

❖ دڵداری جۆری هونەری شێتی وەرزە،ناشرینترین جۆری،ئەوەیە کە ئەو دوو دڵداره وا دەزانن دڵدارییەکەیان دەمێنێتەوە و ڕۆژگار نایگۆڕێ.

((مەنفولوتس))

❖ دڵداری لاوێتیە، لەوە بە دوواوە ورینەی خەوە.

❖ دایك ڕووناکییەکە هەرگیز ناکوژێتەوە. ((فۆلتێر))

❖ دڵۆپەیەك لە سەردڵۆپەیەك دەبێتە دەریا.

❖ دوژمنێکی ژیر،چاترە لە هاوڕێیەکی نەزان.

❖ دبلۆماسی،ئەو پیاوەیە، دوو جار بیر دەکاتەوە، پێش ئەوەی هیچ بڵێ.

❖ دڵداری وەکو ئاگر وایە، ووشك وسەوز دەسووتێنێ، هەر وا خۆشی دەسووتێنێ تاکو بە خۆڵەمێش دەبێ.

❖ دڵداری،ئەو ئارەزووەیە، کە بە سەربەستی یەکێکی تر دەبەستێتەوە((جان بولْ سارتەر)

❖ دەشێ دڵ بچووك دونیای گەورەو خۆشەویستی گەورەی تێدا بێ.

((ڕەسولْ هەمزاتۆف))

❖ دڵداری ڕاستی سەرچاوەی ئازارە،ئەوەی لە ئازار بترسێ،شایستەی دڵداری نی یە.

((لامارتین))

❖ دڵی ئافرەت،مرواریيەکە،پێویستی بە مەلەوانی باش هەیە.

❖ دڵی ئافرەت، زۆرانبازی زۆر دەکا، بەلام نامرێ.

❖ دڵداری ژنان هەمیشە کوێرە.

❖ دەنگی هەق،جاروبار نەبەگوێ نەبەسەر،نابیسترێ،بەلام بە دڵ دەبیسترێ.

((توفیق ولحوکیم))

❖ دڵداری،پەیمانێکە، لە گەڵ ئازار دا. ((مەدام دی ليناس))

- ❖ دڵداری و ڕاڕایی و ئازار، هەمیشە دەستیان لە ناو یەکدایە. ((نۆفید))
- ❖ دڵداری، لە هیچەوە لە دایك دەبێ و بە بێ هیچ دەمرێ. ((ئەلفۆنس کار))
- ❖ دەوڵەمەند، نوژدار چاو دێری دەکا،هەژاریش ئیش و کاری ڕزگاری دەکا.

((وێژەیی پۆڵۆنی))

## - ر -

❖ ڕاستی و ڕون، هەمیشە سەر دەکەون. ((ئینگلین))

❖ ڕازانەوەی پیاو ئەدەبە، ڕازانەوەی ئافرەت زێڕە. ((عەرەب))

❖ ڕەوشتی ئافرەت، وەك ئاوێنەیەکی پاکی پرشنگدارە، نزیك ترین هەناسە کاری تێدەکا.

((سێرفانتس))

❖ ڕابواردنی هەژار بە تام ترە لە هی دەوڵەمەند، ئەوەندە بەسە کە هەژار خواردن بەتامەوە دەخوات، دەوڵەمەند هەرچی هەبێ بیدات تامی وای دەس ناکەوێت. ((هلنسیۆس))

❖ ڕاستی، تەنها شتێکە کە هیچ کەسێك نایەوێت بڕوای پێ بکات. ((بەرنارشو))

❖ ڕاستە سامان قسە دەکات، بەڵام نابیستێ.

❖ ڕاست ترین شت کە مرۆڤ ئەو ڕۆژە دەینووسێ، یا دەربارەی ڕاڤەی تایبەتی خۆیەتی، یا هەستێکی ڕاستە لە دڵەوە دەردەچێ. ((یەکێك))

❖ ڕاستی خواردنی مێشکە، بەڵام جوانی خواردنی دڵە. ((شیلەر))

❖ ڕاڤە (تجربە))، ئەو ناوە نهێنییە، کە دەیسەپێنین بە سەر هەڵەکانماندا

((ئۆسکار وایلد))

❖ ڕابوردوو بە یاد دێنمەوە، نەك بۆ ئەوەی برینێك بکولێنمەوە،بەڵکو بۆ ئەوەی ڕاڤە بە خۆڕایی نەڕواو بیریش بە دوواوە نەگەڕێتەوە. ((ئەمێل حەبیبی))

❖ ڕاستە من لە سەر خۆ دەڕۆم،بەڵام ڕووی نەداوە یەك هەنگاو بەرەو دوواوە بگەڕێمەوە.

((ئەبراهام لینکۆڵین))

❖ ڕاست گۆیی مێژوو، بێ دەنگی مردووەكان دروستی دەكەن.

((ئاتین رای ١٩١٤))

❖ ڕاست بڵێ، با لە سێدارەت بدەن. ((كریستۆفەر مارلو ١٥٩٠))

❖ ڕاستی، بە ئەقڵ و دڵ دەزانین. ((باسكاڵ))

❖ ڕاستی، لە دەمی منداڵانەوە دەردەچێ. ((لاتینی))

❖ ڕێـــزی هـــەموو شـــتێك بگـــرە، وەكـــو ئـــەوەی ڕێـــزی باوكـــت دەگـــری.

((یابان))

❖ ڕەزیل، لەم دونیایـەدا، وەكـو هـەژار دەژی و لـەو دونیـاش وەكـو دەوڵەمەنـد حیسابی لە گەڵ دەكرێ. ((عەرەب))

❖ ڕەزیل، تەنانەت لە لای باڵندەكانی ئاسمانیش بێ قەدرە. ((یابان))

❖ ڕەزیـل، سـكی تێـر دەكـاو هاوسـێیەكەی برسـییە، سـامانەكەی دەپـارێزی و ناموسیشی نی یە.

## -هـ-

❖ هاوسیّ، پیّش خانو، هاوڕیّ،پیّش ڕیّگا. ((عەرەب))

❖ هەموو داریّ بەری هەیە، بەری دڵیش كوڕە.

❖ هەر كەسیّ بەینی دوو كەس، تیّك بدا، مردنی بە دەس ئەو دووانە دەبیّ

((ویّژەیی عەرەب))

❖ هەر كەسیّ، تەنها چاكەی خۆی و خراپەی خەڵك دەبینیّ،كویّر لەو باشترە.

((میخائیل نەعیمە ١٩٨٨))

❖ هیچ خۆشییەك نی یە، بەقەد خۆشی، چاكە. ((تورك))

❖ هەژاری، عەیب نی یە، بەڵام تەمەڵی عەیبە. ((تورك))

❖ هیچ شتیّك نی یە،ڕیّگەی هەوڵدەر بگریّ بۆ پیّشكەوتن. ((بیتهوڤن))

❖ هەق (ماف)وەكو تەپە دور وایە،ناخنكیّ. ((تورك))

❖ هیّزی دە پیاوم هەیە،چونكە دڵم پاكە. ((نەنسن))

❖ هەمیشە حەز دەكەم گویّ لەو مرۆڤە بگرم كە باسی خۆی دەكا...چونكە ئەو كاتە گویّم لە شتی باش دەبیّ. ((ویڵ ڕۆجرز))

❖ هەموو برینیّك، مەرهەمی هەیە. ((ئینگلیز))

❖ هەموو فەلسەفەی پیاوان، ناكاتە یەك هەستی ئافرەت. ((فۆڵتیر))

❖ هەڵەكانت لە لای خەڵكی تر بەو جۆرەیە،كە تۆ هەڵەیان دەبینی.

((گلادستۆن))

❖ هەموو ئەوانەی ئامۆژگاری خەڵكی دەكەن كە ژن نەهیّنن، خۆیان ژنیان هیّناوە.

❖ هەموو زمانی جیهانی فیّر بووم، لە هەموو زمانیّ خۆشتر زمانی چاوە.

❖ هەق، بە کردارو بە دڵ دەزانین. ((باسکاڵ))

❖ هەموو ئاواتی ئافرەت،ئەوەیە بە جوانی بمێنێتەوە. ((لۆردلتلتۆن))

❖ هەموو هەڵەیەك، بۆ بێ ئەقڵی پیاو دەگەڕێتەوە. ((مێشلێ))

❖ هەموو شتێکی چاك،لە چوار دەورما دەسکردی ژنەکەمە. ((ڕۆکفلەر))

❖ هەر کەسێ کتێبێکی باشی کوشت،واتە پیاوێکی باشی کوشتووە.

❖ هەموو قوتابخانەی جیهان،دڵسۆزی دایکتت نادەنێ. ((بولگاری))

❖ شەش شت لە مرۆڤـ دا جوانە :جوانی لە لووتا،شرینی لە چاودا،ڕێك و پێکی لە دەم و چاودا،بریقەداری لە دیمەن دا،جوانی لە بالآدا،ڕێك و پێکی لە قژوو پرچ دا.

❖ هەر چەندە ئافرەت،بەهەشتی لە دەست داوین،بەلآم هەمیشە لە باوشیا دەگینەوە.

❖ هیچ میللەتێك نەیتووانیە هەڵسێت، بە بێ ئەوەی ئاگرێك پاکی نەکردبێتەوە.

((گاندی))

❖ هەڵەی ئەوانە کە لە سەر شتێك سوورن، لە لام باشترە لە دو دڵی زاناکان.

((ئەناتۆڵ فرانس))

❖ هەر کەسێ باوەڕی بە خۆشەویستی هەبێ هەموو شتێك دەکا، تاکو پێی بگا.

((فلیکان))

❖ هەر کەسێ ڕاستی ببینێ و لایەنی نەگرێت ترسنۆکە.

❖ هیچ شتێك نی یە،لە فرمێسك زووتر ووشك بێتەوە

❖ هاوڕێیەتی.. خۆشەویستیەکی بێ باڵە.

❖ هەژاری هەڵەیەکی کاتییە،بەلآم دەوڵەمەندی بێ ئەندازە نەخۆشییەکی کۆنی بێ چارەیە.

((دیستۆفیسکی))

❖ هەموو کەس نهێنی دەشارێتەوە، ئەگەر هەڵەی زمان و لۆچی ڕوومەتی نەبێ.

❖ هێزی کۆمەڵ و خۆپاراستنیان بەستراوە بە ڕەوشت باشی لاوەکانییەوە.

((هاوز))

❖ هونەر ئەوە نی یە کە نەکەوین،هونەر ئەوەیە هەرچەندە کەوتین هەڵسینەوە.

❖ هیچ شتێك بە دزییەوە مەکە،ئەگەر ئارەزووت لێ بو بە ئاشکرا بیکەیت.

❖ هیچ هەژارییەك وەك نەزانین نی یە هیچ سامانێکیش لە ئەقڵ بە نرختر نی یە.

❖ هەمیشە لە دوژمنەکانت ببورە هیچ شتێك لەوە زیاتر پەستیان ناکا.

❖ هەڵۆ مەنێرە تاکو کەروێشك نەبینی. ((ڕوسی))

❖ هەر کاتێ بەخت لە دەرگاتی دا، بە پێی یاسا کلیلی لە سەر داخە.

((مێگیل))

❖ هەر کەسێ بتوانێ ئافرەت بێنێتە زەردەخەنە، واتە نیوەی ڕێگای بۆ دڵی بڕیوە.

❖ هاوڕێی هەموو کەسێك ئەقڵێتی، دوژمنیشی نەزانییەتی.

❖ هەموو جیهان لە تای ترازوویەکدا بێ و دایکم لە تای ترازوویەکدا بێت، دایکم هەڵدە بژێرم

((جان جاك ڕۆسۆ))

❖ هەرچی بریقەدار بێ زێڕ نی یە،زێڕیش نی یە ئەو شتەی بریقەدار بێ

((لویس سکوتنێر ١٩٤٥))

❖ جەورو زۆر دارییە، کە بڵێی ئافرەت تێگەیشتو نین ((مەدام لیتیسیا)) بۆ نموونە باسی دەکەین و کەسی کە نا،ئەم ژنە تێگەیشتووە نۆ مانگ زانایەکی لە سکدا بووە ئەویش (نابلیون)ە. ((بۆڵ جان تولێە))

❖ هەڵە کەر، نەزانە سەرەڕای ترسنۆکی. ((بۆلانۆ))

❖ هاوارێك لە پیاوەوە هەڵدەستێ،كاتێ ئازار دەچێژی،بەڵام ئافرەت كاتێك هەست بە خۆشی دەكەن. ((جۆرج ئارمام ١٩٦٠))

❖ هیچ كەس لە تاریكیدا، سور هەڵناگەڕێ. ((بنیامین و شكوت ١٧٥٣))

❖ هەموو ناخۆشی و ڕووداوێك كە پەیوەندی بە منەوە نەبێ، هیچ نی یە تەنها خەونە.

((گوڵ ڕوونار ١٨٩٨))

❖ هیچ كەسێك، ئامۆژگاری قەبوڵ ناكا،بەڵام سامان قەبوڵ دەكا،كەواتە سامان لە ئامۆژگاری بە نرخ ترە. ((دگۆ فاسان سوینت ١٧٠٦))

❖ هیچ خۆشییەك، لەوە خۆشتر نی یە،كە لای ڕاستی بگری. ((باكن))

❖ هاوڕێكەم، وریا بە لە ئافرەتی جوان،كاتێ خۆیان نەرم و نیان پیشان دەدەن،ئەو كاتە ئێمە دەبینە كۆیلەیان. ((فیكتۆر هوگۆ))

❖ هیچ شتێك لەوە گرانتر نی یەبۆ ئەو ئافرەتەی لە نێوان دوو پیاودا وەستاوە ئەو پیاوەی خۆشی دەوێ،ئەو پیاوەی كە خۆی خۆشی دەوێ.

((جوبران خەلیل جوبران))

❖ هەندێ ئافرەت،توانای هوتەری قسە كردنیان نامێنێ،بەڵام بە داخەوە توانای قسە كردنیان دەمێنێ. ((بەرنارد شۆ))

❖ هەر كەسێ لە خزمێكی شتێ بدزێ،ئەگەر فلسێكیش بێ، ئەو كەسە خراپە،وەكو ئەوە وایە یەكێكی كوشتبێ. ((بۆلانۆ))

❖ هیچ شتێك بە بێ ماندوو بوون بە بەر نایەت.

❖ هاوڕێ،لە كاتی تەنگانەدا دەناسرێ. ((جۆن هێود))

❖ هەموو برینێك، سارێژ دەبێ، تەنها برینی (كەرامەت)نەبێ،كە دەكاتە هەموو ژیان.

- هــەر میللــەتێك لاوی نــەما، هێزشــی نامێنیٚ،ئەگــەر پــیرە مێردیــشیان نەما،ژیریشیان نامێنیٚ
- هەژاری عەیب نی یە، بەلاَم عەیب ئەوەیە لە هەژاری شەرم بكەیت.
- هیوا ئەو ڕووناكیەیە، كە هەمیشە لە تاریكییدا پرشنگدارە.
- هیچ شتێك مەكە،چونكە كات دەبینیٚ و گویٚ ی لیٚ دەبیٚ و نهێنی ناشارێتەوە.
- هێرش،بەرنــە ســەر مردن،چــونكە دوور نــی یە،هەنــدیٚ ئــازا ســەلامەتی بــۆ بنوسریٚ،دووریش نی یە، ترسنۆك لەماڵی خۆیدا بمریٚ،لە خۆ بردووەكان،لە خۆبردوون و بەهەشتیان كڕی

((ئیمام عەلی))

## - و -

❖ وا چاكە بە نیوەی دڵت ئافرەتت خۆش بوێت، لە بەر ئەوەی هەمووی نەسووتێنیێ.

❖ وا باشە ئافرەت بیركاتەوە،پێش ئەوەی وێنەكانمان بۆ بگێڕێتەوە.

((جان كۆكتۆ))

❖ وا بزانم پیاو كەمتر لە ئافرەت درۆ دەكەن، تەنها ئەو كاتە نەبێ كە دڵداری دەكەن.

((ئەلكۆنتس دیان ١٨٩٨ ))

❖ وتراوە،ئەگەر پیاو چاك پلەو پایەی بەرز بووەوە، هەر بە چاكە دەمێنی،ئەگەر ناكەس بەچەش بو، ئەوا لە خۆ بایی دەبێ.

❖ ووشە،دەس بەندی خاوەنەكەیەتی،ئەگەر باسی كرد، ئەوا خۆی دەس بەندێتی.

❖ وولات، بە پیت و بەرەكەتی زەوییەكەی پێش ناكەوێ، بەڵكو بە سەربەستی دانیشتوانی.

❖ وریابە،یەكەم ئامۆژگاری ژنەكەت وەرنەگری، وریاش بە ئامۆژگاری دووەمی وەرگری.

((وێژەی ئینگلیز))

❖ وولات فرمێسك دەیكوژێ و خوێن زیندووی دەكاتەوە. ((حافز ئیبراهیم))

## -ز-

❖ زۆر ئاسانە بۆت،سكی بیست كەس تێر بكەیت،بەڵام زۆر گرانە دوو چاو تێر بكەیت. ((ڕوسی))

❖ زۆر جار چۆلەكەیەك لە دووای هەڵۆیەكەوە دەفڕێ وا هەست دەكا هەڵۆكە لە ترسی ئەو دەفڕێ ((فولتێر))

❖ زیرەكی ئافرەت وەكو بەهەشتی (عەدن) وایە،كەبەرو بومی باش دەگرێ، بە بێ ئەوەی بیكێڵی و ئاگاداری بكەی. ((دونای))

❖ زانست كانگایەكی زۆرە و داخراوە،كلیلیشی بەردەوام بوونە.

❖ زۆر پیاوان هەیە بە كلك دروست بوون، زۆر گرانە ببن بە سەر. ((تیلەر))

❖ زانیاری نیشانەی ژیرییە،ژیریش پێشەوای چاكەیە. ((ئەرستوتالیس))

❖ زۆر كەم كەسێك دەبینین،هەڵەی كەسانی تر كێشانە بكات بە بێ ئەوەی پەنجە كەڵەی نەخاتە سەرتای ترازووەكە.

❖ زەمان پزیشكێكە، پارە وەر ناگرێ.

❖ زانیاری كانگایەكە، بەدوای خاوەنەكەیەوەتی بۆ هەر جێگایەك بڕوا.

((ووتەیەكی چینییە))

❖ زۆر كۆبوونەوە دەكرێ، لە بەر ئەوە كۆبوونەوەی ڕابوردوو مانگێكی بەسەردا تێپەڕ بووە

❖ زیاتر ڕێزی قسەكانت بگرە، نەك سوێندەكانت،هیچ درۆ مەكە و بە شتی گرنگیش گاڵتە مەكە. ((دیوگنس))

❖ زمانت، بە زمانم، فێر بكە. ((بولانۆ))

❖ زمان بهێڵێ سەر ڕەحەتە. ((كورد))

❖ زۆر ئاسایە كە ئافرەت ڕێگا بە خۆی بدا، لە دووری دۆستەكەی دڵی كوترە كوتر بكا. ((نیلول فرانسواز بارتورییە))

❖ زۆر لە ڕۆمانەكان، نووسینیان ئاسانترە لە خوێندنەوە.

❖ زانستی و ڕۆشنبیری، باشترین تێشوی پیرییە.

❖ زانا ماڵی لە گەڵ خۆیەتی بۆ هەر جێگایەك بڕوا.

❖ زۆر جار سەبر كردن، لە دەوڵەمەندی باشترە.

❖ زیندو،بەنرخێكی گران سوپاسی چنگ دەكەوێ و مردوو بە خۆڕایی.

❖ زێڕ نرخی هەیە، بەلأم ئامۆژگاری نرخی نی یە. ((وێژەی چینی))

❖ زاناكان وەكو گوڵە گەنم وان، چۆن گوڵە گەنم بەرز دەبێتەوە و پێش كاتی پڕ دەبێ سەر شۆڕ دەكات. ((ئینگلیز))

❖ زانست، سەرە ڕای هەموو شتێك چاكە، نەزانیش ناشرینە بە هەر حاڵ. ((بەدیع ولزمان))

❖ زەردەخەنەی ئافرەتی جوان، تیشكێكە لە تیشكی هەتاو.

❖ زۆربەی ئەو كەسانەی كە ئەقڵیان نی یە، لە بەر ئەوەی سەر گەرمن.

((فۆلتێر ١٦٧٠))

❖ زۆر جار چەن كەسانێك دەبینین،سەر دەكەونە سەر داری پەتی سێدارە،چونكە هیچ ڕێگایەكی تریان نی یە، بۆ ئەوەی لە خەڵكی بەرز ترین.

((ئەیل بۆنتیش))

❖ زەرەرو زیانی میللەتێك،سوود بەخشە بۆ میللەتێكی كە. ((عەرەب))

❖ زۆر چاكە ئەگەر كچ گوڵەكەی بپارێزێ،بەلأم ئەگەر ونی كرد نابێ خۆی لە سێدارە بدات.

((لافۆنتین ١٦٦٤))

❖ زۆر ڕۆیشتن لە سەر شتێك هەڵەیە.

❖ زۆر كچان،دەگرین بۆ ئەوەی بێزاری لە خۆیان دوور بخەنەوە.

((سوودین ١٧٦٥))

## -ژ-

❖ژنی چاک،لە دەس و چاو چاکترە. ((موسلم کوڕی عبدوڵڵا))

❖ژنی چاک، وەکو گوڵ وایە، لە هەموو شوێنێك دەڕوێن.

❖ژیان گوڵە، بۆنەکەی دڵدارییە و ڕازاوەکەی جووانییە.

((فیکتۆر هۆگۆ))

❖ژن هێنان شەڕە،بەلاّم شەڕێکی زەرورییە. ((ئەغریقی))

❖ژن هێنان ئازارێکە کە مرۆڤـــ بۆی دەگری. ((ئەغریقی))

❖ژن هێنان، ڕاکردنە لە خەفەت،جێگای نووستن کەمترین جار تێدا دەنوین.

((لاتینی))

❖ژن هێنان،بە پێچەوانەی (تایە)،کە بەگەرمی دەس پێدەکاو کۆتایەکەی ساردییە.

((ئەڵمانی))

❖ژن هێنان وەکو قەلاّیەکی گەمارۆ لێدراو وایە،ئەوەی لە دەرەوەیە دەیەوێ بڕواتە ژوورەوە، ئەوەش لە ژوورەوەیە دەیەوێ دەرچێ. ((عەرەب))

❖ژن،ئەو کاتەبزە دەیگرێ کە دەتوانێ،بەلاّم دەگری ئەو کاتەی دەیەوێ.

((کارلیل))

❖ژنی جوان،وەکو کار بەدستان وایە،خەڵکی لە بەر بەرژەوەندی خۆیان وسفی دەکەن.

((یابان))

❖ژیر،هەمیشە بە دووای وێژەی چاکدا دەگەڕێ، نەزانیش وا تێدەگا دۆزیەتیەوە.

((ئینگلیز))

❖ژیان،سەفەرێکی خۆشە،سەرە ڕای دەردەسەری.

❖ژیر، ئەو کەسەیە،نهێنی خۆی بشارێتەوە و نەزانیش ئەو کەسەیە ئیش و کاری خۆی بڵاوبکاتەوە.

❖ژیر بیر دەکاتەوە،پێش ئەوەی ئیش بکا،نەزانیش،ئیش دەکا پێش ئەوەی بیربکاتەوە.

❖ژیان منداڵێکە،پێویستی بە یاری کردن هەیە تاکو بنوێ.

❖ژیری نی یە،هەموو کات،ڕاستی بڵاوبکەیتەوە. ((ئینگلیز))

❖ژن،ئەو شتەی بۆی دەکەین نایبینێ،تەنها ئەوە دەبینێ کە بۆی ناکەین.

((جۆرج کۆرتلین))

❖ژنەکەم،وای لێ کرم کە من ببمە ئەو کەسە کە کێم. ((بسمارک))

❖ژنی ڕاستەقینە،ئەو ژنەیە کە دەتوانێ جوانی لە دڵی پیاودا درووست بکات،ئەگەر جوانیش نەبێ... پێویستە بتوانی ئەخلاق و هیما و دەست پیشکەری هەبێ ((تاگور))

❖ژن لە مێردەکەیدا چی خۆش دەوێ ؟

– ژنی فەرەنساوی لە مێردەکەیدا ئازایەتی و چوونە بەرەوەی خۆشی دەوێ.

– ژنی ئەڵمانی لە مێردەکەیدا بەردەوام بوون لە بڕیارداو پاراستنی مافی خۆشەویستی، خۆش دەوێ.

– ژنی هۆڵەندی،لە مێردەکەیدا ئەوەی خۆش دەوێ مێردەکەی لە ژیانی دا تووڕەی نەکا.

– ژنی ئەسپانی، ئەوەی خۆش دەوێ کە مێردەکەی تۆڵە سێن بێ لە وەی قینی لێیەتی.

– ژنی دەنیمارکی لە مێردەکەیدا ئەوەی خۆش دەوێ کە لە وولاتەکەیدا جوانترین و بەختیار ترین پیاو بێت.

❖ ژیان،هیچ چێژێکی نی یە بە ئازار،ئازاریش ئاگرێکە دەروونی پێ دەکۆڵێنرێ.

❖ ژیانە ڕۆمانە،ئەو کەسەی دەوورەکەی تێدا بە جوانی ببینیٚ،تێدا سەر دەکەویٚ،ئەوەش دەوورەکەی بە جوانی نەبینیٚ،سەر ناکەویٚ.

❖ ژیانی ئافرەت زنجیرەیەکە،لە هەست و خۆشەویستی و قوربانی.

((بلزاك))

❖ژن،کیسەی پارەکەی بە دەستەوە دەگریٚ بۆ ئەوەی ئافرەت بیبینیٚ،بەلاٚم پیاو دەیشارێتەوە تاکو ژنەکەی نەیبینیٚ.

❖ ژنان،لە کاتی منداڵ بوندا ئازاریان دەبیٚ، لە بەر ئەوەیە هەموو ژنێك منداڵەکەی خۆش دەویٚ ((یۆربیدس))

❖ ژیان مەعنای نی یە لە گەڵ ووره بەردانا، ووره بەردانیش،مەعنای نی یە لە گەڵ ژیانیدا.

((مستەفا کامیل))

❖ ژنی شەرماویم خۆش دەویٚ، بە جۆرێك شەرم دەکەم، خۆشەویستی خۆمی بۆ دەر ببڕم.

❖ژن فێر کەن،فێری کەن،تاکو ببێت بە قوتابخانەیەك،تاکو منداڵەکانتان تێدا فێر بن پێش ئەوەی لە قوتابخانە فێر بن،پەروەردەیان کەن لە باوەشتانا بۆ ئەوەی دووا ڕۆژێکی باشیان هەبیٚ بۆ وولاٚتەکەیان. ((مەنفەلوتی))

❖ژن هیچ چەکێکی نی یە، تەنها زمانی نەبیٚ. ((ئینگلین))

❖ژن، لە دەساڵیدا وەکو پەری وایە،لە پازدە ساڵیدا وەکو ماسێرەیە و لە چل ساڵیدا وەکو شەیتانی و لە هەشتا ساڵیدا وەکو فاڵچی یە.

## - ی -

❖یەك ووشەی نەرم و نیان،بە زیندوویی گوێم لێ بێ،چاكترە لە لاپەڕەیەكی ستایشم لە ڕۆژنامەیەكی گەورەدا لە پاش مردنم. ((فۆلتێر))

❖یەكەم و دووا تەماع و ئاواتی ئافرەت ئەوەیە،جوان بێ. ((ووتەیەكی چینی))یە.

❖یەكەم شتی ڕاوەستاو،ئەوەیە هەمیشە لە گۆڕانێكی بەردەوامە. ((هیراقلیتس))

❖یاسا،وەكو وێژە وایە،هەمیشە یەكێكیان لە نێواندایە،كە ئەوەی تر پوچەڵ دەكاتەوە.

((هەندی ماربە ١٩٠٣))

❖یارمەتی هەژار بدە،خوا یارمەتیت دەدا. ((تورك))

❖یەك تەڵە شخاتە بەسە، بۆ سووتاندنی مەلیونەها دار.

❖یەك شت هەیە،هەمیشە دەمێنێ و لە ناو ناچێ،ئەویش ڕەوشتە. ((هۆزار گربلی))

❖یەك كات ژمێری ناخۆش، لە ڕۆژێكی خۆش درێژ ترە. ((ئینگلیز))

❖یەكەمین خۆشەویستی لە لای لاو شەرمە..یەكەمیشی لە لای كچ ئازایەتییە.

((فیكتۆر هۆگۆ))

❖یەكەمین چاكە لە جیهان دا،زانینە،یەكەمین شەڕ لە جیهان دا،نەزانینە. ((سوكرات))

## - ك -

❖كوڕەكەم ناتوانێ جێگای من بگرێتەوە، منیش ناتوانم جێگەكەم بگۆڕم،چونكە بۆ كات و شوێن لە دایك بووم. ((ناپلیۆن))

❖كە پاروو لە گەرودا گیر بو،هەڵمەت بۆ ئاو دەبەیت،ئەی ئەگەر ئاو لە قوڕگدا گیرا شالاو بۆ چی دەبەیت. !

❖كەئێمە لە ژیان نەگەین،چۆن لە مردن دەگەین. ((ڕۆلان)) !

❖كە پلیتی بەخت دەكڕی،هیوای دەرچوونیت هەیە،كە نایكڕی،یەكێ لەم دووانەیە،یا زۆر هەژاری پارەی پلیتەكەت نی یە یا زۆر دەوڵەمەندی پێویستیت بە قانزانجی پلیتەكە نی یە.

❖كاتێك یەكێكی خۆشەویستت وون دەكەی،هەموو دونیا بریقەی لە چاودا نامێنێ. ((لامارتین))

❖كۆشی دایك،نەرمترین سەرینە لە جیهاندا. ((شكسپیر))

❖كەمێك تێگەیشتنی ڕاست، كەمێك لێ بوردن.. كەمێك خۆشی،پاشان گەشكە دەدبات و دەبینی،چۆن لە سەر ئەم ئەستێرە دەحەسێتەوە. ((سومرست مۆم))

❖كە بینیم دەستم دەلەرزێ،زانیم كە خۆشم دەوێ. ((ڕۆلان))

❖كاتێ ئافرەت،هەست بە بێزاری دەكات،جوانێكەی بەرەونەمان دەڕوات.

❖كاتێك ئافرەت، لە سەر پیاوێك قسە دەكا،ئەوە بزانە كە خۆشی دەوێ.

❖كاتێ ژن،كتێبێ دادەنێ،دوو هەڵە دەكا،یەكەمیان ژمارەی كتێبەكان زیاد دەكا،دوومیان لە ژمارەی ژنان كەم دەبێتەوە.

❖كوڕم،هۆشت بۆ یەكێ تر بێ ئەو كاتەی پێویستییەكت پێی هەیە،كوڕەكەی وتی :چۆن هۆشم بۆ یەكێ تر بێ ؟ ووتی لە پێویستییەكەتا پرسی بكە. ((لوقمان))

❖ کاتێ شوانێ بزنێك لە گورگ ڕزگار دەکا،بزنەکە،شوانەکە بە پاڵەوان دەزانێ و گورگەکەش بە دکاتۆر دادەنێ. ((لنکۆڵن))

❖کچ،تەنها یەك ئارەزووی هەیە ئەویش شوو کردنە،بەڵام شووی کرد ئارەزووی لە هەموو شتێك هەیە. ((تۆنی مایەر ١٩٦١))

❖کچ کە ڕەسیتە دەبێ،هەموو کچێ ئەو ڕەسیتەیان،لە بیر دەچێ،چونکە بیر لە دڵداری دەکەنەوە. ((مارسیل نۆکلێر ١٩٦٣))

❖کەمێك،لە گیرفانی خۆتا،چاکترە لە زۆرێك لە گیرفانی یەکێکی تردا. ((سرفانتس))

❖کەمێك تەماع،زۆر زەرەر دەگەیەنێ و ئەوەی تێر بێ و بخوا،بە دانی گۆڕ بۆ خۆی هەڵدەکەنێ. ((تورك))

❖کەر،دەتۆپێ وپالانەکەی دەمێنێ،مرۆڤیش دەمرێ،بەڵام شتەباشەکانی بە جێ دەهێڵێ. ((تورك))

❖کوڕی چاك، جێ شادمانی باوکە.

❖کۆلیتەیە لە سەر خۆڵ،چاکترە لە کۆشکێك لەسەر لم. ((کورد))

❖کات و قسە و ئیش، جێگە و ڕێگەی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە. ((ئینگلیز))

❖کچی بەختیار ئەوەیە،کە دەڵێ دۆڕان،ئەقڵی نەدرۆڕێنێ. ((پۆڵ))

❖کاری نەکردە نی یە،بۆ ئەوانەی سوور بن. ((جۆن هیود))

❖کە بە من بڵێن دەبیتە قەلەڕەش یا حەسوود،قەلەڕەش،هەڵدەبژێرم،چونکە قەلەڕەش گۆشتی مردوو دەخواو حەسوود گۆشتی زیندو. ((ئەنگیتۆس))

❖کۆمەڵ،خەڵکێکی زۆرە لە مرۆڤی ڕۆشنبیر و دەبنە دوو بەشەوە،بەشێکیان سەر بە بێزاری هەڵدەدەن و بەشێکیان بەرەو ڕووی دێن و چارە سەری دەکەن ((لۆرد بایرون))

## - گ -

❖گەورەیی ئەوەیە،پیاو هەست بکا لە نێوانیاندا بچووکە،بەڵام گەورەیی ڕاستی ئەوەیە هەموان وا هەست بکەن لە نێوانیاندا کە گەورەن. ((مەکسیم گۆرکی))

❖گەورەترین هەڵە ئەوەیە،هەست بکەی،هەڵە نی یە. ((کادلیل))

❖گومان،مەشخەڵی بیر دەکوژێنێتەوە و برادەر لە ناو دەبا.

❖گەلی بچووک پێویستیان بە خەنجەری تیژ هەیە. ((شامیل ساڵی ١٨٤١))

❖گەلی بچووک پێویستیان بە برادەری دڵسۆز هەیە. ((ئەبو تالیب ١٩٤١))

❖گوللەی بچووک کەشتی گەورە کون دەکات. ((شامیل))

❖گریان پێویستە، بەڵام چارە نی یە.

❖گەورەترین خۆشی و گرانترین ئازار.. ئا ئەوەیە.. خۆشەویستی ((مەدام دی شتایل))

❖گریان پێویستە، بەڵام جێ بەجێ کردن نی یە. ((یابانی))

❖گایەکم، بۆ بێنە،وەرزشەوانێکی لێ درووست دەکەم. ((دالمبێر ١٧٦٧- ١٧٨٣))

❖گەش بین،ئەو کەسەیە کە سەیری دەم و چاوی دەکاو ڕەش بین ئەو کەسەیە کە تەماشای پێت دەکا. ((تشترتۆن))

❖گریان، پێویستە،بەڵام ئەنجام نی یە. ((وێژەی یابانی))

❖گوڵی جوان،زۆر نامێنێ. ((وێژەی سویدی))

❖گا،بە گوێی دەگیردرێ و مرۆڤ بە قسەی. ((تورك))

## - ل -

❖له هەموو مرۆڤێکی ڕاستیدا،منداڵێك خۆی شاردۆتەوە وئارەزووی له یاری هەیە
((فردریك نیشته))

❖له ئەمەریکادا چەندەها مەزاهیبی ئایینی ماوە دراو هەیە،بەلاّم له هەموو ئەو ئایینانه زیاتر که دەپەرسترێت دۆلارە. ((ئێلیا نێهر نبورگ))

❖له دە کەس، نۆیان قینی لێمە، بەلاّم ئەوان نرخیان نی یە، چونکه دەیەمیان چەك دارە. ((کرۆمۆێل))

❖له وێدا مرۆڤ هەیە قسە دەکا و قسە دەکا، تاکو شتێك بدۆزنەوە کە بیڵێن.
((ساشا گێتری ١٩٤٨))

❖لاوەکان،خۆیان هەڵدەکێشن،بەدا هاتوویانەوە و پیرەکانیش بە ڕابوردوویانەوە.
((دیکۆلی ١٩٥٣))

❖له وێدا ئافرەت هەیە، خۆی دەهاوێتە سەر ئەسپ، بۆ ئەوەی وات لێ بکاو وا بزانیێ کە تۆ بۆی شێت بوی. ((ساشا گێتری ١٩٤٨))

❖له وێدا خەڵکێك هەیە هێزیان نامێنیێ،چونکه قەرزیان کردووە،له وێشدا خەڵکێك هەیە هێزیان زیاد دەکا چونکه قەرزیان داوە. ((ئۆگۆست دیتۆف))

❖له هاورێتیدا هیچ شتێك لە ڕاست گوێی گرنگتر نی یە.

❖لەو کەسە بترسە، کە زۆر دیاریت بۆ دێنیێ. ((وێژەی ئیتالی))

❖له ڕێوی،وایە هەموو کەس وەکو خۆی ئارەزووی له مریشکە.
((وێژەی فەرەنسی))

❖لوتکە،شتێکی گەورەیە،لە وش گەورەتر ئەوەیە،بە پێی خۆی سەر کەوی،نەك لە سەر شانی خەڵك

❖له بەردەم قسەی خۆش دا، هەموو دەرگا یەك دەکرێتەوە.

❖لە ژیانی تاکە کەسیدا و لە ژیانی هەموو میللەتاندا هەڵە نی یە ڕاست نەکرێتەوە گەڕانەوە بۆ ڕاستی.هەموو هەڵەیەك دەسڕێتەوە. ((غاندی))

❖لەو شەرەفمەندییە،بەرزتر نی یە،پیاو بمرێ و،چەکەکەی بەدەستەوە بێ.

((دیمۆستین))

❖لە مشت و مڕی دوورو درێژدا، ماف ون دەبێ. ((ئینگلین))

❖لە ژیانی مرۆڤـ دا، دوو ناخۆشی هەیە،یەکەمیان کە دڵداری نامێنێ،دووەمیان دیدۆزێتەوە. ((بەرنارد شۆ))

❖لە دووای هەموو گەورەیەکەوە مامۆستایەکی گەورە هەیە.

❖لە هەموو ناخۆشی ئەوەیە،شەتێك لە ناخی دا مردبێ،بەلاّم ئەو شتە هێشتاکە مابێ.

((ئەلبەرت))

❖لە هیچ شتێکا،زۆر خەرج مەکە. ((ئەفریقی))

❖لە خەوما،ژیان خۆشییە،کاتێ هەڵسام بینیم پێویستە. ((ئینگلین))

❖لە پیاو هەموو شتێك دەبێ، لە ژن هەموو شتێك دوور نی یە. ((بۆڵ برۆلا))

❖لە سەر ژنەکەت، قسەمەکە،ئەی ئەو نەبو کە ڕۆژێك،تۆی هەڵبژارد. !

❖لە سێ شت تێناگەم، هونەر و مۆسیقا و ژن.

❖لە لاوێتیما،زۆر گرنگیم دەدا بە سەربەستی،دەمووت من ئامادەم لە ڕێی سەربەستیما بمرم،بەلاّم لە سەربەستی،گەیشتمە دۆزینەوەیەکی گەورەو ئیسپات بو سەربەستی لە ئەنجامی ڕژێم دایە. ((وێڵ دیۆرانت))

❖لە بەرزترین و نزم ترین کۆمەلاّ ئافرەت،تەنها بۆ ڕابواردنە. ((تۆڵستۆی))

❖لەو شوێنەی ژیان هەبێ،دژواریش هەیە. ((شۆبنهاوەر))

❖لە جیهاندا،هیچ خۆشییەك نی یە وەك خۆشی دایك کەدەبینێ کوڕەکەی سەرکەوتووە. ((ڕیشتند))

❖لە هەر جێگایەك سەربەستی هەبو، نیشتمانیش لە وێدایە.

❖لە (بەرنارد شۆ)یان پرسی چۆن دەتوانی لە نووسنەکانتا خەڵکی وا لێ بکەی کە پێکەنن، وەڵامی دایەوە وتی :

چونکە ڕاستی دەنووسم.

❖لەم ڕۆژەت، وانەیەك وەرگرە، بۆ سبەینێت.

❖لام گرنگ نی یە،هەموو پردەکانی دووام بسوتیّ چونکە من یاد لە گەڕانەوە ناکەم.

❖لە سەیری هەندێ کەس ئەوەیە دەخوێنن بە بێ بیر کردنەوە،یا بیر دەکەنەوە بە بێ خوێندنەوە.

❖لە ژن هێناندا،دوو ڕۆژ خۆشە، ئەو ڕۆژەی کە دەچیتە قەفەسەکەوە و ئەو ڕۆژەی کە دەردەچی. (مۆریس ووساکس))

❖لە وێدا چەن کاتێك هەیە، بەختت لە هەموو شتێکا سەردەکەوێ،پێویستیشە نەترسی،هەموو شتێکیش کۆتایی هەیە. ((گۆڵ ڕوونار))

❖لە ڕاست ووتندا،ئازا نەبێ، لە درۆ دا ئازایی نی یە. ((وێژەی عەرەب))

❖لە وێدا چەن شتێك هەیە،دانی پێدا نانێن،بەڵام لە کردنی پەشیمان نین.

((بیێر دو بویتۆ)

❖لە وێدا خەڵکێك هەیە،خۆشەویستیان نەدەکرد،ئەگەر خۆشەویستیان نەبیستایە.

((لاروشنکو – ١٦٦٥))

❖لە هەندێ هەڵەی ئافرەت دەبورین،بە مەرجێك لە بەردەممانە بە تەواوی ڕووت بینەوە. ((گۆڵ ڕوونار))

❖لە گەڵ پیاودا ئیشەکە ترسناکە،بەڵام بەبێ پیاو،خراپتر((گۆرانییەکی‌ماری دویایە،ساڵی ١٩٣٩))

❖لە سەرخۆو هێمنی و ڕێزگرتنی خەڵکی، پەیژەیە بۆ سەرکەوتن. ((شکسپیر))

❖لە خۆ بایی بو،ماڵ وێرانی بە دووادەیە. ((جۆن هیود))

## - م -

❖ماندو، لە سەر سەرینی بەرد دەنوێ و حەساوەتەوە،بەڵام ئەو تەمەڵەی كە حەسانەوەی دەوێ لە سەر سەرینێكی پەڕیش ناحەسێتەوە. ((شكسپیر))

❖مردن، لەگەڵ ڕاستیدا چاكترە،لە ژیانی درۆزنی. ((ئەرستۆ تاڵیس))

❖من،شكات لە كورتی ژیان دەكەم،چونكە ئەو كاتە نادۆزمەوە كە بتوانم خۆشەویستم و هەستم،پێشكەش بە ژمارەیەكی باش بكەم. ((مارگۆت ئەسكوێت))

❖مێوەی گەیو،هەمیشە لە سەرەوەی دارەوە دەبێ. ((عەرەب))

❖من هیچ هەوڵی دەس بازیم نەدا لە گەڵ ئافرەتا،بەڵام ئەوان قبوڵیان كرد.

((سكۆتێنیر ١٩٤٥))

❖مرۆڤـ،چەند بێدەسەڵاتە،ئەگەر نەیتوانی لە نرخی خۆی بەرز كاتەوە. ((دانیال))

❖مندالّی،ماوەیەكە لە تەمەن، كە مرۆڤـ بە بێ بەرپرسیاری دەژی و لە سەر حیسابی خەڵكی تر.

❖من،پیاوان لە یەك دەكەمەوە،بە ئەقڵم، نەك بە چاوم. ((سنیكا))

❖مرۆڤـ بە بێ زانیاری، وەكو گوڵێكی بێ بارانە.

❖مەیەڵە زمانت سەرت ببڕێ.

❖مرۆڤـ،بە ئازادی لە دایك دەبێ،بەڵام لە هەموو شوێنێك بەزنجیر كۆت كراوە

((جان جاك ڕۆسۆ))

❖مرۆڤـ، نەگۆشتی دەخورێ و نەپێستی لە بەر دەكرێ،ئیتر چی تری هەیە لەوە زیاتر كە زمانی خۆش بێ. ((تورك))

❖ماف،كارێكی هەمیشەییە و بەردەوامە نەك ئەمڕۆ،بەڵكو هەتا هەتایە،بەڵام هێزو توانا كارێكی كاتییە و لە گەڵ بارو دۆخ دا دەگۆڕێ. ((جان جاك ڕۆسۆ))

❖مێشكت بە زانست زاخاودە،نەك لە شت بە مرواری برازێنیتەوە.

❖ مانای ناوداریّتی چییه ؟ئایا دەریایه به کەفەکەی دەنازیّ؟ئەم جۆره ناوداریيه،کەفیّکی بلاّوبووەوەیه له ژیاندا. ((تاگور))

❖ مەلّیّن ڕۆژنامەکان ڕەخنەمان لیّ دەگرن، بلّیّن بۆچی هەلیان بۆ ڕیّك دەخەین کە ڕەخنەمان لیّ بگرن. ((سەعد زەغلول))

❖ مرۆڤی گەشبین،له هەموو شتیّکا ڕەنگی سەوز دەبینیّ،بەلاّم مرۆڤی ڕەش بین له هەموو شتیّکا ڕەنگی سوور دەبینیّ، کە ئەویش ڕەنگی مەترسییه،مرۆڤی ژیر نەخۆشی کویّری ڕەنگی هەیه.

❖ مانگی نیسان،مانگی خۆشەویستی و درۆیه. ((فرانسواز ساگان))

❖ ماچ،ئەو پەیمانه ڕوحییەیه کە له نیّوان دوو دلّدا لیّوان مۆری دەکەن.

❖ ماچ،چرپەیەکە،بە هەلّە ڕیّگەی گویّی گرتە بەرو لەسەر لیّو ئارامی گرت.

❖ ماچ دۆزینەوەیەکی جوانه،له جیهانی دلّداری دا.

❖ مرۆڤ،چەندە بیّ ئەقلّە،له میوانخانه داوای خزمەتی مالّ دەکا له مالّیش خزمەتی میوانخانەی دەویّ. ((ئان ئادفر))

❖ من، چاوەڕوانی مردن ناکەم،چاوەڕوانی کاریّکی نەکردە دەکەم بۆ ژیان بمگیّڕیّتەوە.

((ئەنگرید بیّرگمان))

❖ میّردی لالّ و ژنی کویّر،بەختیار ترین ژن و میّردن. ((دەنیمارکی))

❖ من ئارەزوویی خۆشەویستی بیّ هیچم نی یه.

((کچە دەولّەمەند دولو نففیل — ١٦١٦ — ١٦٧٩))

❖ ماچ،وەکو خاردنیّکی خۆش دەواسی نی یه. ((جۆرج میریدیت ١٨٢٨— ١٩٠٩))

❖ مردن،له گەلّ ڕاستیدا چاکترە، له ژیانیّکی درۆ. ((ئەرستۆ تالیس))

❖ مرۆڤ،دان بە هەلّە کۆنەکانیدا دەنیّ،بۆ ئەوەی ڕیّگە بە هەلّە تازەکانی بدا

((ئەدەلۆف دو دیتۆ))

❖مانگ،تریفەی هەیە،بەلأم گەرم ناكاتەوە. ((وێژەی ڕوسی))

❖نهێنی بەختیاری پێنجە، سامان،سامان،سامان،سامان،سامان. ((ناپلیۆن))

❖نەكەی هاوڕێتی خراپە بكەیت، چونكە وەكو شیری هەلّكێشراو وایە.

❖ناوی چاكە،لە زنجیری زێڕ،چاكترە. ((وێژەی ئینگلیز))

❖نەقەرز دەكەم، نەقەرز دەدەم،قەرز كردن ڕێگەیەكی بۆ وێران كردن.

((شكسپیر))

❖نهێنیت بە یەك كەس بلّێ و هەزار كەس پرس بكە.

❖نان و خۆشەویستی،جیهان دەجولّێنن. ((شیلەر))

❖نازناو،ناودارێتی ناداتە خەلّكی،بەلّكو خەلّكی ناودارێتی دەداتە نازناو.

((میكافیلی))

❖بلّێ،كـــێ هەیە،بـــە ســـەركەوتنی برادەرەكـــەی حەســـوودی نـــەبردووە.
((ئەسخیلۆس))

❖بە گورگیان وت :چیتە وا لە سەگ زیاتر ڕادەكەی ؟ ووتی :من بۆ خـۆم ڕادەكـەم و ئەو بۆ خاوەنەكەی ڕادەكا. ((ئیبن ولجەوزی))

## - ن -

❖نارەحەتیت لەوە نی یە،کە کوێر بیت،بەڵکو نارەحەتیت لەوە دایە،کە بەرگری کوێرێتی نەگری. ((میلتۆن))

❖نامۆ،ئەو کەسەیە، کە دڵداری نەبێ.

❖ناتوانین شتێکی گرنگ لە پەڕەی گوڵ دروست بکەین. ((وێژەی ئەڵمان))

❖نهێنی خۆت،بە خزمەت کارەکەتیش مەڵێ. ((یابانی))

❖نهێنی سەرکەوتن کەس نایزانێ،تەنها ئەوانە نەبێ کە سەر نەکەوتون

((مارسێل نەشار ١٨٦٢))

❖ناشرینی،ئەو شتەیە،کە سەر دەکەوێ بە سەر جوانی دا،چونکە هەمیشەییە.

((دانیال موسا ١٩٦٣))

❖نهێنیەکانت،دیلتن،ئەگەر باسیانت کرد،تۆ بە دیلیلن دەبی. ((ئیمام عەلی))

❖نموونە هێنانەوە،شتێکی تازە نی یە،بەلاَم هەمیشە بە نرخە.

((گۆستاف فلۆبیر))

❖ناوداریتی، بەری هەوڵدانە. ((ڕێلندز ))

## - س -

❖سکی دایك،باخچەیەکە، هەموو جۆرە میوەیەك دەگرێ. ((وێژەی ئەسپانی))

❖سەربەستی مرۆڤـ،لە ژیانی باشترە.

❖سێ شت تووشـی سـێ شـتت دەکا،جوڵانەوە،دەوڵەمەنـدت دەکا،تەمـەڵی هـەژارت دەکا،زۆر خواردن،تووشی نەخۆشیت دەکا.

❖سامانی مرۆڤـ،لە گەڵیا ناچێتە گۆڕەوە. ((تیفۆنس))

❖سامان دەسەڵاتێکە،هێز دەدا. ((هوراس))

❖سەبر کردن،دەرمانی هەموو ئیشێکە. ((بیلیوس))

❖سێ کەس شەڕ دروست دەکەن،ترسنۆك،لە خۆبایی بو،ئافرەتی تەڵەکەباز ((ئەدگار ئالان بۆ))

❖سەرکەوتن حاڵەتێکە، ئارام نازانێ. ((سنیکا))

❖ڕامیاری،دەریایە،سیاسیش ئەو کەسەیە مەلەی تێدا بکاو نەخنکێ.

❖سـامان زبڵە،ئەگـەر هـەر کۆبکرێتەوە،بـە زبڵـی دەمێنێتەوە،ئەگـەر بـڵاوت کردەوە،بەپیتو بەرەکەت و بەرهەمی دەبێ.

❖سامان بە جۆرێك قسە دەکا هەموو کەس لێی تێدەگا. ((ئەقرابین))

❖سێ شت باوەڕی پێ ناکرێ،تەندروستی ئەسپ و قسەی ژنان و هاوڕێتی منداڵ. ((ئینگلیز))

❖سەربەستیش،پێویستە تا ڕادەیەك بێ، تاکو بتوانی زاڵ بـێ بـە سـەریا.((ئەدمۆنـد بێرن))

❖سێ جۆرە پیاو، لە ئافرەت ناگەن،لاوەکان،پیرەکان،پەك کەوتووەکان. ((ئیرلەندی))

❖سەر شۆڕی، بۆ ڕاڤە (تجربه)نەوەك تێپەرت کا. ((ئەدوار هەبۆ))

## - ش -

❖شتێكی كە،دەبێ هەموو ژن مێردێك كۆ بكەنەوە بۆ پاشە ڕۆژیان،ئەویش خۆشەویستیانە.

❖شەهید بوون لە ڕێی نیشتماندا،لە دایك بوون و نەمرییە.

❖شەیتانیش دڵداری بكا،لە شەڕۆ ئاژاوە دوور دەكەوێتەوە.

❖شەرمی كچ، لە خۆشەویستیدا،وەكو ئازاری وایە، بە یەك جار هەستی پێ ناكا.

((كودیریلوی دولاكلۆ ١٧٨٣))

❖شەیتان،لە پشتی دەرگاوە بێت،قفڵی پەنجەرە هیچ سوودی نی یە. ((كستلۆ))

## - ع -

❖عەیب نی یە لە شتێكا سەرنەكەوی،عەیب ئەوەیە جارێكی تر هەوڵ نەدەی.

❖عەرەبێكم بینی، تەمەنی گەیشتبووە سەرد و بیست ساڵ پێم وت،چی تەمەنتی درێژ كردووە ؟ وتی وازم لە حەسوودی هێناوە،بۆیە ماوم. ((ئەسمەعی))

❖عەیب نی یە، لە سەر خۆ سەركەوی، عەیب ئەوەیە بە پەلە بكەویت.

((عەباس ئەلعەقاد))

## - ف -

❖فرمێسك چەكی ئافرەتە،ئەگەر زەردەخەنە خیانەتی لێ كرد.

❖فرمێسكی ڕاستی ژن،جوانترە لە زەردەخەنەی.

❖(فەلسەفە)چییە؟ هونەرێكی هەڵگرتنی ئازارەكانی خەڵكییە.

((ئەلكۆنتس دیان -١٨٩٥))

❖ فلان كەس دەیووت (نامەی دڵداری پێویستە بنوسرێت) چونكە لە وێدا چەن شتێك، ناتوانی بەدەم داوای بكەی لە دڵدارەكەت،بۆ نموونە پارە.

((هەنری دورینییە ١٩٢٧))

❖فرمێسكی ئافرەت،هەڵت نەخەڵەتێنیێ،چونكە چاوی بە گریان ڕاهێناوە.

((فیكتۆر هوگۆ))

❖فێری قسە بە،پێش ئەوەی گۆرانی بڵێی. ((وێژەی ئینگلیزی))

❖فرمێسكی ئافرەت،بەڵگەیە بۆ هێرش بردن بە سەر پیاودا. ((بسمارك))

## - ق -

❖قورسترین جۆری مردن،ئەو مردنەیە،كە مرۆڤـــ لە ناو كفنی لە بیر چونەوەدا بێت و لە قەبرێكدا بێت ناوی دڵداری بێ.

❖قسە كردنت باشتر بێت لە بێدەنگیت،ئەگینا بێدەنگ بە. ((ناپلیۆن))

❖قسەی چاك،زمان ناڕوشێنێ. ((فەرەنسی))

❖قوماشی كۆن، لە هی تازە زووتر دەسووتێ. ((وێژەی ئەڵمانی))

❖قسەی ڕاست،پێویست بە سوێن خواردن ناكات. ((تورك))

## - ت -

❖تەماع،هەموو شتێك وون دەكا،چونكە تەماع كار دەیەوێ،هەموو شتێك قووت بدا.
((لافۆنێن))

❖توڕە بوون وەكو گەردەلوول وایە،هەوەڵی شێتیەو دووایەكەشی پەشیما نییە.

❖تاجی پادشان،لە زێڕە،تاجی كچیش لە ئەدەب دایە.

❖تۆ چاكە بكە،با خەڵكی چی دەڵێ بڵێ. ((ئینگلیز))

❖تەمەڵ،حەزی لە گوێز خواردن هەیە،بەلاّم حەز ناكا خۆی ماندوو بكات بە شكاندنی توێكڵەكەیەوە. ((تورك))

❖تەمەڵ،برای سواڵكەرە. ((عەرەب))

❖تەمەڵی،تاوانێكی گەورەیە. ((ڕۆزفلت))

❖تاوانی حەسوود،خۆیەتی. ((عەرەب))

❖تەڵەكەبازی،دوور نی یە جارێك سوودی لێ وەرگری،بەلاّم ڕاستی هەمیشە سوودی لێ وەردەگری. ((ئینگلیز))

❖توڕە بوون،شرینە و بەرەكەی تاڵە،ئامۆژگاری تاڵە و بەرەكەی شرینە.
((عەرەب))

❖تەنها لە كۆشی دایكما نەبێ،ئاسودە نەبووم. ((سوقرات))

❖تیژترین چەكی ئافرەت،فرمێسكێتی. ((جرۆجی))

❖توڕە بوونی نەزان لە قسەیایەتی و توڕە بوونی ژیریش لە ئیشیایەتی.
((ئەلموتنەبی))

❖تەنها ڕووی جوانم خۆش دەوێ،چونكی ڕووی ناشرین دەستكردی خوای جوان نیە.

❖تیمساح بە هاوڕێ مەگرە،ئەگەر فرمێسكیشی لێ ڕژا. ((چینی))

❖تەماعی ئافرەت لە پلەكەیدا ناوەستێ و ڕازیش نابێ هیچ كاتێك،ئەگەر هاتو هەموو سامانی زەوی هەبو،داوای سامانی ئاسمان دەكات.

❖تەنها ئافرەت فێری كردم، ئافرەت چییە.

❖تف مەكە بیرەوە،چونكە ڕۆژێك دێت ئاوی لێ بخۆیتەوە. ((ڕوسی))

❖تۆ جوان بە،دونیاش بە جوانی دەبینی. ((ئیلیا ئەبو مازی))

❖ترس، چاوی كراوەی هەیە. ((ڕۆسی))

❖تەماشای دایك بكە و كچ بخوازە. ((هەنگاری))

## - ح -

❖حەوت ساڵ بگەڕێ،ئەمجا باوەڕ بە هەواڵێك بکە. ((یابانی))

❖حەوت کەس خەفەت لێیـان ناگەڕێ،هـەژارێکی تـازە دەوڵەمەند،دەوڵەمەندێك کـە ترسی لە ناو چونی ماڵەکـەی هەیە،نەخۆشـێك بـە بـێ نوژدار،یـەکێك کـە ژنەکـەی خـۆش دەوێ،ئەویش خیانەتی لێ دەکا،حەسوود،کینە و ڕقاوی.

❖حەسوود،هیچ ئاسودە نی یە،مادام یەکێ لەو بەرز تر هەیە. ((شکسپیر))

❖حەسوود،خۆی دەخوا، چۆن ژەنگ ئاسن دەخوا. ((ئەرستۆ تالییس))

❖حەسوود،ناحەوێتەوە،تاکو لە وێدا لەو بەرز تر هەبێ. ((شکسپیر))

حەسوودی، وەکو بلێسە وایە،ئەوەی لە سەرەوەی هەیە،ئەگەر نەیسووتێنێ ڕەشی دەکا. ((یۆلیۆس قەیسەر))

❖حەسوود،لاوازو لەڕ دەبێ،کە ببینێ هاوسێیەکەی قەڵەو بووە. ((ئینگلیز))

## - خ -

❖خوا، ئافرەتی،درووست كردووە،تەنها بۆ ئەوەی پیاو ماڵی بكا. ((فۆلتێر))

❖خراپترین شت كە ئافرەتی پێ تورە دەبێ،ئەوەیە بڵێی پیری. ((ئارستۆ))

❖خەفەت،لە مرۆڤـ دیار نادا،ئەو كاتە نەبێ كە هەوڵی ئەوە دەدا بیشارێتەوە.

❖خەڵكی،ماسییە،گەورەكانیان بـچووكەكان دەخـۆن و بـەهێزەكان،بێ هێزەكـان دەشكێنن.

❖خۆشەویستی،بەزوویی بریقەی لە چاودا دیار دەبێ.

❖خۆشەویستی،جوانترین ئاوازە لە ژیان دا.

❖خۆشەویستی مۆمێكە،لە شەوی ئەویندارانا ڕووناكی دەدا.

❖خۆشەویستی،لە دوو لاوە،تاجی بەختیاریە. ((میلتۆن))

❖خۆت دوورخە،لە ڕق و كینە،چونكە ئەو ئاگرە و تۆ دار.

❖خۆشەویستی، ژیانی ئافرەتە، ئافرەتیش ژیانی پیاوە. ((ئۆسكار وایلد))

❖خەڵكی فێر بوونە نەفرەت لە زروفی ژیانیان بكەن،منیش باوەڕم بـە زروف نـی یـە چونكی خەڵكی خۆی دروستی دەكا. ((بەرنارد شۆ))

❖خۆشەویستی گەورە لە جیهاندا هێزە،لە گەڵ ئەوەشدا زۆر لێبوردەیە. ((گاندی))

❖خۆشەویستی كچ زەمبەلەك و ئاوە و بەبێژنگیا دەكا. ((یۆنانی))

❖خراپترین عەیبمان ئەوەیە كە زیاتر گرنگی بە عەیبی خەڵكی دەدەین.

❖خێر،لەو برادەرییە نی یە، ئەگەر بنچینەی مەبەست بێ.

❖خـەڵكی لـە كونەكانـەوە سـەیری نـاو ماڵەكـەمیان كرد،عـەیبو عارمیـان دەرخست،پێویستە پەنجەرە و دەرگایان بۆ بكەمەوە،بۆ ئەوەی من چۆنم،وام ببینن،نـەك وەك ئەوەی بە خەیاڵیاندا دێت. ((ڕۆسۆ))

❖خۆشەویستی ڕاستی تەواو نی یە،ئەو کاتە نەبێ،کە ئەوەی خۆشمان دەوێ بەختەوەر دەبێ. ((هیلۆین))

❖خۆشەویستی ئافرەت..هۆی بەردەوام بوونی دونیایە. ((ئاتووت))

❖خۆشەویستی،لە دڵی ئارفەت دەرناچێ،تەنها خۆشەویستیەکی تازە نەبێ. ((بلزاك))

❖خۆشەویستی ماوە وەردەگرێبۆ ئەوەی بچێتە دڵی ئافرەتەوە،بەلاّم لە گەڵ پیاو دا هێرش دەباتە سەری و دەچێتە دڵیەوە بەبێ ماوە دان،ئەمەش کارەساتمانە. ((بەرنارد شۆ))

❖خۆشەویستی،باوەڕێکە،ئافرەت لە چاوی پیاو وەری دەگرێ،ئەمەش ئەو شەڕەیە،کە دەبێتە هۆی ئازاردانی ئەو بریندارانە. ((ستەندال))

❖خۆهەڵکێشان،جۆرێکە لە کەرایەتی. ((هەنری دوفرنوێ ١٩٢٤))

❖خیانەتی ئافرەت،دەم و چاوی تێك نادات. ((ئەناتۆڵ فرانس ١٨٩٣))

❖خۆشەویستی،هەست و نەستێکە،لە چاوەوە دەچێتە دڵەوە،بەلاّم پاشان لە ژێر سکەوە دڕێژێ. ((قەسیدەیەکی ماتۆران ڕێنییە ١٥٧٣-١٦١٣))

❖خراپەیەك،ڕات دەکێشێت بۆ خراپەیەکی تر. ((شکسپیر))

❖خوا لە گەڵ هێز دا نی یە، بەڵکو لە گەڵ ڕاستیدایە. ((ڕوسی))

❖خۆش باوەڕی لە لای ئافرەت سنووری نی یە،چونکە وا هەست دەکەن تەنها خۆیان باشترین درۆ دەزانن. ((جاك ناتاتسون ١٩٢٢))

❖خراپەی برادەرەکانت لە بیر بکە،خۆشەویستییان بۆت بەردەوام دەبێ ((عەرەب))

❖خراپترین کەس ئەوەیە،کە خەڵکی لە ترسی ئازار دانی،ڕێزی بگرێ. ((سوکرات))

❖خراپترین دڵداری،دڵدارییەکی بێ هیوایە،ڕاسترین دڵداری دڵدارییەکی بێ هیوایە.

❖خۆزگە هێزی ئەوەم هەبوایە و بمتوانایە،دڵدارییەکەتم پەسەند کرادیە،یاقبوڵم بکردایە.

❖خۆشەویستی،هەستێکی مرۆیی پیرۆزە،خەڵك بەیەکەوە دەبەستێ و بەختیاری دەدات

((کرستوفەر))

❖خۆشەویستی تەنها تەماشا کردن نی یە،بەڵکو هەردووك دەبێ بۆ یەك جێگا تەماشا بکەن.

((شکسپیر))

❖خۆشەویستی دەریایەکە،قوڵایی نازانین،ئەو کاتە نەبێ،کە شەپۆلەکەنی دەمان با

❖خۆشەویستی بەبێ ئەمەکداری،وەکو دارێکی بێ گەلا وایە.

❖خۆشەویستی، مەرهەمی دڵە.

# بەشی پێنجەم

## پێشەكی

ئەی خوێنەرانی ئازیزو خۆشەویست ئەوا بەشی پێنجەمی ( ووتەكانی ژیان )كەوتە بەر چاوی ئێوەی ئازیز هیوادارم جێی ڕەزامەندیتان بێت.

هەروەكو لە كتێبەكانی تردا وتوومە ئەم ( ووتانە )هی گەورە پیاوانی جیهانە، مەرجیش نیە هەر كەسێك شتێكی وتووبێ ڕاست بێت.

داوای لێبوردن دەكەم ئەگەر كەم و كوڕی هەبێت یا هەندێ جار ئەگەر ( ووتەیەك )دووبارە بوبێتەوە.

محمد عبدالرحمن زەنگنە

هەولێر ١٩٩٦

## - ئە -

❖ ئـەو ووشـانەی کـە ژن بـە چـاو دەیڵێن،پێویـستی بـە چـەندها (قـاموس)هەیـە،بۆ لێکدانـەوە. ((س٠ص٠ع))

❖ ئەوەی کتێبی سوود لە ناو بەرێت،وەکو ئەوە وایە کە پیاوێکی کوشتبێ. ((ملتون))

❖ ئەو کەسەی بە شمشێر نەمرێت،هۆزەرو مردنیشی یەکە.

❖ ئەگەر توند تیژی یاسای مرۆڤایەتی بێت،ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کە پاشە ڕۆژ بۆ ئافرەتانە. ((گاندی))

❖ ئەگەر ئافرەت ڕقی گرت،دەبێتە خەتەرترین چەك تەنانەت لە ئەتۆمیش.

❖ ئەگەر داهاتی ئەمڕۆت کەم بوو،تا بەیانی سەبرکە،دورنیە نیگبەتی زەمانە لە سەرت لابچی.

❖ ئەگەر پیاوێکت فێر کرد تۆ یەك کەس فێر دەکەیت ئەگەر ئافرەتێکت فێر کرد، تۆ خێزانێك فێر دەکەیت. ((فان هەست))

❖ ئەگەر کەلو پەل پەسەند بوو،کڕیار کوێر دەبێت. ((ووتەکانی حەبەشی))

❖ ئەگەر ئیشەکانت،بەهەمان جۆرە کە پێش دە ساڵ دەتکرد بزانە کە بە کەڵکی ئێستاکە نایەت،بۆ ئیشێکی تر بگەڕێ. ((مارك تۆپن))

❖ ئەوەی بە خواردن تێر نەخوات،بەلێسانەوە تێر ناخوات. ((ووتەکانی بەلجیکی))

❖ ئەگەر جوانی بێتە هۆی خۆشەویستی،بەلاَم بەزەی دەیپارێزێت. ((بەلزاك))

❖ ئەو پارەیەی کە لە بـەر دەسـتدایە ئـەوا ڕێگایـە بـۆ سەربەسـتی،بەلاَم ئـەوەی هەوڵی بۆ دەدیت ڕێگایەکە بۆ کۆیلایەتی. ((جان جاك ڕۆسۆ))

❖ ئەو ئافرەتەی خۆشەویستی دەكات هەڵی مەسێنە لە خەونەكەی،نەوەك بگەڕێتەوە بۆ ڕووداوە تاڵەكەی. ((مارك تۆین))

❖ ئێمە دەكەوین بۆ ئەوەی هەڵسینەوە،لە شەڕدا دەشكێین بۆ ئەوەی سەركەوتنێكی باشتر بە دەست بێنین،بە تەواوەتی وەك و دەخەوین هەڵسینەوە بەهێزێكی باشتر.

❖ ئەگەر ڕەخنەی دوژمنان و گلەییان نەبوایە،سەرنەدەكەوتم لە زۆر ئیشما ،ئەگەر ناڕەزای ئەوانیش نەبوایە هەر سەرنەدەكەوتم. ((ڕیشیلۆ))

❖ ئەگەر گوڵت دەوێت نابێ لە دڕكەكەی بێزار بیت. ((تورك))

❖ ئەوەی بەزەیی بە ئاژەڵێكی بیدەسەلاَتا نەیەت،ناتوانێ بەزەیی بە مرۆڤ دابێت. ((ئەبرەهەم لینكۆلن))

❖ ئەو دڵدارییەی،كۆتایی بێ،هیچ ڕۆژێ لە ڕۆژان دڵداری نەبووە.((ئەرستۆ))

❖ ئەی ئافرەت،ئاگاداری ئەم پیاوە بە كە دەڵێ،لە تۆ زیاتر كەسم خۆش ناوێت. ((یالیر))

❖ ئەو كەسەی یاد لە تۆڵە سەندنەوە دەكاتەوە،برینەكانی كراوە دەبن و خوێنی لێ دەتكێ. ((بیكۆن))

❖ ئەگەر ئاگرت وویست لە خۆڵە مێشدا،بۆی بگەڕێ. ((ئەڵمانی))

❖ ئەوكاتەی ئافرەت گریا،پیاو بەرهەڵستی نامێنێت. ((شكسپیر))

❖ ئەو دڵەی گوشێنەری خاوەنەكەی بێت،ناتوانێ جێی خۆشەویستی خەڵكی تیا بێت. ((ئەنتوانی چیخۆف))

❖ ئەوەی ڕێگای دوور دەبڕێ بۆ ئافرەتێك،یا هەڵخەڵەتاوە یا هەڵدەخەڵەتێت، ئەگەر بە لاوی كات وون بكەیت لە پیریدا كات وون دەكات. ((شكسپیر))

❖ ئەوەی كە بە توندو تیژی دەتەوێت،بە زەردەخەنە دەستت دەكەوێت. ((سێوار))

❖ ئەوەندە،خۆت،خۆت هەڵدەخەڵەتێنی،خەڵك هەڵت ناخەڵەتێنیٚ.((گرینبل))

❖ ئەگەر ژنێكی ژیرو جوانت هەبوو، تۆ دەوڵەمەندترین پیاوی لە جیهاندا.

❖ ئەوكەسەی بە وەفا بیٚ،خەڵكی لێڕازی دەبێت،ئەوەی بیٚ وەفا بیٚ دووژمنی زۆر دەبێت. ((فەرفۆریوس))

❖ ئەوەی برادەری دەداتە دوواوە،پێویستە هەوڵبدا،برادەری تر پەیدا بكا و جێی ڕەزامەندیان بێت.

❖ ئەگەر ئازایەتی لە ڕاستی دا نەبێت،لە درۆدا نیە. ((عەرەب))

❖ ئەو كەسەی دەیەویٚ كچێكی خۆش بوویٚت،پێویستە یەكەم جار دایكی ڕازی بكات. ((جۆن رای))

❖ ئەو ژنەی كە گاڵتە بە مێردەكەی دەكات،گاڵتە بە خۆی دەكات،چونكە هەڵی بژاردووە.

❖ ئەی دڵداری هیچ شتیٚ بەرگریت ناكا،تۆ هەموو شتیٚ لە چوار دەورت دەماڵی. ((سۆفۆكلیس))

❖ ئەو دەستەی ملوانكی دڕك دەهۆنێتەوە،لەو دەستە باشترە كە تەمەڵە.
((جوبران خەلیل جوبران))

❖ ئەوەی بە منداڵی ئەدەبی منداڵەكەی بدا، لە گەورەیدا پێی پێخۆشحاڵ دەبێت

❖ ئەوەی درێژە بە وانەكانی نەداو پێوە ماندو نەبێت،ناگاتە ئەنجامی زانستی.

❖ ئەو كەسەی منداڵەكەی بە هەردوو دەست هەڵگریٚ، دایكەكەی لە دڵدا هەڵدەگریٚ. ((دانماركی))

❖ ئەو ڕۆژە كەتێیدا پێناكەنی،ئەو ڕۆژەت وون كردووە. ((فەرەنسی))

❖ ئەو شتەی كە پێوستە لێی بترسی،ترسە. ((ئەمەریكی))

❖ ئەو كەسەی بە تەمای خراپەیە، لە پێش هەموو كەسێكەوە توشی خراپە دەبێت. ((ئەڵمانی))

❖ ئەگەر هەتاو دەرچوو ئەوکاتە جلەکانت ووشك بکەرەوە. ((فەرەنسی))

❖ ئەگەر بە قسەی دایکت نەکەی،بەقسەی باوەژنت دەکەیت. ((ئەلمانی))

❖ ئەگـــــــــەر ســـــــــــەر فرزابم،قەلـــــــــــەڕەش بم یـــــــــــا (حەسوود)بم،قەلەڕەش،هەلدەبژێرم،قەلەڕەشیش گۆشتی مردوو دەخوا،بەلام حەسوود گۆشتی زیندوان دەخوات

((ئەنجیفۆس))

❖ ئەگەر ڕاڕای نەبوایە،هونەر ئەویندارى دەمرد.

❖ ئێمە سەربەستیمان خۆش دەوێت،بەلام زیاتر خۆشمان دەوێت ئەگەر لە جێی خۆیدا بەکار بێت. ((شۆپنهاوەر))

❖ ئەگەر هەلەکانمان بخوێنینەوە،ئەوا ڕێگامان کورت کردۆتەوە بۆ ڕاستی.

((ژیربگ))

❖ ئەگەر ویستت لە خۆشەویستیدا سەکەویت،دلت بەرامبەر ئەو ئافرەتەی خۆشت دەوێت دایخە. ((شۆپنهاوەر))

❖ ئێمە زۆر کەم دەزانین لە هەموو شتێك،لە ئەرز،لە ئێوارە،لە ڕابردوو و لە ئێستا،لە داهاتوو. ((داروین))

❖ ئەو کەسەی کە خۆی لە قەدری خۆی زیاتر بەرز کردووە،ناگاتە تەواوی تەواویەکەی. ((ئەلفارابی))

❖ ئەو میللەتەی بۆ یەك کات ژمێر مافی ئیسپات دەکات باشترە لە وەی کە بە درێژای تەمەن بەزەلیلی بژی. ((جەمالەدینی ئەفغانی))

❖ ئەو زەرەرەی کە هەموو دونیا ئەقلْ قازانجی لێ کردووە،ناگاتە ئەوەی کە بە هۆی ئەقلەوە زەرەری کردووە. ((براتراند رسول))

❖ ئەو پیاوەی لای بەهێزەکان نەزانی کامەیە،هەدەفێکی ئاسانە بۆ ئافرەت کەلە لاوازەکانی بزانێ. ((شارلی شاپرن))

- ❖ ئەگەر شكاو پێكەنی،سەركەوتوو خۆشی سەركەوتنی نامێنێ. ((شكسپیر))
- ❖ ئەوەی بەكات گاڵتە بكات كات دەی بەزێنێ.
- ❖ ئەگەر بزە خیانەت لە ژن بكات،ئەوا فرمێسك چەكیەتی. ((فرفال))
- ❖ ئیش كردن كانگای زانستە،زانستیش منارەی ژیانە.
- ❖ ئەگەر خەڵكی تەنها ئەوەی دەیزانێ قسەی لە سەر بكەن،بێدەنگی بەڕادەیەك دەگەیشت كە بەرگریمان نە دەكرد.
- ❖ ئەو دەرگایە دامەخە كە ناتوانی بیكەیتەوە.
- ❖ ئەو بەردەی غل بێتەوە،گیا لە سەری ناڕوێ.
- ❖ ئەگەر چاكەت كرد باسی مەكە،ئەگەر چاكەت لە گەڵ كرا باسی بكە.
- ❖ ئەگەر بۆ ساڵێ دەچێنی گەنم بچێنە،ئەگەر بۆ دە ساڵ دەچێنی دار بنێژە، ئەگەر بۆ سەد ساڵ دەچێنی پیاو بچێنە. ((چینی))
- ❖ ئەگەر دڵدارەكان،نیوەی ئەوەی بیر لە یارەكانیان دەكەنەوە،بیریان لە خۆیان بكردایەوە دەوڵەمەند دەبونەوە.
- ❖ ئەوانەی بەدوای خەسارەتیان دا لە قومار دەگەڕێن،وەكو ئەوانە وایە كە لە نێو لمی جو لاوەدایە،هەر كاتێ ویستی سەركەوێت دێتە خوارەوە.
- ❖ ئەو دزەی هەلی دزی بۆ ڕێك دەكەوێت،خۆی بە (ئەمین)دەزانێ ((مەغربی))
- ❖ ئەوانەی چاوەڕوانی هەلن لە ڕاستی دا ئەوانە ونیان كردووە. ((ئیتاڵی))
- ❖ ئەوەی زیاد ئازار بكێشێت زیاتر فێر دەبێ.
- ❖ ئیش گەورەترین دوژمنی مرۆڤ دەكوژێت،بێزاری و شەڕو هەژاری.((ڤۆڵتێر))
- ❖ ئیش كردن یاری گەورەكانە یاری ئیشی بچوكەكانە.
- ❖ ئەوەی بە پەلە بژی،زیاتر بەجێ دێڵێ لە وەی دەیبا.
- ❖ ئەگەر ئافرەتی جوان مرواری بێت،ئافرەتی بە ئەخلاق كانگایەكە لە مرواری.

❖ ئەوکەسەی لە سەر ئەرزی یەکێ تر خانوو بکا،ئەرزەکەو بەردەکەشی لە کیس دەچێت.
((ئیتالی))

❖ ئەگەر سەرت لە مۆم بوو لە بەر هەتاو مەڕۆ. ((ئەمەریکی))

❖ ئەو مرۆڤەم خۆش دەوێت کە خۆی هەڵکێشێت بە جێگاکەیەوە کە لێی گەورە بووە،مرۆڤێکیش ببینم بژی تاکو جێگاکە خۆی پێ هەڵکێشێ.

❖ ئەگەر لە خۆشی دا بیت بەردەوام نابین،ئەوکاتە نابێ کە خۆشیەکە بشارینەوە.
((شکسپیر))

❖ ئەوەی نهێنی خۆی بشارێتەوە بە ئامانجی خۆی دەگات. ((عەرەب))

❖ ئەگەر سەبر هەبێ،بەختیار دەبێت.

❖ ئەگەر ژیری سەبر بکە،چونکە پەلە کردن ئیشی شەیتانە.

❖ ئەگەر خەفەت بە سەبر نەکوژیت،خەفەت دەت کوژێ یا تۆ و سەبرت یا ئەوو کوشتن.
((هەندێك))

❖ ئەگەر خوا دەرگایەکی داخست،هەزار دەرگا دەکاتەوە. ((تورك))

❖ ئەو دەرگایەیی لە بەردەم هەژاردا دابخرێ،لە بەردەم نوێژداردا دەکرێتەوە
((یابانی))

❖ ئەو کەسەی بزە نەزانێت پێویستە فرۆشگا نەکاتەوە. ((چینی))

❖ ئەو ئافرەتەی دوو پیاوی خۆش ویست هەر دوو کیان هەڵدەخەڵەتێنی.
((پورتوگالی))

❖ ئەگەر ویستت شتێك بکەی پێویستە بیری لێبکەیتەوە.

❖ ئەگەر دەتەوێ بە خۆشی بژی،ڕازیبە لە خەڵکی کە پێت بڵێن بێ عەقڵی نەك پێت بڵێن ژیری.
((فیتاگۆرس))

❖ ئیش کردن کانگای زانستەو هەزار دەرگا دەکاتەوە. ((تورك))

❖ ئەوەی یەك ڕۆژ مامۆستام بووە،هەتاهەتایە برادەرمە. ((چینی))

❖ ئەوانەی لێرە نین،هەمیشە هەڵەن. ((فەرەنسی))

❖ ئەوەی ڕۆژێ فێرم کا، بە درێژای تەمەنم باوکمە. ((چینی))

❖ ئەو خۆشەویستەی کە هەموو ڕۆژێ هەڵ ئەقوڵێ، هەموو ڕۆژێ دەمرێت.
((جوان))

❖ ئەگەر ویستت لە بگرە و بەردە دا دوژمنەکەت بەلای خۆتدا ڕاکێشی ئاگادار بە تەنگە تاوی مەکە. ((شانۆن فیف))

❖ ئەگەر باران وەستاوە،جۆگەلە ڕوون دەبێتەوە. ((وێژەی تورکی))

❖ ئەگەر لە مەبەستێکدا سەرکەوتی لە سەر خۆبە،خۆ هەڵمەکێشەو خۆ بە گەورە مەزانە. ((سیموندس))

❖ ئەگەر ڕاستی ئافرەتێکی جوانی دروست کرد،هەموو خەڵکی خۆش دەوێ.

❖ ئەگەر دوژمنەکەت لە بیر کردووە تەنانەت ناوەکەیشت نەزانی، تۆ پیاوێکی ژیانت خۆش دەوێت.

❖ ئەوەی تەماع لە هەموو شتێ بکات، هەموو شتێکی لە دەست دەر دەچێ.

❖ ئەوەی گریان نەزانێ پێکەنینیش نازانێ. ((ئیتالی))

❖ ئەگەر لە گەورەیی دەگریی لە بیری بکە،داوای ماف بکە،هەر دووکت دەست دەکەوێت،ماف و گەورەیی.

❖ ئەوەی ژنی نەهێناوە یەکە کەسە کە لە ئافرەت دەگا،چونکە نایخوازێ.

❖ ئەگەر خۆشەویستی گەورەی هەست بێو هونەر گەورەی خۆشەویستیە،بە بێ هونەر خەڵکی نازانێ جیاوازی چیە لە نێوان بەختیاری و ئازاردا. ((احمد ڕامی))

❖ ئەگەر حەسوودی گرانەتا بووایە هەموو کەس تووشی دەبو ((دانیمارکی))

❖ ئەوانەی ڕابوردویان لە بیر چۆتەوە،هیچ چارە نیە دەبێ بگەڕێنەوە ئەو سەر دەمەو تێدا بژین. ((جۆرج سانتایە))

❖ ئەو دارەی سەری لە ئاسمان دەدات،لە تۆیەکی بچووك سەوز بووە ((لاتزو))

❖ ئەگەر ئافرەت لە خۆشەویستیدا درۆ نەکات،توانای بە سەر پیاودا نامێنێت.

((گۆستاف لۆبۆن))

❖ ئەو ئافرەتە چەند جێگەی ڕێزە کە خۆشەویستی،ماچ و بزەو داخ هەڵکێشان بێت.

((هالیپوتین))

❖ ئێمە هەمیشە چاوەڕێ ئەو ئافرەتەین کە خۆشەویستی و بەختیاریمان بۆ دێنێ

((شکسپیر))

❖ ئەگەر لە دونیادا ئافرەت و خۆشەویستیمان نەهێشت،دونیا دەبێتە گۆڕێکی ناخۆش.

((بروانینگ))

❖ ئەگەر پیاو خۆشەویستی کرد،ئەوا وەکو ڕێزی وایە وریابە،جۆراو جۆرە، بەلام ئەگەر ئافرەت خۆشەویستی کرد قوربانی دەدا و مووخلیسەو لە خۆ بوردە.

((جۆرج سەند))

❖ ئەگەر ئافرەتی جوان پەری نەبێت،مێردەکەی لە هەموو کەس زیاتر داماوتر دەبێت.

((جان جاك ڕۆسۆ))

❖ ئەی برادەرم ئاگاداری ئافرەتی جوان بە،کاتێك نەرمو نیانیان دەست پێدەکا ئەو کاتە کۆیلایەتی ئێمەش دەست پێدەکات.

((فیکتۆر هۆگۆ))

❖ ئەی سروشت من هەست بە جوانیت ناکەم،ئەوکاتە نەبێت کە پەنجەی ئافرەتێکی جوان لێت دەکەوێت.

((بیتهوڤن))

❖ ئەی ژن لە بیرت بێ،جوانیت سەربەست و بەرەڵلاییە،تەنها دوو کۆت نەبێت،ئەم دووانەش لەوە جوانترە.٠پاکی و شەرەف.

((احمد شەوقی))

❖ ئەگەر ئافرەت لە جوانی بێبەش بکەیت لە ژیاندا تەنها خۆشی لە نیوەی وەردەگرێ.

((مەدام دیمونتاران))

❖ ئەوەی ژنی نەبێت،لە ژیاندا بەختیار نیە.

((قاسم ئەمین))

❖ ئەو كەسەی بێوەژن دەخوازێ هەمیشە سەرێكی مردوو لە قاپیەكەیدا دەبینرێت. ((وتەیەكی ئیسپانی))

❖ ئەگەر ژیان ئافرەت بووایە،لێی ڕام دەكرد. ((شۆپنهاوەر))

❖ ئەوەی ئافرەت بەجێ بهێڵێت،خەفەت بەجێ دێڵێت ((لوقمان حەكیم))

❖ ئەگەر ژن نەبێت لە هەوڵی ژیانماندا بێبەش دەبین لە یارمەتی،لە نیوەی ژیانشماندا لە خۆشی،لە كۆتایشدا لە نازی. ((جووی))

❖ ئەی ژن تۆ خەونی شەومی و ئازاری ڕۆژمی. ((ئەلفرێدەی مۆسیە))

❖ ئەگەر هەموو جیهان بچوك بێتەوە ئافرەت بەگەورەی دەمێنێتەوە.
((فیكتۆر هۆگۆ))

❖ ئەو ئافرەتەی بە دەستی ڕاستی لانك ڕادەژەنێ،بە چەپی جیهان دەلەرزێنێ.
((ناپلیۆن))

❖ ئەوەی پیاو بە سەد ساڵ دروستی دەكات ئافرەت دەتوانێ بە ساڵێ بیڕوخێنێ
((ناپلیۆن))

❖ ئەوەی هەست بكات لە ئافرەت بە هێزترە،ئەوا تەنها ئافرەتێكی ترە.
((مارتین))

❖ ئەگەر ژن خۆشی لێ وون كردین هەر ئەویشە دەتوانێ بۆمان بگەڕێنێتەوە.
((وەتێر))

❖ ئەگەر ساڵ هەموو ڕۆژی پشودان و یاری بووایە،یاری دەبووە بێزاری وەك ڕۆژانی ئیشكردن. ((شكسپیر))

❖ ئەو لاوەی بەرزنەكاتەوە،سەری شۆڕ دەكاتەوە،ئەو كەسەش داوای بەرزێتی ناكا،ئارەزووی خوارەوەی هەیە. ((دزرائیلی))

❖ ئەگەر خۆمان ڕوح زل نەبین،شكات لە ڕوح زلی خەڵكی ناكەین.

((لارۆ شفۆكۆلد))

❖ ئەقلّ،هەموو شتیّ ڕیّكدەخات،پیّویستە دەستلە ڕیّك خستن هەلّنەگرین.((ئەبیكتیس))

❖ ئەوەی بیری تیژ نەبیّت، با واز لە درۆ بیّنیّ. ((مۆنتانیا))

❖ ئەوەی بەلّیّنی بەجیّ نەهیّنیّت،بەلّیّنی نیە. ((دی بارتاس))

❖ ئەدەب لە ژیری باشترە. ((عەرەب))

❖ ئەوەی یەك درۆ بكات،خۆشی نازانیّ چی باریّكی قورس هەلّدەگریّ،چونكە ناچار دەبیّت بیست درۆی تریش بكات بۆ ئەوەی درۆكەی ئیسپات بكات

((ئینگلیز))

❖ ئەگەر مرۆڤ خۆی هەولّی بلاّوكردنەوەی حەق و خزمەتی مرۆڤایەتی نەكا نابیّتە مرۆڤیّكی ڕوناك بیر. ((ویّژەی چینی))

❖ ئەو كەسەی قسەكانی لە گەلّ كردەوەی خۆی یەك نەبیّت،ئیهانەی خۆی دەكا

((عبدوللاّی كوڕی مەسعود))

❖ ئەگەر جۆگەلە ووشكی كرد لم بەجیّ دیّلیّ،ئەگەر برادەر ڕۆیشت بیرەوەری بەجیّ دیّلیّ.

❖ ئەوەی ولاّتەكەی خۆش نەویّت هیچ ناكا. ((بایە ڕۆن))

❖ ئەی دوژمنی ئافرەت لە بیرت نەچیّ هەموو پیاویّك كوڕی ئافرەتە.

❖ ئەگەر دەس ڕۆبیّت هەموو پیاو،پیاوتە ئەگەر دەست كورت بیی كەس وكارەكەشت ئینكارت دەكەن. ((ئیمام عەلی))

❖ ئەو چەند درهەمانەی كە ڕۆژانە خەرجی دەكەین بەبیّ سوود،دوور نیە ببیّتە سامانیّكی زۆرو ڕۆژی پیّویست بەكەلّكمان بیّت،ئەوانەش كە دەست بلاّون دووژمنی خۆیانن،ئەوكەسەش كە برادەری خۆی برادەی نەبیّ،چۆن چاوەڕوانی یەكیّكی تر دەكا.

((باكۆن))

❖ ئەگەر ڕاستە سوێند بۆ دەخۆی ؟ ((شکسپیر))

❖ ئینگلیز،بەتەنها درووگنیە،بەڵکو هەموو پیاوێکی ئینگلیزی دروگەیەکە.

((نۆڤالیس))

❖ ئیشی قورس تەنها،ئەو ئیشانەیە کە کۆبۆتەوەو نەمان کە ئەو کات پێویست بوو بیکەین.

❖ ئەو کاتەی پێکەنیت و گاڵتەت بۆ خۆ کرد،ئەو کاتە تۆ پێگە یشتووی.

((ئیتیلباریمۆر))

❖ ئەگەر ویستت لە ژیانتا ڕابووێری،پێویستە ئەو شتە بدۆزیتەوە.

((جۆرج سیمس))

❖ ئەگەر ڕەزیل نیوەی دوونیای هەبێت،کەس بە باشە باسی ناکات.

❖ ئەو کەسەی قەناعەتی نەبێت،سامانی نابێت،ئەو پیاوەیش قەناعەتی بێ خێرە.

((هۆمیرۆس))

❖ ئەگەر بەڵگەت هەبوو تووڕە مەبە،چونکە تووڕە بوون ئەو بەڵگەی کە بەدەستەوەیە دەی بڕیو دوژمنەکەت سەر دەکەوێت. ((ئیبن ولموقەفەع))

❖ ئەوەی لە برادەرەکانی واز بێنێ خەڵکیش وازی لێ دێنێ.

((موغیرەی کوڕی شوعەب))

❖ ئەگەر زۆر زۆر باوەڕت بە خۆت هەبوو بزانە کەتۆ هەڵەی. ((دیستۆفسکی))

❖ ئەو کەسەی پشت بە کات ببەستێ زەمان دەیبەزێنێ. ((چینی))

❖ ئەو کەسەی بە ئاسانی هەڵە دەکات،دەتوانێ بە ئاسانی هەڵکەی چاک بکاتەوە. ((فریش بیگۆن))

❖ ئەگەر زۆرم لێکرا جیهان بێنرخ بکەم،بگرەو بەردەم نیە،بەلام منداڵەکەم بێقیمەت ناکەم.

❖ ئەوەی باوەڕی هەبێت کە خۆشەویستی هەموو شتێکە،هەموو شتێك دەکات بۆ ئەوەی بەدەستی بێنێ. ((ملیکان))

❖ ئەخلاق وەکو گوڵ،بۆنی هەیە. ((فەرەنسی))

❖ ئەگەر باران فرمێسکی دانیشتوانی ئەستێرەکانی کە بن بەسەرمانا بباریێ،ئەی ئێمە فرمێسك بەسەر کێدا بڕێژین.

❖ ئەگەر،نەزان هۆی نەزانینەکەی بزانێ،ژیر دەبێت. ((کۆنتێوس))

❖ ئەی قەڵەم چەند جوانی،بەڵام وولاتەکەم لە شەیتان ناشرین تری.

((قەیسەری رۆسپا))

❖ ئەوەی تێکۆشێت دەدۆزێتەوە،ئەوەش بچێنێ دەدۆزێتەوە.

❖ ئەگەر قسە زیو بێت،بێدەنگی زێڕە.

❖ ئەوەی چاڵ بۆ برادەرەکەی هەڵکەنێ،خۆی تێدەکەوێت.

❖ ئەو ئافرەتەی تەمەنی تێپەڕ کردبێ و شووی نەکردبێ،هەمیشە دەڵێن ئێمە پاکین،بەڵام ئایا لە خۆیان پرسیوە چ جۆرە پاکیەك و تاکو ئێستا لە خۆشی ژیان دواکەوتوون. ((م.ع))

❖ ئەوە گرنگ نیە توندوو تیژ بیت،بەڵکو پێویستە قازانج ماندوو خۆشەویست بێت. ((رۆکفلر))

❖ ئەوانەی میوانداری خەڵکی قبووڵ دەکەن و لە بەندەکانی خواوەندن و ئەوەی یارمەتی هەژار دەدات لە موسا گەورەترە. ((پۆلاتۆ))

❖ ئەو نزیکەی لە سەرت پێویستە بیکە. ((گۆتە))

❖ ئەو کەسەی خۆی بناسێ،قسەی خەڵکی کاری تێ ناکات. ((سۆفیان))

❖ ئەگەر لە تورە بوون دوورکەویتەوە، لە هەڵەش دوور دەکەویتەوە،ئەگەر لە زۆر خواردن دوور کەویتەوە، لە توورە بوونی خواش دوور دەکەویتەوە.

((پۆلاتۆ))

❖ ئەوەی لە لای ڕاستی دا،لای چەپیشی بۆ وەرگێڕە. ((ئینجیل))

❖ ئەوەی تورە بێت،تورە بونەکەی بۆ خۆیەتی،نەك بۆ ئەو کەسەیە.((ئینگلیز))

❖ ئەگەر ویستت ببی بە ناوبـژیوانێکی عادیـل،گوێ لـە شـکاتی هـەردوو لابگـرە و حوکمیش مەدە دوای ماوەیەك نەبێت. ((ناپلیۆن))

❖ ئەو پەنجەیە عەدالەتی شەرع بیبڕێ،ئازاری نیە. ((کەستەلۆ))

❖ ئەو زەمانەی کەسێ ئینج درێژە، دوور نیە پیاوێك بکوژێ درێژێکەی شەش پـێ بێت. ((یابانی))

❖ ئەوی خۆی بناسێ خوا دەناسێ. ((ئیمامی عەلی))

❖ ئەوەی هەوڵی دوو ئیش پێکەوە بدات هیچیان ناکات. ((بیلیوسی بچوك))

❖ ئەگەر مرۆڤێك قینت لێ بوو،داوای تەمەن درێژی بۆ بکە. ((وێژەی یابانی))

❖ ئەگەر لە نەوەی ئال عوسمان نەبوایە،حـەزم دەکرد وەسـتای دروسـت کردنـی خانوو بومایە. ((سوڵتان مەورادی دووەم))

❖ ئەگەر هەموو ئارەزوێکمان بێتە دی،گەلێ خۆشیمان لە دەست دەردەچێ.

❖ ئەو سەربازەی زۆر ئەنوێ لە جێی دوو سەد سەربازە. ((فەرەنسی))

❖ ئەوەی ئیشی نەبێت،ژیانی نیە. ((ئینگلیز))

❖ ئەوەی سروشت دەیکات و نژدارو دەرمان نایکات.

❖ ئێمە کە ئەڵمانین لە خوا دەترسین،لە کەسی تر ناترسین. ((ئەڵمانی))

❖ ئەگەر بە پێی دەستوورو باوی خوا بژیت لەجیهانا هـەرگیز هـەژار نابیت،ئەگـەر بە پێی ئارەزوی هیچو پوچی خۆشت بژی،هەرگیز دەوڵەمەند نابیت.

((لاتینی))

❖ ئیش کردن ژیانە،ئیسراحەتی مردنە. ((عەرەب))

❖ ئیش کردن خۆشترین شتە لە لام. ((مۆزار ١٧٥٦ — ١٧٩١))

❖ ئەی ئیش کردن ئەگەر تۆ بە خراپە ناوبەرین ئەی چاکە چۆنە ؟((سلكرك))

❖ ئەوەی لە لام دانشێت،ئەگەر لێم نزیك بووەبەخێرهاتنی دەکەم جێی بۆ خۆش دەکەم و قسەی کرد ڕووی لێدەکەم. ((سەعید کوڕی عەباس))

❖ ئەوەی پێش سڵاو قسەی کرد وەڵامی مەدەنەوە. ((حەسەنی کوڕی عەلی))

❖ ئەخلاقی باش لە دەموچاوی پیاودا وەکو بۆدرە وایە لە دەم چاوی ئافرەتا.

((یەکێك))

❖ ئەو کەسەی گوێچکەی داخات لە هاواری خەڵکی،ئەگەر ئەویش هاواری کرد خەڵکی وەڵامی نادەنەوە. ((سولەیمانولحەکیم))

❖ ئەوەندە بێ ئەقڵ نیم باوەڕ بکەم کە ئافرەت لیوی بە یەك پیاو دەدات.

((شکسپیر))

❖ ئەگەر ئافرەت پیاوێکی خۆش ویست هەمیشە تینووی لێوی دەکات ((بیرون))

❖ ئەوەندە سەیری ئاوێنە دەکات،سەیری ژیانی بکردایە،لە نێوان ئافرەتدا بێ ئەقڵ نەدەبوو. ((بۆل بۆرگیە))

❖ ئەوەی دەتوانین بیکەین،ژنیش دەتوانێ بیکا،هیچ جیاوازیش لە نێوانماندا نیە،تەنها ئەوە نەبێت،ئەوان نەرم و نیان ترن. ((ڤۆڵتێر))

❖ ئەقەڵی ژن،هەمیشە لە لایەن دڵیەوە هەڵخەڵەتاوە. ((مارسیل ڕیڤۆ))

❖ ئەگەر لە چاوی ژندا ڕوناکیت بینی،بزانە لە دڵیدا ئاگر هەیە.

((لۆمۆن))

❖ ئەو ساڵانەی کە ونی دەکەین،ئەو فرمێسکانەی کە دەیرێژین، هەموو لە ڕێگەی ژندایە،ئەویش نایەوێ دانی پێدابنێ و تێبگا. ((ڕوریاد کبلنگ))

❖ ئەگەر ویستت لە دوژمنت ڕزگارت بێت، بە توورەی ئافرەت هەڕەشەی لێبکە

((شیلۆن))

❖ ئەوەی باوەڕ بە ژن بکات،وەك ئەوە وایە باوەڕ بە دز بکات.

❖ ئەگەر تەمەن بیست ساڵ بوو کچێك بزەی بۆ کردی بە پەلە بۆ لای ئاوێنە دەڕۆیت بزانی چی جوانیەکت هەیە کە ئەو کچەی ڕاکێشاوە،بەلاّم ئەگەر تەمەنت لە چل بەسەرەوە بوو،تەماشایی دواوە دەکەیت بزانی لە گەڵ یەکێکی تری نیە،یاخود لە عەی بێکی جلەکانت دەگەڕێت دوور نیە هۆی ئەوە بێت.

((سترا ئیفنگ))

❖ ئەو ژنەی زاڵ بێت بەسەر خۆیداو زاڵ بێت بەسەر ئارەزویدا و لە زمانە تیژەکان و دڵ ڕقاویەکان بترسیّ،لە شاژن زیاترە. ((میلتون))

❖ ئەگەر دوو ئافرەت بە یەك گەیشتنو ئەوا قسەیان نابڕێتەوە،ئەگەر بوون بەسیان،شەڕیان نابڕێتەوە. ((چینی))

❖ ئەگەر دەتەوێت دوژمن پێت نەوێرێت،ڕەوشتی خۆت چاك بکە.((ئەفلاتون))

❖ ئێمە دڵداری ڕاستی ناکەین لە ژیانماندا،تەنها یەکجار نەبێت ئەویش یەکەم جارە. ((بەرناد شۆ))

❖ ئەو مرۆڤەی لە بەردەم تەماعدا ئەقڵی وون دەکات،ئیتر هیچی نیە ونی کا.

((لیسنبج))

❖ ئەو ئافرەتەی دوێنیّ خۆشی ویستی و ئەمڕۆ دەتپرستیّ،سبەیینیّ خیانەتت لیّ دەکات.

❖ ئەی ئافرەت ئەگەر ناتوانی لە ئاسامان ببیتە ئەستێرە لە ماڵەوە ببەرە مۆم.

((فۆڵتێر))

❖ ئیشکردن کانیاوی زانستە،زانستیش قوڵی ژیانە.

❖ ئەو پیاوەی فێر نەبێت وەك و ئەو ئەرزە وایە کە هیچ شتێکی لیّ نەڕویّ.

❖ ئەوەم پێخۆش کە بڵێن بۆچی پەیکەری بۆ نەکرا،نەك بڵێن بۆچی پەیکەری بۆ کرا.

❖ ئەوانەی بەگژ ئازادی دادەچن،ئەوانە یارمەتی دەدەن.

❖ ئەوانەی بەرد لادەبەن،پەنجەی خۆیان دەرووشێنن.

❖ ئەگەر هەژار بووی بیربکەوە کێ لە خۆت هەژار ترە،ئەگەریش دەوڵەمەند بووی بیرکەرەوە کێ لە تۆ شایەنی ترە.

❖ ئەو کەسەی باش دونوێ،ئەگەر هیچی نەبێت لە ناو چۆنی بترسێ.

❖ ئەمڕۆ ئەو بایانیەیە کە دوێنێ لێپەست بووی ولێـی ڕاڕابوی،ئایا پێویست بەو هەموو ڕاڕایە دەکات ؟

❖ ئەگەر سەیری هەندێك ئافرەت بکەین،باوەڕمان وایە (کێوبید)هەندێ جار گەمژە بووە.

❖ ئەوەی دەرونی ئاسودە بێ بـە ئاسـودەیی دەنوێ،هەرچـەندە هـەورە تریـشقە بێت.

❖ ئەوانە چەند کەمن کە ئەسڵی خۆیان وون نەکردووە،لە نێوان ئەو درۆیانەدا کـە بەناچاری قبوڵی دەکەن.

❖ ئەوانەی باسی خراپەی خەڵك دەکەن، وەکو ئەوانە وان کە دەچنەماڵ یەکێکی ترەوە دەیانەوێ ئەوەی لە ناوی دایە چاکی بکەنەوە و ماڵەکەی خۆیان وێرانە وبەجێی دێڵن. ((ئینگلیز))

❖ ئەوانەی خاوەن زانیارین وەکو گوڵە گەنم بـەرزدەبنو بـەرز دەبن،هـەرکاتێکیش پێگەیشت و پڕبو لە دانەوێڵە،سەر شۆڕدەکاتەوەو دەچەمێتەوە.((ئینگلیز))

❖ ئەو کەسـەی ئـیش دەکـات شـەرم ناکات،بـەڵکو شـەرم بـۆ ئەوانەیـە کـە ئـیش ناکەن. ((فیلەر))

❖ ئەوەی پیشەیەك یان ئیشێك فێر نەبێت بێقیمەتە. ((فلهنام))

❖ ئەگەر توانیبێتم خزمەتی جەماوەرم کردبێ،ئەویش بە هەوڵدان و سەبرم بووە.
((ئیسحاق نیوتن))

❖ ئەوەی بە پەلە ئیش بکات بە ژیری ئیشی نەکردووە. ((بیلیوسی بچوك))

❖ ئەوەی لە منداڵیەوە فێر نەبێت،لە گەورەیش پێش ناکەوێت.

❖ ئەوەی زمانی خۆش بێت برادەری زۆر دەبێت.

❖ ئەو کەسەی بەختیاری دەداتە دواوە،پێویستە ئازارەکانی ژیان هەڵگرێت.

❖ ئەوەی کەمی هەبێت هەژار نیە،بەڵکو ئەو کەسەی کە داوای زیاد دەکات.

((فەرەنسی))

❖ ئیشی ئازایەتی پێویستی بەکەرانەی (بۆقی)نیە. ((ئینگلیز))

❖ ئەوانەی هیچ نین و دڵ ڕەقن،کە لە هەڵەی پیاوی گەورە دەگەڕێن.

((شۆپنهاوەر))

❖ ئەوانەی ئامۆژگاری خەڵکی دەکەن،کە ژن نەهێنن،خۆیان ژنیان نیە.

❖ ئەوەی بۆ دادگا بڕوا،پشیلەیەك وەدەست دێنێو مانگایەك دەدۆڕێنێ.

((چینی))

❖ ئەگەر تەمەن بەو جۆرەی کە دەژین بیژمێری،هەمومان منداڵ دەبووین.

❖ ئەوەی نهێنیەکی هەبێت،وا لە خەڵکی دەکات بە دوایدا تووشی هەناسە بڕکێ بێن.

❖ ئەو ژنەی پیاوەکەیخۆش بوێت،وایی لێدەکات کە بەرگری لێبکات.

((گۆرمان))

❖ ئەو کاتەی کە لە گەڵ ئەقڵدا دەژیت،ئەو جێگایە گرینگ نیە کە لەشت تێدا دەژی.

❖ ئەوکاتەی لە سەر ئافرەت دەنووسین،چار نیە دەبێ لە سەر خۆشەویستی بنووسین.

((چیخۆف))

❖ ئەو پیاوەی تووشی نەخۆشی دڵداری بووە،لە ڕاوچیەوە دەبێتە نێچیر.

((ئۆسکار فۆربڵ))

❖ ئیشکردن یاسای ژیانە و باشترین بەریەتی. ((لویس مۆریس))

❖ ئەگەر دەتەوێت دوژمنەكانت نهێنیت نەزانن،ئەوا بە برادەرەكانت مەڵێ.

((وێژەی یۆنانی))

❖ ئافرەت لە دایك بووە،بۆ ئەوەی پیاو خۆشی بوێت،نەك نهێنیەكانی بزانێت.

((ئۆسكار والید))

❖ ئافرەت لە هەڵەی ئەو كەسە دەبورێ كە خۆشی دەوێت،هەڵەش دروست دەكات بۆ ئەو كەسەی كە قینی لێیەتی. ((شلیون))

❖ ئافرەت دەژیت بۆ ئەوەی لە خۆشەویستی دا بەختیار بێت،پیاویش خۆشەویستی دەكات بۆ ئەوەی لە ژیانی دا بەختیار بێت.

((جان جاك ڕۆسۆ))

❖ ئافرەتی خایین ئەو ئافرەتەیە سۆزو خۆشەویستی ون كردووە.

((لابرێوی))

❖ ئافرەت درووست بووە بۆ ئەوەی پیاو خۆشی بوێت و بۆ ئەو بێت.

((ڤۆڵتێر))

❖ ئافرەت ئامێرێكی مۆسیقای جوانە،ژێیەكانی خۆشەویستی یە.

❖ ئافرەت بە بێ خۆشەویستی مردووە.

❖ ئافرەت بۆ ئەو پیاوەی خۆشی ویستووە بۆ هەموو شتێك قوربانی دەدات،بەڵام باوەڕ بەو كەسە ناكات كە خۆشی دەوێت. ((بەرناد شۆ))

❖ ئافرەت بە خۆشەویستیو ئەمەك داری گاڵتە ناكات تەنها ئەو كاتانە نەبێت،كە پیاو ئارەزوەكانی پوچەڵ دەكاتەوە.

❖ ئافرەت ناتوانێ بە بێ خۆشەویستی بژی. ((ماری ئەرجنێنتوك))

❖ ئافرەت بە هەموو دڵیەوە خۆشەویستی دەكات، بەڵام پیاو بە هەموو هێزیەوە.

((ماركس ئوربیلوس))

❖ ئافرەت کاتێ خۆشەویستی بە جێ دێڵێ دەگرێت،بۆ ئەوەی ئەو ئاگرەی لە دڵیدایە ئاشکرای بکات،بەڵکو بۆ ئاشکرا کردنی کە تاکوو ئێستا خۆشەویستەو شایستەی خۆشەویستیە. ((لارو شفوکو))

❖ ئافرەت،درووست بووە بۆ بینین نەك بۆ بیستن. ((سۆفو کلیی))

❖ ئافرەت،جوانترین دیاریە خواوەند بە مرۆڤی داوە. ((سوکرات))

❖ ئافرەت،وەك و پشیلە وایە بە نۆ ڕوح دەژی. ((جۆن هیود))

❖ ئافرەت لە دونیا دا تەنها مێردی دەوێت کاتێ دەستی دەکەوێت هەموو شتێکی لە مێردەکەی دەوێتن

❖ ئافرەت،نرخی خۆشەویستی مێردی نازانێ ئەو کاتە نەبێت کە جێی دەهێڵێ.

❖ ئاسمان گەورەیە بۆ هەموو جۆرە باڵندەیەك. ((وێژەی ئیسپانی))

❖ ئای ئەو ئافرەتانە چەند زۆرن کە دڵی پیاو وەر دەگرن،بەلاَم ئای چەندە ئەو ئافرەتانە کەمن،کە دەتوانن ئەو دڵە ڕابگرن.

❖ ئازایەتی نیە دڵت ترسی تێدا نەبێت،بەلاَم ئازایەتی ئەوەیە بتوانی بە سەر ترسدا زاڵ بی.

❖ ئافرەت،ئەو پیاوەی خۆشی دەوێت وەلاَمی هەموو پرسیارەکانی دەداتەوە.

❖ ئاگادار بە سامان ڕەزیل نەکەی،چونکە سامان وەك ناودارییەتی وایە.

((بلوراتۆن ١٨٠٠ –١٨٧٢))

❖ ئامۆژگاریم بۆ تۆ ئەگەر ئافرەت و خاوەن ئیشێکی،لە بیرت نەچێت کە ئافرەت ومێینەی هەرچەندەکێشی مێشکت بێت لە سەرتا. ((مەدام برۆتیینە))

❖ ئاسنەکەت بکوتە مادامە کینی گەرمە. ((بیلوسی بچوك))

❖ ئاگاداری دوو زمان بە چۆن ئاگاداری دوو پشك دەکەی. ((عەرەب))

❖ ئازا حوکمی زەمان دەکات پیاویش کوڕی ئیشیەتی. ((سەرفەنتس))

❖ ئافرەت گوڵی خۆش ناوێت لە بەر ئەوەی گوڵە،بەڵکو لە بەر ئەوەی لەو پیاوەوە هاتوە کە باوەڕی وایە خۆشی دەوێت لە گوڵەکە جوانترە.

((ئەلعقاد))

❖ ئافرەت،وەکو و هەنگ وایە،یا هەنگوین و مۆمت دەداتێ یا پێتەوە دەدات.

❖ ئافرەتی جوان خیاڵە...ئافرەتی ناشرین ڕاستیە. ((شۆپنهاوەر))

❖ ئافرەت جوانترین چۆلەکەیە لەسەر ڕووی ئەرزدەخوێنێت((ئەلفریێدی ڤوسیە))

❖ ئافرەت هیوای ئەوەیە کە بارو دۆخ ڕێگە بدات،بەزووترین کات شوو بکا،پیاویش ئەوەندە باروو دۆخ ڕێگە بدات دەیەوەێ ژن هێنان دوا بخات.

((بەرناد شۆ))

❖ ئافرەتی زۆر جوان مەخوازە...چونکە چەندەها پیاو لە ناو دڵیایەتی.

((سیدی سمس))

❖ ئافرەتی خۆ بەگەوە زان،چەند ناشرینە نرخەکەشی گران دەدات چونکە بە قەیرە کچی دەمێنێتەوە. ((هۆمر))

❖ ئاوێنە یەکە برادەری نهێنی ئافرەت بڵاو ناکاتەوە. ((ئەندەریەدی بلزاك))

❖ ئافرەت و ئاوێنە لە یەك دەکەن،هەر دوو بەتاڵ هیچیان تێدا نیە.

((ناپلیۆن))

❖ ئافرەت خەفەتێکی هەمیشەییە. ((سافیدس لسکیت))

❖ ئافرەت ئەو کەسەی خۆش دەوێت،کە خۆشی دەوێت بەلاَم پیاو ئافرەتی خۆش دەوێت. ((هیرار))

❖ ئافرەتی ناشرین دەم و چاوی لە ئاوێنەدا دەبینێ،ژنی ناشرینیش دەم و چاوی،لە چاوی خەڵکی دا دەبینێتەوە. ((بەرناد شۆ))

❖ ئافرەت کە توانی پێدەکەنێ بەلاَم هەر کاتێ ویستی دەگرێت.

((جۆرج ساند))

❖ ئاوەتەكانی ئافرەت لە پیاودا :

– مێردەكەی بۆ هەموو كەس وەكوو ئاسن بێ و بۆ خۆی وەك و هەویر بێ لە ناو دەستیا.

– زۆر هونەرمەند بێت لە ئەویندا،بەلاّم ئەو زیرەكیە لە گەلّ ئافرەتێكی تردا بەكار نەهێنێت.

– هەمیشە چاودێری جموجۆلّی بكات،بەلاّم كوێر بێ لە جموجۆلّی ئافرەتی تردا.

– بزانێ چۆن ماچ دەكا،بەلاّم خۆی یەكەم كەس و دواكەس بێ لە ماچ كردنیا.

❖ ئافرەت وەك و شوشە وایە ئەگەر شكا چاك كردنەوەی گرانە.

❖ ئافرەت وەك و گولّە،لە هەر كوێ داینێی ئەو شوێنە دەرازێنێتەوە.

❖ ئاگادار بە،تەماع كار مەبە،چونكە نەخۆشیەكە هیچ دەرمانی نییە.

❖ ئافرەت وێنەی نەرم و نیانی و تەواوییە. ((ڤۆلّتێر))

❖ ئافرەت وەك و پڕو پاگەندە (دعایە)وایە،هەرچەندە دوو بارە بێتەوە مەبەستەكە دەداتە دەستەوە. ((دوورانت))

❖ ئافرەت لە لای من تێكەلاّوە لە چەند جۆرە ڕەنگ. ((بیكاسۆ))

❖ ئای دایە،چەند خەو بە تۆ و كولێتە بچكۆلەكەوە و مریشكە هێكە كەرەكەتەوە دەبینم. ((وێژەی چینی))

❖ ئافرەت زمانە بێگانەكان زوو فێر دەبێ،چونكە لە مێشكیاندا بەتالاّی زۆر هەیە. ((چیخۆف))

❖ ئافرەت ناتوانێ بە تەنها بژی.

❖ ئافرەت وەكو لقە داری تەڕە،بە هەموو لایەكدا لادەكاتەوە،بەلاّم بە گەردەلول ناشكێ. ((زوالتی))

❖ ئافرەت یەك كەس بوو فێری كردم،كە ئافرەت كێیە. ((ردیارد كلینك))

❖ ئافرەت باخچەیەکە هەندێك جار دەبێتە بیابانێك،تەنها بە کەڵکی ئەوە دێت کاژی تێدا بچێنی. ((ئیبراهیم نەوار))

❖ ئافرەت لە لای من تێکەڵاوە لە دیمەن و ڕەنگ. ((بیکاسۆ))

❖ ئافرەت جوانترین دیاری خواوەندە بۆ پیاو. ((جۆیار))

❖ ئافرەت یەکێکە لە نێوان پەرییاندا و مرۆڤدا. ((بلزاك))

❖ ئافرەت وەك و ئاگاداری وایە مەبەستەکەی بە دوو بارە بوونەوە جێبەجێ دەکات. ((دۆرانت))

❖ ئافرەت وەکو دووپشکە ڕێگە لە ژیاندا دەبڕێ،هەر کەسێ لە ڕێگایدا بووەستێ پێوەی دەدات. ((ئەناتۆڵ فرانس))

❖ ئافرەت گوڵی بەهارەو جوانی دونیایەو ڕوحی ژیانە. ((ئەنینا ئەوین))

❖ ئافرەت جوانترین شتە لە ژیاندا. ((کۆنفۆشیوس))

❖ ئافرەت نمونەی نەرمی تەواوییە. ((ڤۆڵتێر))

❖ ئافرەت شیعری خواوەندە پیاویش پەخشانیەتی. ((ناپلیۆن))

❖ ئافرەت کتێبێکە پەڕەکانی لێك بۆتەوە،هیچ سوودی نیە،سەریش نیە ئەگەر پیاو زانی بە باشی بیخوێنێتەوە. ((ماریشاڵ))

❖ ئافرەت یەکە ئیشی تەواو نەبوە،خواوەند تەواوبوونی بۆ پیاو داناوە.

((ئەدینوس))

❖ ئافرەت گوڵێکە تەنها لە سێبەردا بۆنی دەردەچێ ((لاینبای))

❖ ئافرەت کتێبێکە جوان بەرگەکەی درووست کردووە،لەبەر چاوان زۆر جوان و پێشەکیشی بۆ داناوە،وەکو گوڵی بەهار بەخەندەیە،ئەهریمەنیش بەشەکانی نووسیوە،ئەویش بەفێڵە ناڕەحەتییە.٠ خەفەتە. ((لامارتین))

❖ ئافرەت یەك ڕێگایە بۆ جێبەجێ کردنی ئەوە. ((لۆرانس))

❖ ئادەمیزاد نە گۆشتی دەخورێت نە پێستی بەكەڵك دێت،كەواتە چیتری هەیە لە زمانی شرینی بەولاوە. ((تورك))

❖ ئافرەت وەك قوماش وایە هەڵبژاردنی لە ژێر مۆمدا دەبێت.

❖ ئافرەت دەڵی مرۆڤایەتییە و پیاویش سەربەستی. ((سمیلس))

❖ ئافرەتی جوان چاو پێ خۆشحاڵ دەبێت،ڕەوشت باشیش،دڵ پێ خۆشحاڵە،یەكەمیان ئەو شتە جوان و بەنرخانەیە كە دەكرێ بە قەداو دووەمیان،كانزایە. ((ناپلیۆن))

❖ ئافرەت وەك منداڵە گەر دوای كەوتی ڕا دەكات،كە تۆ لێی ڕات كرد دوات دەكەوێ. ((ڤۆڵتێر))

❖ ئافرەت وەك كۆتر وایە،لەو كاتێدا بیر لە پیاو دەكاتەوە،خەون بە جێگاوە دەبینێ.

❖ ئافرەت لە دەمیەوە باسی دڵداریت بۆ ناكات،بەڵكو بە چاوی باسی دەكا،دەتوانێ ڕۆمانێكی دڵداری دابنێ،بەلآم ئاسان نییە دڵێك درووست بكاو دڵداریی بكا.

❖ ئافرەت دڵداری دەكات بۆ ئەوەی لە دڵدارییەكەی دا بەختیار بێت.

((جان جاك ڕۆسۆ))

❖ ئافرەت،بۆ ئەوە نەبووە بۆ بەختیاری هەموو كەسێك،بەڵكو پێویستە جێگای بەختیاری یەك پیاو بێ. ((ئیتان رای))

❖ ئافرەت وەكو سێبەر وایە،لای ئەو كەسە دەمێنێتەوە كە ڕێزی لێ دەگرێت.

((لۆرد لیتلون))

❖ ئافرەت لە دەریا ناترسێ،چونكە خۆی لەوە قوڵترە. ((كرستۆف مارلی))

❖ ئامۆژگاری كەس مەكە تاك و داوات لێ نەكەن. ((ئەڵمانی))

❖ ئافرەت ڕاڕایە تاك و مێردێك دەدۆزێتەوە،بەلاّم پیاو ڕاڕا نابێت لە دوای ژن هێنان نەبێت. ((بەرناد شۆ))

❖ ئافرەت لە کراسە تازەکەی دوو جار خۆشحالّ دەبێت،خۆشحالّی هەلّبژاردن و خۆشحالّی تازەیی کراسەکەی.

❖ ئافرەت دوو پێکەنینی هەیە،یەکەمیان بۆ مێردەکەی بۆ ئەوەی فێری دلّداری بکا و بۆ منداڵەکی بەواتای دایکایەتی.

❖ ئافرەت خەفەتی ئەوە ناخوات کە کەمی هەیە،بەلّکو خەفەتی ئەوە دەخوات کە هی زۆریان هەیە.

❖ ئازایەتی نیە تۆلّە بسەنیّ،بەلّکو سەبروو ئارامت هەبێت. ((شکسپیر))

❖ ئای خۆشەویستەکەم هەرگیز نەت زانی چەند بە دەنگت خۆشحالّ دەبم،کە تۆ بێدەنگی. ((لامارتین))

❖ ئافرەت بە دلّ خۆشەویستی دەکا و پیاو بە ئەقلّی، لە بەر ئەوەی زیاتر لە پیاو بەختەوەر ترە.

❖ ئافرەت ئەو هاوڕێییەیە کەخواوەند بە مێردەکەی دەدات((شاعیرێکی هیندی))

❖ ئافرەت کۆلیتەیەکی پیّ خۆشترە کە تیایدا شا ژن بێت و نەوەك لە کۆشکێکدا کارەکەر بێت. ((بلزاك))

❖ ئافرەت درووست بووە بۆ ئەوەی بەتلاّیە بچوکەکان پڕ بکاتەوە،وەکو چۆن پوش لە نێوان شوشە دادەنریّ لە سندوقدا،یەك فلسیش ناهێنێت،بەلاّم لە شکاندن ڕزگاری دەکات. ((مەدام ینکەر))

❖ ئافرەت وەکو گولّ وایە،ئەگەر لە جێی خۆی هەلّگیرا لە ژیان دەوەستێت.

((شکسپیر))

❖ ئافرەت منداڵێکی گەورەیە. ((سوکرات))

❖ ئـافرەت چـاودێری پیـاو دەکـات بـەڵام چـۆن جاڵجاڵۆکـە چـاوەڕوانی مێـشوله دەکات. ((بەرناد شۆ))

❖ ئافرەت کلیلی نهێنی یەك ووشەیە ئەویش خۆشەویستی یە. ((نیتشه))

❖ ئافرەت لە هەموو ژیانیدا وەکو منداڵ دەمێنێتەوە. ((شۆبنهاوەر))

❖ ئافرەت نیوەی ژیانە ئەگەر موخلیس بێت بۆ مێردەکەی. ((هۆمیرۆس))

❖ ئافرەت ئەو پردەیە کە پیاو بەسری دا دەپەڕێتەوە بـۆ ئـەوەی بـە دوا ڕۆژی و مەبەستی بگات. ((لۆرانس))

❖ ئافرەت وەکو گوڵ بە بۆنەکەی پیاو ڕادەکێشێت بۆ ئەوەی دڕکەکەی بە لەشیا بچەقێ. ((ئەرستۆ))

❖ ئافرەت هەر کاتێ بیەوێ پڕە لە هەست و نەست. ((جۆرزی فیرەر))

❖ ئافرەت ئەستێرەیە پیاو بـە ڕوناکیەکـەی دا دەڕوات بـە بـێ ئـەو لـە تارییکیـدا دەمێنێتەوە. ((شکسپیر))

❖ ئافرەتێکی باش بۆ پیاو باشترەلەدەست و چاوی((موسیلەمەی کوڕی عبدالله))

❖ ئافرەت لە لای من ئەوەیە کە هەست دەکەم من پیاوم. ((سەعید فریحه))

❖ ئافرەت لە دڵداریدا لـە پیـاو زیـرەك ترە،بـەڵام پیـاو لـە برادەریـدا لـە ئـافرەت زیرەك ترە. ((لابرۆیێر))

## - ب -

❖ بەهێز ئەو كەسەیە كە لە كاتی توڕەبووندا،دان بە خۆیدا بگرێ.

((عەرەبێك))

❖ بەختیاری،وەكو خەوە،هەرچەندە چاوەڕێی بكەی دەیگەیتێ.

❖ بەختیاری،میللەتان بە زۆری سامانیان نییە و بە جوانی كۆشكەكانیان،بەڵكو بەختیاریان بە وەوەیە كە منداڵەكانیان مێشكیان ڕۆشنبیر بێت و پیاوەكانیان پەروەردەیان باش بووە و چاویان كراوەتەوە و ڕەوشتیان ڕاست بووە ئا ئەوانە بەختیاری ڕاستەقینەن و گەورەتییانە. ((مارتن لۆسەر))

❖ بەختیاری،لە دەرگایەكەوە دێتە ژوورەوە،تۆ حیسابی ئەوەت بۆ نەكردووە كە كراوەتەوە. ((جۆن باریمۆر))

❖ بە سەربر كردن،ئەوەی بتوێت بۆت دێت،هەر ئەویشە كلیلی ئەوەی كە دەتەوێ.

❖ باڵندەكانی ئاسمانیش ڕێزی ڕەزیل ناگرن،خراپی ڕەزیل وەكو خراپی (بت)پەرستە. ((پۆلاتۆ))

❖ بە خراپە كتێب بە كار هێنان،زانست دەكوژێ. ((جان جاك ڕۆسۆ))

❖ بۆ هەر مرۆڤێك یەك نیشتمان هەیە. ((سایمۆن كۆجان))

❖ بەختیاری چییە،بەختیاری سەلامەتی لەشەو لە بیر نەكردن و زیرەكی ئەقڵ و پەلە نەكردن لە پێویستیدا. ((یەحیا كوڕی خالید))

❖ بەختیاری بەرێكە،ئەگەر لە ماڵی خۆماندا نەبێ،زۆر زەحمەتە لە بێستانی خەڵكدا بیدۆزیتەوە. ((ئینگلیز))

❖ بەختیاری زۆری ناوێ. ((مورقس ئەنتانیۆس))

❖ بۆ سەركردەكەت گوێ ڕایەڵ بەو لە گەڵ بچووكدا ڕووخۆش بەو لە گەڵ هەمووواندا ڕاستگۆ بە. ((پۆلاتۆ))

❖ بێ ئەقڵی،گەورەترین دوژمنەو ژیری باشترین برادەرە. ((ئینگلین))

❖ بەختیاری،ئەو شتە نییە كە من بۆی دەگەڕێم،چونكە دەیزانم هەرگیز نایدۆزمەوە،تەنها یەك مەبەست و یەك داواكاری و یەك سۆزم هەیە كە زاڵە بەسەرمدا،ئەویش ئەوەیە،هەمیشە ئیش بۆ خەڵكی بكەم،هەركاتە ئیشەكانم زیاد بكا،ئەو كاتە زیاتر باوەڕم وایە بەختەوەرم،دووریش نییە ئەمەش خەیاڵێك بێ لە خەیاڵەكان،بەڵام بە باوەڕەوە،ئەمە لە سەر ڕاستییە ((فاخت))

❖ بەختیاری ژن و مێرد زیاتر بەدەست ژنە،نەك بە دەست پیاوە.

((فاتیمە نیعمەت ڕاشد))

❖ بەهەشت لە ژێر پێی دایكان دایە. ((حەدیسی شەریف))

❖ بۆ ئەوەی لە ژن هێناندا بەختیار بیت،پێویستە پیاو لاڵ بێت و ژنیش كوێر بێت. ((ئەلفۆنس دراگۆن))

❖ باپێویستییەكانت كەم بێت،خەفەتیش بە كەس مەڵێ.

((ماركس ئۆریلیۆس))

❖ بێدەنگی،شوورەیە كە لە دەوری ژیری.

❖ برادەری لە (بۆرصە)ی ژیاندا پارەی زێڕن،بەڵام هەژار برادەری نییە.

((تاگور))

❖ باشترین ڕێگا بۆ سەركەوتن بەسەر ناخۆشیدا،پێویستە ڕێزی بگرین.

((ئەنۆینمیس))

❖ بیرو باوەڕت بۆ خۆتە،بەڵام قسەت بۆ گەلە. ((فەرەنسی))

❖ بە جارێك هەموو خۆشەویستیت دەرمەخە،چونكە هەر كاتێ گۆڕانی تێدا ببینن،دڕت دەوەستن. ((سوكرات))

❖ بێ ئەقڵ و ئینكاری،سامانی پارێزەر زیاد دەكەن. ((عەرەب))

❖ بە (دیۆگانیس)یان ووت :چی پێویستە لە سەر پیاو کە خۆی لێ بپارێزێ، ووتی :لە حەسوودی براکانی لە فێڵی دوژمنەکانی.

❖ بازرگانییەت دایکی سامانە. ((ئینگلین))

❖ بۆ برادەرەکانت ئیش بکە زیاتر خۆشتیان دەوێ و لە گەڵ دوژمنەکانت چاکە بکە دەبنە برادەرت. ((تۆلستۆی))

❖ باوەڕ بەو برادەرە مەکە کە دوژمنایەتی لە گەڵتدا دەکردو ئێستاکە لە گەڵتا ئاشت دەبێتەوە.

❖ بێدەنگی،گفت و گۆیەکە لە گەڵ ئینگلیزدا. ((هاینی))

❖ بەختیاری لە بوون ڕاستیدا نییە،بەلاّم لە خەیاڵماندایە،ئەگەر خۆشی خەونەکانمان لابەرین هیچی نامێنێ. ((برۆست))

❖ بەختیار ئەو کەسەیە بە گەنجی بمرێ. ((بلۆتۆس))

❖ بەختیاری،قەناعەت کردنە بە ژیانی خێزانی و ژنێکی ڕەوشت باش و خاوەن بیرو باوەڕو خۆشەویستی منداڵەکانی و بە خێوکردنیان بە باشی.

((ژەنەراڵ کرۆکی یابانی))

❖ بە ئیش کردن، نەك بەقسە کردن،میوە لە دار دەکەیتەوە. ((ئینگلین))

❖ بۆ ئیش درووست بووم. ((ناپلیۆن))

❖ بۆ ژن،یەك پیاو بەسە،بۆ ئەوەی لە هەموو پیاوان بگات،بەلاّم بۆ پیاو سەدەها ژن بەسە،بۆ ئەوەی لە یەك ژن بگات. ((بەرناد شۆ))

❖ بیرم نەکردۆتەوە بۆچی دەنووسم،بەلاّم ئایا دەپرسن بۆچی ڕووبار دەڕوا ؟

((فەرەنسوا ساگان))

❖ بەری ئەدەب،ئەقڵێکی سەرکەوتووە و بەری زانست ئیشێکی چاکە.

❖ بەلامەوە زۆر سەیرە،ئافرەتێك شوو بە پیاوێك دەکات کە ژنی هەیە ئەی بۆچی خۆی پێی ناخۆشە کە ژن دێتە سەری. ((م. ع))

❖ بەختیار بە،دەرگای بەختیاری زۆرەو كونی بەختیش ناژمێردرێو ڕێگای ژیانیش لە گەڵ هەموو خولەكێك تازە دەبێتەوە.

❖ بە هەر دوو چاو ژن داوادەكا،دەباو ڕقی لێ دەبێتەوەو دەكوژێ.

((ئیسپانی))

❖ باشترین ڕێگا بۆ ڕزگاربوونت،لە گیرو گرفتەكانت،بیخەیتە گیرفانە كونەكەتەوە.

❖ بەختیاری،وەكو پەپولە وایە،ئەگەر دووای بكەویت، لە بەر دەستت ڕا دەكا،ئەگەریش گوێی نەدیتێ بەسەر سەرتا باڵە فڕێ دەكا.

❖ باشێتی مرۆڤ بە باشە باس مەكە،كە بۆ خاوەنەكەی دەگەڕێتەوە.

((نیتشە))

❖ بە حەزرەتی عومەریات ووت خوای لێ ڕازی بێ،بێ دەسەلآت كێیە ؟ووتی :ئەو كەسەیە كە بێدەسەلآتی نەفسی خۆیەتی.

❖ باشترین مامۆستا ئەو كەسەیە،كە لە خۆیەوە دەست پێدەكات.

((بەرناد شۆ))

❖ برادەری لە هەموو شتێكا جێگیرە،تەنها لە دلداری و ئیش كردندا نەبێ.

((شكسپیر))

❖ بڕێ كتێبی بەنرخ،بەرامبەر قوتابخانەیەكی كۆكەرەوە وایە. ((كارلیل))

❖ برادەری،خۆشەویستییە بەبێ باڵ. ((لۆرد بایرۆن))

❖ باشترین نموونە :

- باشترین شت كە بە دوژمنەكتی پێشكەش دەكەی،لێبووردنە.
- باشترین كە بە برادەرەكەتی پێشكەش دەكەی،دڵە باشەكەتە.
- باشترین شت كە بە كوڕەكەتی پێشكەش دەكەی،نموونەی چاكییتە.
- باشترین شت كە بە باوكتی پێشكەش دەكەی، ئیحترامە.

- باشترین شت كە بە دایكتی پێشكەش دەكەی، ئەو ڕەوشتەیە كە ئەو خۆی پێوە هەڵدەكێشێ.
- باشترین شت كە بە خۆتی پێشكەش دەكەی، ڕێزگرتنە.
- باشترین شت كە بە خەڵكی پێشكەش دەكەی،خۆشەویستییە.

❖ بەختیار ئەوەیە،ئەوەی هەتە پێی ڕازی بی وەكو هەی،نەفس بەرز ببیت بەرامبەر بە خۆت و بە خەڵكی،ئەوەی لە دەستت چوو پەشیمان نەبی،بەلاَمپێویستە هەمیشە هەوڵی ژیانێكی باشتر بدەی،بەلاَم بە هێمنی.

❖ بێ هێزی ژن هۆی ڕەوشتی كۆمەڵە بەرامبەری. ((رید یەرۆ))

❖ بە گوێرەی پیاو،ئەگەر پیاو بەربەرەكانی بكات ئازارە،بەگوێرەی ئافرەتیش چاكترە،بەربەرەكانی بكات. ((ئەتیان رای))

❖ بۆ ئافرەت نییە بگاتە ترۆپكی بەرزێتی،ئەو كاتە نەبێ ماڵئاوی لە بەختەوەری دەكات و جلی ڕەش دەپۆشێ. ((مەدام دۆستایل))

❖ باش وایە بیر بكەیتەوە پێش ئەوەی بڵێیت،نەك بڵێیت پێش ئەوەی بیر لێبكەیتەوە. ((پیس بلاك))

❖ بیر هەڵكەندن،یەكەئیشە كە پێویستمان پێ نییە،لە بنەوە دەستی پێ بكەین.

❖ بە هێز ئەوەیە،كە لە كاتی توڕە بووندا زاڵ بێت بە سەر خۆیدا.

❖ بە ئافرەت بڵێی جوانی،كەڕ دەبێ. ((ڕۆسۆ))

❖ باشترین شت لە برادەریەتیدا ئەمەكدارییە،خراپترین شت خیانەتە.

❖ بگرەو بەردە،گۆڕینەوەی زانیارییە.

❖ برادەری،یەك ڕوحە،لە دوو گیاندا. ((ئەرستۆ))

❖ بەڵێن مەدە بەو شتەی كە بۆت ناكرێ.

❖ بۆ خۆشەویستی مەگەڕێ،بەڵكو خۆشەویستی بدە،پاشان دەبینی ئەو بە دوواتا دەگەڕێ.

❖ برادەر یەك ڕووی هەیە،بەڵام درۆ سەد ڕووی هەیە. ((یۆنانی))

❖ بۆ ئەوەی لە ڕەخنە دوور بی،هیچ مەکەو هیچ مەڵێ و هیچ مەبە.

((ئەلبەرت هابارت))

❖ بەختیاری،لە ژیری دایە،لە جیهاندا بەختیاری نییە،ئەو کەسە نەبێ کە ژیرێکی ژیرە.

## - پ -

❖ پەیکەر لە بەفر درووست دەکەین، پاشانیش شکاتی ئەوە دەکەین کە دەتوێتەوە. ((سوکرات))

❖ پێویستە هەژار بیت، تا نرخی دراو بزانی.

❖ پیرۆز بێت لەو کەسەی کە ئیش دەدۆزێتەوە،ئایا لە بەرەکەتی ئیش گەورە تر هەیە ؟ ((تۆماس کارلیل))

❖ پەلە تەنها بەسەر چاکترین جلدا دەکرێت. ((ئیسپانی))

❖ پێویستە لە سەرمان زمانی بزە،لە فرمێسکەوە فێر بین،چونکە ژیان فرمێسك و بزەیە.

❖ پێی هەڵکەویّ،نەك زمان هەڵە بکا.

❖ پێویست بوو لە سەر مرۆڤ ئەو هەموو ئازارە بچێژێ،بۆ ئەوەی بە دڵی خەڵکی بکات. ((فەرجینا وۆڵف))

❖ پێویستە مرۆڤ شتێ نەکا ئەگەر لە ئاکامەکانی بترسێ.

❖ پیاوانی ئیشکەر،هەمیشە بەری تازە کۆدەکەنەوە. ((لۆرد تتیسۆن))

❖ پەلە،گەورەترین داهێنانە مرۆڤ دروستی کردووە.

❖ پێویستە لە سەرمان بزە زۆر بەکاربێنین،چونکە مرۆڤ یەکە کەسە کە خوا پێی بەخیشوە. ((بێرن ولیامز))

❖ پێویستە لە سەر مرۆڤ،بیری تەواو بێ،دڵی پاك بێ،لەشی ساغ بێ.

((چیخۆف))

❖ پشیلە لە چاو مشك شێرە. ((ئەلبانی))

❖ پیاوی گەورە ئەو پیاوەیە کە سوودی هەبێ بۆ خەڵکی.

((لوتفی ئەلسەیید))

❖ پەیمان،ڕووناکییە کە لە دڵەوە و چواردەوری خۆی ڕوون دەکاتەوە.

❖ پیاو،لە گەورەییدا،وا دەردەچێ کە دایکی چۆن پەروەردەی کردووە.

((قاسم ئەمین))

❖ پیاو هەر چەندە قسە بکات ناتوانێت خۆشەویستییەکەی ڕوون بکاتەوە،بەلاّم ئافرەت بە یەك ووشە دەری دەبڕێ و ئەوەندە خۆشەویستی دەتوێنێتەوە لە دلّی پیاودا جێگای نابێتەوە. ((هۆلّمز))

❖ پیاوان دەلّێن،زانست هێزە،ژنان دەلّێن جوانی بەهێزترە. ((شیلّدن))

❖ پیاو ناتوانێت ڕاستی ژن هێنان بلّێت،مادامەکی ژنەکەی لە ژیاندا بێت.

((بارنارد شۆ))

❖ پێویستە لە سەرمان ئافرەتی جوان بخوازین ئەگەر ویستمان لێیان ڕزگار بین.

((ساشا گێتری))

❖ پرس بە ژن مەکەن لە ئیشو کارتاندا ئەوەی لە سەرتانە خۆراکیان بدەنێ و بە پێی توانا جل و بەرگی باشیان بۆ بکەن. ((هیندی))

❖ پیاو هەست بە هێزی دەکا و ڕەحم بە ژن دەکا،ژنیش هەست بە بێ دەسەلاّتی دەکا،بۆیە خراپە لە گەلّ پیاودا دەکا. ((بەرناد شۆ))

❖ پیاوان هەلّۆیەکن لە ئاسماندا دەفڕن و ئەوەیلە ژێریانەوە بێت لمییان بەسەردا دەکەن،ژنیش بولبولێکەدەخوێنێ وحوکمی دلّ دەکا. ((فیکتۆر هۆگۆ))

❖ بێوەژنی دەولّەمەند..بە چاوێك دەگری و بە چاوێکی تری لە خۆشیدایە.

((سرفانتس))

❖ پیاوی ژیر بە ژن دەلّێت لێت تێگەیشتووم،بێ ئەقلّێش دەیەوێ ئەوە ئیسپات بکات. ((سیدنی سمیس))

❖ بەختیاری سێ شتە،شتێك بدۆزێتەوە بیکەی،شتێك خۆشت بوێت،هیوایەکیش ئاواتت بێت وبەجێی بهێنی و هەولّی بۆ بدەی. ((یەکێ لە ناودارەکان))

❖ بە کردەوە داری میوە دەچێنرێ نەك بە قسە. ((ووتەیەکی ئینگلیزی))

❖ پیاو و ژن هەردووكیان،مرۆڤێكی تەواو دروست دەكەن.

❖ پیاو ئاگرە و ئافرەت دارە و شەیتان هەوایە· ((فەرەنسی))

❖ پێویستە سوود لە ناخۆشی خەڵك وەرگرین. ((شامێر))

❖ پیاوی ڕەزیل سامان بۆ سێ كەس كۆدەكاتەوە،ئەوانەش ئەمانەن،بۆ مێردی ژنەكەی كە مرد،بۆ ژنی كوڕەكەی كە ژنی بۆ هێنا و بۆ مێردی كچەكەی كە بە شووی دەدا. ((قاسم ئەمین))

❖ پێش ئەوەی توڕە بیت،بگەڕێ و بزانە هۆ هەیە بۆ توڕەبوونت.

((ئینگلیز))

❖ پاراستنی كات،لە تەواوی پادشاهانە((لویسی چواردەهەم،پادشای فەرەنسا))

❖ پیاوێكم پیشان بدە كە كۆیلەی ئارەزووەكانی نەبێ،تاكە بیخەمە ناو دڵمەوە.

((شكسپیر))

❖ پیاوی كەم زانیاری وەكو (گا)زل دەبێ و گۆشتی زیاد دەكاو ئەقڵی زیاد ناكا.

((ژیرێك))

❖ پیاو لە خۆشەویستیدا،هەمیشە حەز دەكا بزانێ ئافرەت چی دەكا،لە هەمان كاتدا ئافرەت حەز دەكا ئەوەی پیاو كردوویەتی لە بیری كا·((ئەرسەر میلەر))

❖ پیاو دەتوانێ خۆشەویستی سێ ژن كۆبكاتەوە،لە وێدا ئافرەتێك هەیە خۆشی بوێت،ئافرەتێكیش یاری پێ بكا،ئافرەتێكیش شكاتی لێ بكا،بەلام ئافرەت تەنها باوەڕی بە یەك پیاو هەیە،یەكێك خۆشی بوێت و یاری پێ بكا و شكاتی لێ بكا.

((بلزاك))

❖ پیاو هەست بە هێزی خۆی دەكاو دڵی بە ئافرەت دەسووتێ،ئافرەتیش هەست بە بێ هێزی دەكا بۆیی دڵ ڕەقی لە گەڵ پیاو دەكا. ((بەرناد شۆ))

❖ پیاو،بە درێژایی تەمەنی پارە كۆدەكاتەوە،زۆر بە خۆشیەوە پێكەش ئەو ئافرەتەی دەكات كە دەبێتە تۆڕییەوە. ((مارك توین))

❖ پیاوی ئێسك قورس ئەو پیاوەیە،كاتێ كە دەتەوێ گوێت لێ بگرێ قسە دەكا،یەك وشە كۆدەكەمەوە ئەویش·ئیشە·لەئیشش بەو لاوە نیە. ((ئەدوار لابولای))

## - ج -

❖ جوانترین ئاواز لێمدابێت.٠ئەو ئاوازە بوو لە سەر لێوی ئافرەتێکی جوان لە ژێر تریفەی مانگە شەودا. ((شۆبان))

❖ جوانترین دیمەن ئەوەیە،کە ژن ببینیت و لێوی ماچ بکەیت. ((بەرناد شۆ))

❖ جوانترین چاو و درۆزنترین چاو، چاوی ژنانە. ((بەرازیلی))

❖ جوانی تا ماوەیەك دەمێنێ وەکو مانگە شەو تەواو نابێ،جارجار نەبێ.
((گۆتە))

❖ جوانترین شت لە ئافرەتا،چاوییەتی،خۆشترین شت دڵییەتی.

❖ جلی جوانی پیاو،ئەخلاقییەتی،پێوەری ژیری هۆشییەتی لە کاتی تووڕەبووندا.

❖ جوانترین هەست کە نەفسی مرۆڤـ پڕدەکاتـەوە ئەوەیە،کـە سـەیری ئاسمـان دەکا،لە وێدا نهێنییەکی گەورە هەیە لە دوای هەموو شتێکەوە،ئەو نهێنییەش چـاوگەی ڕاستییە بۆ هەموو زانست و مرۆڤـ،کە هەستیان نەکردووە بـەو نهێنییـە گەورەیە،ئـەوە مرۆڤێکی کوێرە. ((ئەنشتاین))

❖ جوانی :

- جوانی ئەقڵ : بە بیرە.
- جوانی قسە : لە ڕاست گۆییە.
- جوانی سامان : لە ڕاستییە.
- جوانی دڵ،لێی گەڕانە لەخۆشەویستی.
- جوانی نهێنی :لە شاردنەوەدایە.

❖ جوانی ئافرەت،تەنها ئەوە نییە،ژیان چـی داوەتێ،بـەڵکو ئەوەیـە ئـەو چـی بـە ژیان داوە.

❖ جوانی دوو چاوگەی هەیە،سروشت و ئافرەت. ((سوکرات))

❖ جوانی ئیشەکان،لەسەر جوانی شکڵەکانەوەن،چونکە لە دەروونـدا ئیسراحەت دەکا،وەکو ئیسراحەتی وێنەی پەیکەر زیاتر ئەوەش لە هەموو هونەرێ جوانترە.

((ئەمرسۆن))

❖ جیهان،بچووکە..هەر چەندە قەوارەی گەورە بێ،کەواتـە بۆچـی بـە ئاشـتی لـە سەری نەژین.
((گۆرانییەکی تەتەری کۆن))

❖ جوانی ژن،وەکو گوڵ وایە بە پەلە دەمرێ. ((گۆتە))

❖ جوانی بۆ ژن وەکو سامانە بۆ پیاو هێزێك و دەسەڵاتە. ((دۆرۆستی مای))

❖ جوانی بۆ ژن،وەکو بۆنی گوڵە. ((تشارلز سواب))

❖ جوانی ئافرەت،جەور دەکا،چونکە ڕاوی دڵ دەکا،بەڵام یەکە جەورێکی جوانە.

((ئۆسکار وایڵد))

❖ جـوانی ئافرەت،بـەدەر ناکەوێ،ئەوکاتـە نـەبێ کـە دڵـی بـۆ خۆشەویـستەکەی دەکرێتەوە.
((لابرۆییر))

❖ جوانی و پاکی،دانسەقەیە لە ئافرەتدا ئەگەر کۆ ببێتەوە. ((ڕۆسۆ))

❖ جوانی لە ژندا،گەورەترین هێزە. ((دی رۆترۆ))

❖ چۆن پیاوێکی پیر کچێکی جوان دەخوازێ،وەکو نەزانێك وایـە کتێبێکـی بـەنرخ بکڕێت و یەکێکی تر بیخوێنێتەوە.
((ڕیکاردۆ))

❖ جوانترین ئافرەت لە چاوی پیاودا ئەوەیە کە لێی عاسی دەبێت. ((لاندرۆ))

❖ چۆن چرا بێ ئاگر داناگرسێ،هەروا مرۆڤـ بێ خوا ناژی.

❖ چاکی و باشی حاڵ و گوزەرانمان لە سەر خۆمانە و ئـەوەکانی تـریش لـە سـەر خوا.
((گۆبەرت))

❖ چەندە بەختەوەری،ئەگەر دڵت سەلامەت بێ. ((ئەلزەمەخشەری))

❖ چـی جوانییـەکی سروشـت،دەتوانێ پێـشبڕکێیەکی جـوانی ئـافرەت بکات،کـە خۆشەویستی دەکات.
((لامارتین))

❖ چوار كەس لە چوار شت تێر نابن،خاك لە باران،مێینە لە نێرینە،چاو لە تەماشاكردن،زانا لە زانیاری.

❖ چی خۆهەڵكێشانێ لەوە گەورەترە،بە گوێرەی كوڕێك باسی گەورەیی باوكی دەكات،یاخود بە گوێرەی باوك لە ڕێ و ڕەوشتی باشی شەرەف كوڕەكەی.

❖ جوانترین ئافرەت لە لای من ئەوەیە.. كە تاكو ئێستاكە نەمبینیوە.

((كامیل ئەلشەناوی))

❖ جوانترین شت لە ژیاندا،ئەو سەلاوە ڕوونەیە كە ژن لە مێردەكەی دەكات.

((ویلسۆن))

❖ جوانترین شت لە ڕووی زەوی خواوەند خولقاندبێتی،دەم و چاوی ئافرەتی جوانە.

((ئەلفێرد دی مۆسیە))

## - چ -

❖ چاك وایە،پیاو لە برسا بمرێ،بەلام لە ڕەزیل داوا نەکا.

❖ چەندە ئافرەتان زۆرن کە دلی پیاوان بە ئامانەت دەبەن،بەلام زۆر کەمیان هەیە هەتا هەتایە بۆ خۆی بیبا.

❖ چەند داودەرێك دەناسم،لە نێو خەلکدا بە جەور حوکمیان دەکرد،بۆ ئەوەی ناسراو بن. ((قاسم ئەمین))

❖ چی جوانییەك لە سروشتدا دەتوانێ بەر بەرەکانی جوانی ئافرەتێك بکا،کە دلداری دەکا. ((لامارتین))

❖ چەنە گولە گەنم گەورە بێت دەچەمێتەوە،چەندە زاناییش بچێتە قوولاییەوە لە خۆ دەبێ.

❖ چەندە لەپ گەورە بێ،ناتوانێ بەری خۆر بگرێ.

❖ چەندە جوانە بە دووای سەرکەوتندا ڕا بکەی و چەندە گەورەیە ئەگەر بیگەیتێ،چەندە ناخۆشە کە تێپەڕی بکەی.

❖ چاکە کردن بە زۆرلا نییەو بە دەست خۆتە،بەلام دانەوەی چاکە لە سەرەتە. ((شیشرۆن))

❖ چۆن دایك دەتوانێ بە ئاسانی نهێنییەکانی کچەکەی بلا نەکاتەوە،چونکە خۆشی لە تەمەنی ئەودا هەمان نهێنی هەبووە. ((مۆریس گۆرسۆن))

## - د -

❖ دەتوانرێ ئافرەت بکرێتە سێ بەشەوە،لە بەشی یەکەمدا خەو بە خۆشەویستییەوە دەبینێ.لە بەشی دووەمدا دەستی پێدەکات.لە بەشی سێیەمدا بە پەرۆشەوە بۆی دەڕۆن. ((ئەنتوان بروسابیر))

❖ دەتوانی ژنت خۆش نەوێت ودەتوانیخۆشت بوێت،بەلأم بەبێ ئەو ناژیت. ((کیتس))

❖ دڵی ئافرەت موچوڕکە دەیگرێت وەکو گەلأی دار دەلەرێتەوە ئەگەر بای دڵداری پێیدا تێپەڕێ. ((لۆنگەلۆ))

❖ دڵی کچ،گوڵێکە،تەنها ماچی خۆشەویستی دەیکاتەوە. ((ماری ئەرگفتۆن))

❖ دوور نییە ئافرەت درووست بوبێت بۆ جوانی،بەلأم جوانییەکەی ناکرێتەوە،ئەو کاتە نەبێت کە دڵی خۆشەویستی دەکرێتەوە. ((لابرۆییر))

❖ دایك،هەموو باشەو چاکی لێی وەرگرینەو.ئەوە بەسییەتی کە شەرەفی دایکایەتی هەیە. ((جۆبێر))

❖ دونیا دەناسم، لە لەشی ژناندا. ((لۆرانس))

❖ درێژی زمانی ئافرەت سێ ئینجە،بەلأم دەتوانێ پیاوێکی درێژی شەش پێ بکوژێت. ((یابانی))

❖ دڵێك بێ هێز بێت،ئافرەت نادۆزێتەوە. ((فیتیاس فلتشەر))

❖ دەتوانی چیرۆکی ئافرەت،لە چاویدا بخوێنیتەوە. ((تۆماس مۆر))

❖ دڵی ئافرەت،لە بیست ساڵیدا وێنەیەکە لە شیردان،لە تەمەنی سی ساڵیدا گۆرەپانی شەڕە،لە پەنجا ساڵیدا مۆزەخانەیەکی بیرەوەرییە. ((ماری کوریللی))

❖ دڵی ئافرەت، وەکو عەنبەرە،بۆنی دەرناچێ ئەگەر نەسووتێ. ((زەهاوی))

❖ دڵی ژن لاوازترین شتە. ((شکسپیر))

❖ دڵی ئافرەت،گۆڕەپانی شەڕە تەنها پیاوی چەکدار تێیدا سەرکەوتوو دەبێت.

((ئەندریە مۆرا))

❖ دڵی ژن ئۆتێلێکی گەورەیە، چەندەها هات و چۆکەر ومیوانی هەیە.

((مارك توین))

❖ دەوڵەمەندانی ڕەزیل،وەکو هێستر و کەر وان،بارەکەیان زێڕو زیوەو خواردنیـان (کا)و(جۆ)یە. ((هەندێ لە ژیرەکان))

❖ دەوڵەمەندی ڕەزیل،وەکو بەهێزی ترسنۆکە. ((ژیرێك))

❖ درۆزن پێویستە بیری تیژ بێ. ((کۆنتلیاس))

❖ دیبلۆماسی،ئەو کەسەیە،کە بتوانێ هەموو کەس بەو ڕێگایەدا بڕوا کە تۆ پێیـدا دەڕۆیت.

❖ دوور نییە هەژار ترین کەس باشترین برادەرت بێ.

❖ داوای زانست بکە،لە لانکەوە تاکو قەبر. ((عەرەب))

❖ دروونەوەی ژیان بدوورنەوە،وەکو چۆن گوڵە گەنمی پێگەیشتوو دەدورێتەوە.

((مارکۆس ئۆیلیوس))

❖ دەبێ مرۆڤـ ئیشێ بکاو کاتی خۆی پێ بباتە سەر. ((ناپلیۆن))

❖ درۆزن،دزە،دز سامان دەدزێ و درۆزن ئەقڵ دەدزێ.

❖ درۆ،دروشمی خیانەتە و لادانە لە زانست. ((عەلی کوڕی عوبەیدە))

❖ دوو زمان،باسـی باشـترین خـەڵك بـە خراپـە دەکا،چـۆن چـۆلەکە دەنـووك لـە باشترین میوە دەدات. ((باکۆن))

❖ دەڵێن ڕەزیل برادەری نییە،بەلآم خۆشی شکات ناکات. ((مارکەر))

❖ داواكردنی شتێك نەشونما دەكا،بەلاَم كە چنگ كەوت،تووشی تۆز و لە ناوچوون دەبێ. ((مارسیل برۆست))

❖ دوور نییە،ئافرەت ئەو پیاوەی خۆشبوێ،ڕوو بەڕووی بوەستێ و دڵی خوێنی لێ بچۆڕێ. ((هیندی))

❖ دز،لە سەر سواڵكەر خەتەر نییە.

❖ دانانی شتێك بە بێ ئیش،وەكو هەورێكی بێ بارانە.

❖ دڵۆپەیەك،لە سەر دڵۆپەیەك،دەریایەك،زانینێك،لە سەر زانینێك،زانستێك.

❖ دەزانم بەرەو پیری دەڕۆی ئەگەر بۆكچێك بزەت كرد،ئەو وا تێدەگا كە خزمیت

❖ دەنگی خۆش ئەو دەنگەیە لەش و دڵ بۆی دەڕوا،دەنگ خۆشیش ئەو مۆسیقایە نییە لە دەمەوە دەردەچێ،بەڵكو هەستێكە كە لە دڵەوە هەڵدەقوڵێ.

((ئومكەلسوم))

❖ دوو دڵی چاڵێكی قووڵە،باوەڕ تێی دەكەوێ.

❖ دڵ،دەمارەكانی نهێنییەو زمانیش كلیلێتی،باهەر مرۆڤێك كلیلی نهێنی بپارێزێ

❖ دنیا،بۆ پیاو ژیر، تەسك نابێتەوە. ((ئەڵمانی))

❖ دڵۆپە لە سەر دڵۆپە،دەریا، پەند لە سەر پەند،زانیاری. ((چینی))

❖ دوور نییە ئافرەت،خۆشەویستییەكی دوور و درێژ لە بیر بكا،بەلاَم هەرگیز خرمشكێكی بچووكی كە لە پیاوەوە تووش بووە لە بیر ناكا. ((ئەلعەقاد))

❖ دۆزینەوەی ڕاستی گران نییە،بەڵكو گران ئەوەیە،ئەگەر دۆزیتەوە لێت ڕا نەكا.

((تایلەندی))

❖ دەڵێن ئەوانەی توانای زۆریان هەبێ،توانای كەمیشیان هەیە،ئەمە هەموو دەم ڕاست نییە،ئەوانەی ئەقڵیان زۆرە،لە شتی گەورەدا زیاتر سەركەوتوون تا بچووك.

((گۆستاف لۆبۆن))

❖ دوو شــت هــەر چــەندە پــڕی بکەیت،هــەر جێگــەی یــەکێکی تــری تێــدا دەبێتەوە،کیسەی ڕەزیل و دڵی ژن. ((ئەندریە مۆرا))

❖ دڵی ژنان،وەکو لمـی دەریـا وایە،ئـەوەی لـە وێـوە تێدەپـەڕێ.ئـەوەی دوێنـێ نووسراوە نایبینێ. ((هەندی لیتڵ))

❖ دڵی دایك،گەورەترین شتە لە بووندا. ((ئەلیکساندەر دیماس))

❖ دڵی ئافرەت وون کەرە،ئەوەی تێیدایە ڕێگاکەی وون دەکا. ((راسکین))

❖ دڵی ژن،ئەوەندە ئاڵۆزە وەکو گلۆڵەیەکی ئاوریشمی ئاڵۆزە. ((لیمۆنان))

❖ دەنووسم،بۆئەوەی نەکوژێمەوە،چونکە هەمیشە لە حاڵەتێکی داگیر ساودام. ((ئەلبرتۆ مۆرافیا))

❖ دەنووسم،بۆ ئەوەی ئاوی دەریا ووشك نەکات. ((گارسیا مارکیز))

❖ دوو ڕێگا هەیە بۆ دەوڵەمەندی،یا دەبێ زۆرت هەبێت،یاخود بەکەم ڕازی بیت.

- ٥ -

❖ هەر كەسێك،بە بێ خۆشەویستی ژنی هێنا،بە خەفەتباری دەژی.

((ئیسپانی))

❖ هەر كەسێ ئافرەتی دەوڵەمەند بخوازێ،سەربەستی خۆی دەفرۆشێ.

❖ هەموو ژنانی بەختەوەر لە یەك دەچن،بەلاّم ئافرەتی بێزار،كەس لە ژیاندا لەو ناكا.

((تۆڵستۆی))

❖ هەل،بۆ هەموو كەس هەڵناكەوێ،تەنها بۆ ئەوانە نەبێ كە بۆی دەگەڕێن.

❖ هاوڕێ،ئەو كەسەیە لە كاتی تەنگانەدا بۆت بوەستێ.

❖ هەموومان سبەینێمان خۆش دەوێ و چاوەڕوانی دەكەین و لەم ڕۆ بێزارین،لەگەڵ ئەوەش ئەمڕۆ كە تیایدا دەژین،دوێنێ بوو زۆر بە ئارەزووەوە چاوەڕوانی بووین.

❖ هیچ كەسێك ناتوانێ وا هەستت پێ بكا، كە پلەو پایەت لەو كەمترە ئەگەر خۆت بەوە ڕازی نەبی.

((ڕۆزفێڵت))

❖ هەڵۆ مەنێرە،تاكو كەروێشك نەبینی. ((ڕووسی))

❖ هەوڵو توانای پیاوان كێو لە بن دێنن.

❖ هەتاو بە تیشكی،هەژار و دەوڵەمەند وەكو یەك گەرم دەكاتەوە،بەلاّم هەژارەكان لە بەر كەمی جل و بەرگ،زیاتر پێویستیانە.

❖ هەرگیز ناتوانی هیچ شتێك دەربارەی ئافرەت بڵێی،ئەگەریش توانیت نابێ هیچ بڵێیت.

❖ هەر كەسێ بە قسەی باوكی نەكا،منداڵەكانی بە قسەی ناكەن. ((فەرەنسی))

❖ هەموو بیرو باوەڕێك وهەستێك و خۆشییەك، كە ئەم سروشتە بەڕێوە دەبات،هەموو موڵكێكە بە دەست ژنەوەیە.

❖ هەر میللەتێك قسەیان بە یەك بکەن،ئیشەکانیان بەرز دەبێت و دڕکیان بەهێز دەبێت و دوژمنان لێی دەترسێن.

❖ هەر کەسێ ویستی ئاگرێکی لە پڕ بکاتەوە بە کەمێ پووش دەست پێدەکا.
((شکسپیر))

❖ هەر کەسێ ماندووبوونی و قورسایی خەڵکی کەم کردەوە،گەورەترین سوود مەندە لە ژیانیدا. ((چارلس دیکنز))

❖ هێرش بردنی ژن،فرمێسکێتی.٠بەرگری کردن لە خۆی،هاوڕێیەتی.
((جۆن ستیورات))

❖ هەتاو دەتوانێ ئاوی ئۆقیانووسەکان ووشك بکاتەوە،بەڵام فرمێسکی ئافرەتی بۆ ووشك ناکرێتەوە. ((سوکرات))

❖ هێزی ژن لە زمانییەتی. ((زنجی))

❖ هەرکاتێ تەماشای چاوی ژنێ بکەم،ئیش و ئازارم لە بیر دەچێتەوە.
((هاینێ))

❖ هەندێ کچان دڵیان پاسی ئۆتۆمبێلە،هەر چەندە پڕ بێت،جێگەی زیادەی هەیە. ((ئەتیان رای))

❖ هەموو شەڕێك کە تووشی ئێمە دەبێت،بێگومان ئافرەتێك لە دوواوەیەتی.
((ولیام گڵبەرت))

❖ هەموو ئەقڵی پیاو ناگاتە هەستێ لە هەستەکانی ژن. ((ڤۆڵتێر))

❖ هیچ کەسێك وەسف مەکە پێش ئەوەی تاقی نەکەیتەوە،هیچ کەسێکیش زەم مەکە ئەگەر تاقی نەکەیتەوە،بەو جۆرە بە سەلامەتی دەگەی.

❖ هەر چەندە ئافرەت بە هێز بێ،بەڵام بەرامبەر خۆشەویستەکەی بێ هێزە.

❖ هەر چەندە ترس بڵاوبێتەوە،چپە چپی پێ قەدەغە ناکرێ.

❖ هەنـــدێك (لاكیـــدس)یـــان بینـــی (هەندەســـە)دەخـــوێنیٚ و تەمـــەنی گەورەیە،ووتیان:ئایا کات یارمـەتیت دەدات کـە ئێستاکە فێـر بیت؟ ووتـی :ئەگـەر ئێستاکە ئەو بوارەم نەبوو ئەی کەی دەمبیٚ.

❖ هەموو جیهان جێی دوو کەسی تێدا نابێتەوە کە قینیـان لـە یـەك بیٚ،بـەلاّم لـە دووبست خاکدا جێی دوو دلّداری تێدا دەبێتەوە. ((عەرەب))

❖ هیچ مرۆڤێك ئیشی بە باشە ناکریٚ،ئەگەر خۆی نەیکا. ((ناپلیۆن))

❖ هەر کاتیٚ بینیـت تـووڕە بـوون هێـرش دەباتـە سـەرت بێنـەوە بیرت،پیـاوەتی ئەوەیە،پیاو لە سەرخۆ و نەرم بیٚ، نە ڕێگە بە خۆی بدا بـۆ تـووڕە بوون،هـەر چـەندە پیاو لە تووڕە بوون ڕزگاری بیٚ،ئەو کاتە لە هێزەوە نزیکە.

((مارکۆس ئوریلیۆس))

❖ هەموو کەس دوژمنەکەی بە شەڕخواز دەزانیٚ. ((ئینگلین))

❖ هەر کەسیٚ برادەری ڕاستی هەبیٚ، ئەو دەولّەمەندە. ((ئینگلین))

❖ هەموو ژنە بەختەوەرەکان،لە یەك دەکەن،بەلاّم ژنی داماو لە هیچ شتێك ناکات. ((لیو تۆلّستۆی))

❖ هیوای ژن داوێکە لە داوی هەتاو. هەر سێبەرێك بەسە بۆ نەمانی.

((ریبکاردۆ))

❖ هەر چەندە ژن لە ئیش و کاریدا سەرکەوتووبێت.ژیانی سەرکەوتوو بـەختیاری نابێت،ئەگەر لە تەنیشت مێردەکەیەوە نەبێت ((شیلی وەنتەرز))

❖ هیچ شتێك نییە ڕێزی ژن بە قەد پاکی بەرز بکاتەوە. ((ئەدیسۆن))

❖ هەر چەندە ناوم دەرکردبیٚ و پلـەو پایـەم بـەرز بووبێـت،..هـەمووی بـۆ دایکـم دەگەڕێتەوە. ((جۆن ئادمز))

❖ هیچ نهێنییەکت بەکەس مەلّیٚ،ئەگەر نهێنی لات نەبیٚ. ((ئیمامی عەلی))

❖ هەولّدان بەری ئیش کردن زیاد دەکا،تەمەلّیش زۆرانبازێکی زەرەرمەندە.

((هیسیۆدس))

❖ هەوڵدان باوکی ناودارییە. ((یورپیدس))

❖ هەموو ئەوانە دەدوورنەوە کە ناشتوویانە. ((بلۆتس))

❖ هەوڵ بدە خۆت بناسە،ئەوە گرانترین وانەیە کە بیزانی.

❖ هەرکاتێ بازاڕ کز بوو،شت بکڕە،ئەگەریش بازاڕ هەبوو کەم کەم بفرۆشە.

((پۆلانۆ))

❖ هەژاری عەیب نییە،بەلاّم تەمەڵی عەیب و عارە. ((تورك))

❖ هەموو دەمێك دەتوانم کتێبەکانم بخوێنمەوە،هەمیشە بەڵێنی چاوەڕوانیم لە گەڵیدا نییە. ((شیشرۆن))

❖ هێمنی و لە سەر خۆیی،پەردەیەکی داپۆشراوە،ئەقڵیش شمشێرێکی بڕێنەرە.

❖ هەر کەسێ بەقسەی تووڕە بوونی بکا،ئەدەبەکەی وون دەکا. ((عەرەب))

❖ هەموو کەس سەرمایەیەکی هەیە،سەرمایەی دەلاّڵ درۆیە. ((یەکێك))

❖ هیچ خۆشییەك،لەوە خۆشتر نییە کە لایەنی حەق بگری. ((باکن))

❖ هەر کەسێ پەرتوکێکی بەکەڵك لە ناو بەرێ پیاوێ دەمرێنێ. ((ملتۆن))

❖ هەرچی شتێك بخەینە سەر زانیاری،سەرخستنێکە بۆ هێزی مرۆڤایەتی.

❖ هەموو شتێك بۆ خۆشەویستی.هەموو شتێکیش بۆ خۆشەویستی ئەمەیە دروشمی ئافرەت. ((دۆمیس))

❖ هەموو ئەقڵی پیاوان لە تایەکی تەرازوودا بێت،ناگاتە خۆشەویستی ژنێك لە تاکەی تردا. ((ڤۆلتێر))

❖ هیچ کەسێك لە خۆشەویستیدا نەمردووە،بەلاّم زۆر کەس لە قیندا دەمرن.

❖ هاوڕێ ناناسرێ لە تەنگانەدا نەبێ. ((جۆن هیود))

❖ هەرکەسێ لە گەڵ کەرەکەیدا بەر بەرەکانی بکا بەکەر دەبێ. ((چینی))

❖ هێز لە دەستەوە نایەت،بەڵکو لە بیکردنەوەو ئەقڵێکی سەلامەتەوە دێت.

❖ هێز،حەقنییە،بەڵکو حەق،هێزە. ((ئینگلیز))

❖ هەر کەسێ هەنگوینی زۆری بۆ هێنای،خۆشەویست نییە بەڵکو ئەوەی بە ڕاستی ئامۆژگاریت دەکا،خۆشەویستە. ((چینی))

❖ هاوکاری کردن لە گەڵ بە هێزەکاندا ئیشێکی سەلامەت نییە. ((فیدەر))

❖ هەموو مرۆڤێك خۆشەویستی دەکا،ئەگەر خۆشەویستەکە نەما،یا بە خۆشەویستەکە گەیشتن،خۆشەویستی نامێنێ،بەلاَم من خۆشەویستی دەکەم لە منداڵیمەوە تاکو پیریم بەڵکو تا مردنم،شتێکم خۆشویست،ئەو خۆشەویستییە لا ناچێ و کەسیش ناتوانێ داگیری بکا،ئەوەش خۆشەویستی خۆیەتی. ((بتهۆڤن))

❖ هەست کردن بە مەسئولییەت لە شتە بەرزەکانە کە پێویستە هەر یەکە لە ئێمە چاوەڕوانی بێت. ((کلۆدی مەکدۆنالد))

❖ هەموو مرۆڤێك دەتوانێ هەڵە بکا،بەلاَم هەمووان ناتوانن لە سەر ڕاست بن.

((شیشرۆن))

❖ هیچ فیلێك لەو فیلە،فیلتەر نییە،کە لە لای یەکێك نهێنیت باس دەکەیت و ئەویش خیانەت دەکا. ((ئینگلیز))

❖ هەر بەختیارییەك لە دەرەوەی لەش بێت، خەیاڵ و هیچ و پوچە و ئەوەندەی پێ ناچێ و نامێنێ و دەڕوا.

((ئەمینلغەریب،خاوەنی ڕۆژنامەی—الحارس —ە لە لوبنان))

❖ هەموو خەڵکی بەختیار نین،بەلاَم لە توانایاندا هەیە بەختەوەر بن،بەلاَم ئەگەر گوێیان بە هۆیەکانیان نەدا و بەختیاری تێپەڕیانی کرد گلەیی لە سەر خۆیانە.

((فەرەنسی))

❖ هیچ کەس لە خۆت بە هێزتر نییە،بۆ ڕێگا پیشاندانت بۆ چاکە کردن.

((شکسپیر))

❖ هێزی دە پیاوم هەیە چونکە دڵم پاکە. ((تەنسین))

❖ هیچ خەفەتێك نییە لە جیهاندا،زەمان نەتوانێ جێ بەجێی بکا. ((ڕۆمانی))

❖ هیچ مرۆڤێك ناژی بەبێ باوەڕ. ((چیخۆف))

❖ هەر چەندە ڕۆشنبیریی پیاو زیاد بکا،ناخۆشیشی زیاد دەکا. ((چیخۆف))

❖ هەر چەندە ژن ژیر بێت،ئەگەر جوان نەبوو،زیرەکییەکەی سوودی نییە.

((سۆمەرست مۆم))

❖ هەر ئافرەتێکی جوان ببینین،بەهەشتی (عەدەن)مان وەبیر دێنێتەوە.

❖ ((شیلدت))

❖ هەر چەندە ژن زیاتر ئیهتمام بە دەم و چاوی بدا،گوێ بە ماڵەکەی نادا.

❖ ((بن جۆنسۆن))

❖ هەموو شتێکی ئافرەت جوانە،تەنانەت ناشرینەکەشیان. ((لۆرانس))

❖ هیچ لەوە گرانتر نییە کە ژن قەناعەت بە خۆی بهێنێ،کە جوانییەکەی نەماوە،کە لە کاتێکدا جوانی و ڕازاندنەوەی بووە. ((ڕۆشیرۆن))

❖ هیچ چارە نییە ژن و پیاو پاش ژن هێنان ببنە یەك کەس،بەڵام کام یەك لەم دووانە ؟ئا لێرەدا دووبەرەکی دەست پێدەکا. ((بێلی ڕۆن))

❖ هەموو ژنێك ئافرەتە.. هەموو ئافرەتێك ژن نییە. ((س.ص.ع))

❖ هەموو ئافرەتێکی تەماع کار هیچ چارەی نییە دەبێ شوو بکات

((ئۆستەر ویلمان))

❖ هەڵەمان نەکردووە کە دەڵێن ژن نیوەی پیاوە، لە بەر ئەوەی پیاوی ژندار تەنها نیو پیاوە. ((ڕۆمان ڕۆلان))

❖ هەموو خەڵکی داوای بەختیاری دەکەن،بەڵام کەس دەیدۆزێتەوە،ژیریش ئەو کەسەیە بەدووای هیوا و ئاواتا چەند میلێك بگەڕێ،نەك داوای خۆشی بکا ((ئەلبۆرد ئەفبەری،یەکێکە لە هەرە نووسەرە بەناوبانگەکانی ئینگلیز))

❖ هەموو شتێك شیاوی تازە بوونەوە و نەمانە. ((سالۆستۆس))

❖ هیچ شتێك وەکو سەرخۆشی،نرخی پیاو کەم ناکاتەوە. ((دۆلتەر سکۆت))

❖ هاوڕێکەت بە درۆیەك تاقی بکەرەوە،ئەگەر بلاوی کردەوە،نهێنی پیێ مەلێ.

❖ هونەری جوان، ئەو ئیشەیە،کە سەرو دڵ و دەس بەشداری تێدا دەکەن.

((راسکین))

❖ هەموو ڕۆژێك وەکو ئەوە بژی،کە دووا ڕۆژت بێ. ((بێلیۆس))

❖ هەمووومان لە بەردەم مردنا،وەکو یەکین. ((بێلیۆس))

❖ هەندێ کەس زۆرئیش دەکاو ماندوو دەبێ، بۆ ئەوەی تاکو مردن بە باشی بژین

❖ هونەری بێنرخ وەکو نەخۆشییە،کە ئازاری مێشك دەدا،بەلام هونەری بەرز وەکو دەرمانی تاڵ وایە،بەلام پێی چاك دەبیتەوە. ((زەکی تولەیمات))

❖ هەموو ئەو شتانەی پێویستە مەیکرە،بەلام ئەوانە نەبێ کە بێ ئەوانە ناژی.

((سویسری))

❖ هەر کەسێ خۆشەویستی زانی،بێزاری نازانێ،خۆشەویستی لاوێتییەو بەخشەندەو خواردنە.

❖ هێمن و لە سەر خۆبە،تەمەن درێژ دەبی،توورەبوون شێتییەکی کاتییە،زاڵبە بەسەریدا پێش ئەوەی ئەو زاڵ بێت بەسەرتا. ((بێل کارنجی))

❖ هونەری ڕاستی دروست نابێ،ئەو کاتە نەبێ بۆ ژیانێکی باشتر کە هەموو کەسێك (تەمەتوعی)پێ بکا. ((فاکنەر))

❖ هیچ هێزێك لە ژێر خاکدا نییە بتوانێ مرۆڤ و ئەقڵی داگیر بکا.

((محەمەد عەلی حوسین))

❖ هیچ شتێك ئازایەتی لە میللەتی گەورەدا بەرپا ناکا،ئەو کاتە نەبێ کە تووشی خەتەر دەبێ. ((ناپلیۆن))

❖ هیوا ئەو دەزووە باریکەیە،کە ڕێگەی ژیانی بۆ ڕوون دەکاتەوە.

❖ هەموو ژنانی بەختیار لە یەك دەچن،بەلاّم ژنی بەدبەخت لـە ژیانـدا هـیچ کـەس لەو ناکا. ((تۆلستۆی))

❖ هــەموو ئەشــکەنجەکانی ژیــان هــیچ نییە،بەلّکــەش ئەوەیــە،کاتیّ ئــازارو ئەشکەنجەکانت بیر دەکەویّتەوە بە بچوکی دەیان بینی.

❖ هاوڕێیەتی ئافرەت،نزیکە لە دلّدارییەوە. ((تۆماس مۆر))

❖ هەمیشە شتی تازە لە سەر ئافرەت دەوترێت،تاکو ئافرەت لە سەر زەوی مابیّ. ((دۆبۆلفێر))

❖ هەرکـە ببـنیم پیاوێك،گەیـشتۆوەتە ترۆپکـی بـەرزی،باوەڕم وایـە ئـافرەت لـە تەنیشتییەوە وەستاوە و خۆشی دەویّ وئەویش ئەوی خۆش دەویّ.

((بلزاك))

❖ هەموو شتێك پاداشتی هەیەو هەموو قسەیەکیش وەلاّمی هەیە. ((عەرەبێك))

## - و -

❖ واتاو ڕەنگ :

- سپی : پاکی و ڕووناکی و خۆشی.
- ڕەش :تاریکی و خەفەت.
- زەرد : هەتاو زێڕ داڕە.
- سوور : هەستی هەڵچۆ و هێز و دژوار.
- شین،برادەری و زیرەکی و ئاسمان.
- مۆر :خۆشەویستی زیرکی.

❖ ووشەیەکی تیژ،لە شمشێر تیژ ترە ((ئینگلیز))

❖ وا باش دەزانم،سەربکەوم بەسەر خەڵکیدا بەچاکە،نەك بە زۆر کردنی سامان و موڵك و دەسەڵات. ((ئەسکەندەری گەورە))

❖ ولاّتی ئافرەت،مێردەکەیەتی. ((ووتەیەکی حەبەشی))

❖ ولاّتی دونیا،لە سێ شتدا کۆدەبێتەوە،ئاو و ئاگرو ئافرەت.٠ئاو دەخنکێنێ،ئاگر دەسوتێنێ،ئافرەت شێت دەکا. ((تورك))

❖ وەختێك ژن تووڕە دەبێت،دەمی دەکاتەوە و چاوی دەنوقێنێ. ((کاتۆ))

## -ز-

❖ زۆر شت بەستراوە بە كاتەوە،ئەو كەسەی ئەو هەلە وەدەس نەهێنیٚ لە دەستی دەڕوا. ((عەرەب))

❖ زۆر زەحمەتە رایەك لە مێشكی ئافرەتا بسڕێتەوە،یا لە مێشكی دەری بكەی چونكە لە پرچی سەقام گیرترە. ((ئینگلیز))

❖ زۆر جار هیواكانمان بەدی نایەت،لە هەمووی خراپتر ئەوەیە كە هیواكانمان زۆر بیٚ. ((شكسپیر))

❖ زۆری زانیاری فێربوون لەو كتێبانەوەیە،كە ئەوانەی چاپیان كردووە و زەرەریان لێی كردووە.

❖ زانیاری كانزایەكە،كلیلەكەی ئیش كردنە.

❖ زانست هاوڕێی پیاوە،لە سەرخۆییش وەزیرێتی،ئەقڵیش ڕابەڕێتی،ئیشكردن فەرماندەیەتی،دڵسوتانیش باوكێتی،سەبركردنیش سەربازێتی.((ئەلشبراوی))

❖ زانست بە بیٚ ئیشكردن وەكو دارێكی بیٚ بەرە. ((عەرەب))

❖ زانست باشترین خواردنە بۆ پیرێتی.

❖ زانا،بۆ كویٚ بڕوا سامانی لە گەڵیەتی. ((سوكرات))

❖ زمانی،دوو زمان،وەكو كلكی ڕێوی وایە،كە شەمشون بە كلكیانەوە مەشخەڵی بەست.

❖ زمانی،دوو زمان،وەكو ئاگر وایە بە چاك و خراپەوە دەنوسیٚ،وەكو چۆن ئاگریش دەشت و گیا دەسوتێنیٚ. ((مسەیلون))

❖ زۆرە بێدەنگەكان،قەرەباڵغی دروست ناكەن بەڵام مێژوو دروست دەكەن. ((بیرتۆر))

❖ زۆر شت ڕوو دەدا بەبیٚ ئەوەی پیاو چاوەڕوانی بكا،تەنها مردن نەبیٚ،كە چاوەڕوانێتی،هەر چەندە زەمان درێژ بیٚ،یا كورت.

❖ زانایەك ووتی :(ئەگەر جەورت لە یەکێ لە خۆت خوارتر کرد ئەوەی لە سەرووی تۆووەیە سزات دەدا).

❖ زۆر ئاسانە سکی بیست کەس تێر بکەی،بەلاَم زۆر گرانە دوو چاو تێر بکەی.
((وێژەی ڕوسی))

❖ زانست بەرەو دۆستایەتی دەڕوا،ڕاستیش بەرەو ڕوناکی دەڕوا.
((جۆلیۆ کۆری))

❖ زانست ئەگەر زانست نەبێ،مانای ژیانمان نەدەزانی و لە تاریکیدا دەژیاین.

❖ زۆر ئاسانە لە لام،هەموو ئەوروپا یەك بخەم، لەوەی دوو ئافرەت بەیەکەوە بنێم. ((لویسی چواردەهەم))

❖ زێڕ بە ئاگر تاقی دەکرێتەوە،پیاو بە ڕاڤە. ((سنیکا))

❖ زانست کانزایەکی پڕی داخراوە، کلیلی بەردەوام بوونە. ((چینی))

❖ زۆر بزەمان لە بزەی یەکێکی کەوە هاتووە.

❖ زمان بۆی هەیە وشەیەك دەرپەڕێنێ، لە ئەسپ تیژتر بێ. ((چینی))

❖ زانست مرۆڤــ،کانزایەتی.

❖ زەرور نییە قسەکەم مەقبوول بێ،بەلاَم پێویستە ڕاست گۆبم. ((سوکرات))

❖ زۆر جار سەبر کردن، لە دەوڵەمەندی باشترە.

❖ زێــڕو زیــو،جێی شــانازی دەوڵەمەندەکانە،بــەلاَم هــەژارەکان مێــشکیان لــە ئیسراحەت دایە. ((موسڵەحددین سەعدی))

❖ زانست چرای ژیانە و نەزانی تاریکییەتی.

❖ زانیاری بە لاوێتی دەمێنێتەوە،ئەگەر چی پیریش بێ.

❖ زۆر جـار پیـاو لـە خـەون دەژی و بەس،ــپاشان ئافرەتێك دێـت و خەونـەکانی دەکاتە ڕاستی.

❖ زانیاری،دارێکە لە دڵدا سەوز دەبێ و لە سەر زمان میوە دەگرێ.

❖ زمانت فێر بکە بەوەی بڵێ نازانم. ((پۆلانۆ))

❖ زۆر ئاسانە کە بەچەرمە سەری خەڵك پێبکەنی،بەلام ئازایەتی لەوەدایە کە تووشی خۆت بوو پێبکەنی.

❖ زەردەخەنەی ژن،پرشنگێکە لە پرشنگەکانی هەتاو. ((ڤۆلتێر))

❖ زۆر جار ناخۆشی و نەهامەتی،وا لە ئافرەت دەکا بۆ ڕێگەی خۆشەویستی. ((ئەتیان ڕای))

❖ زۆر سەیرە ئێمە ئافرەتی جوان،وەك ئافرەتی باش سەیر بکەین،کە قسەی هیچ و پووچ دەکات،وەکو بڵێی ئێمە گوێ لە پەند دەگرین. ((تۆلستۆی))

❖ زمانی ژن شمشێرێکی هەڵکێشراوە. ((سوکرات))

❖ زمانی ژن شمشێرێکە مەیەڵە ژەنگ بیگرێت. ((باسنگ))

❖ زیندوو زیاتر پێویستی بە خێرە لە مردوو. ((جۆرج ئارنۆلد))

❖ زۆر خواردن دڵ دەمرێنێ،چۆن ئاوی زۆر سەوزایی دەمرێنێ.

❖ زمانی ژن لەشێکە بە بێ دەرپێ. ((ڕۆسۆ))

## - ژ -

❖ ژن هێنانت بە ژنێکی بێ ئەقڵ و لە سەرخۆ،باشترە لە ژن هێنانت لە ژنێکی ژیرو گیرو گرفت دروست کەر. ((رۆس ستافۆردنیل))

❖ ژن قازانێکە هەموو جۆرە گژو گیایەکی تێدا دەکوڵێ. ((وتەیەکی ڕوسی))

❖ ژیری ئەوەیە داوای ئاشکرا بوونی نهێنییەك نەکەی،ئەگەر نهێنییەکەت زانی،ڕاستی ئەوەیە بلاّوی نەکەیتەوە. ((ئینگلیز))

❖ ژیر، ئاگاداری سامانی دەبێ. ((وێژەی یابانی))

❖ ژیر،هەمیشە بە دوای زانیاریدا دەگەڕێ،نەزانیش وا دەزانێ دۆزیویێتیەوە.

((ئینگلیز))

❖ ژیرێك وتی: چۆن قاپێك سوودی نییە کە ئەوەی تێدایە نەیگرێت خۆی،هەروا ئەو سنگەش سوودی نییە ئەگەر نهێنییەك بە خۆ نەگرێ.

❖ ژیرێتی نییە،هەموو جار ماف بلاّوبکرێتەوە. ((ئینگلیز))

❖ ژن مەهێنە ئەگەر بە خۆشەویستی نەبێت،تەنانەت ئەگەر ئەو خۆشەویستییە لە پێناوی سامانیشدا بێت. ((والترونیشڵ))

❖ ژیانی ئافرەت کتێبێکی گەورەیە،لە سەر هەر پەڕەیەك لە پەڕەکانی ووشەی خۆشەویستی نووسراوە. ((شۆبان))

❖ ژنێك نییە،خۆشەویستی لەیەك کاتژمێر زیاتر بەردەوام بێت.

((ماری کۆریللی))

❖ ژن تەنها یەك کەسی خۆش دەوێ، ئەویش خۆیەتی. ((مستەفا کامیل))

❖ ژیان مانای نییە لە گەڵ وورە بەردانا، وورە بەردانیش مانای نییە لە گەڵ ژیاندا. ((مستەفا کامیل))

❖ ژیان،تەنها بزەی هەتاوەو پەیدابوونی بەهارەو هونەری سرووشتەو بێدەنگی ئازارەو ڕاڕایی ئافرەتە. ((گیتە))

❖ ژنان،لە پیاوان پاكترن،چونكە ژن خیانەت بە شكاندن دەزانێ،بەلاّم پیاو بە سەركەوتنی دەزانێ. ((ئۆجین سێ))

❖ ژیان،سێبەرێكی نەماوەیە،نەك وەكو سێبەری قوللەیەك یا سێبەری دارێك كەمێكی دەمێنێ،یا وەكو سێبەری باڵندەیەكی فڕیوی لێ دێ،نە باڵندەكەو نە سێبەرەكەی دەمێنێ. ((وێژەی یابانی))

❖ ژنی جوان،پێویستی بە كراسی جوان نییە. ((ئەلفێردی دی مۆسیە))

❖ ژیانی ژن گۆرانییەكی جوانە،بۆ ئەو كەسەی كە بزانێ چۆن دەیڵێ و لێی دەدا. ((شۆبان))

❖ ژنی جوان وەكو گوڵی بۆندار وایە،هەرگیز سیس نابێت،ئەگەر دەستی لێوە دوور بێت و یاری پێنەكا. ((حەنەفی محەمەد سەعید))

❖ ژنی هەژار،زیاتر خۆی بەسەر مێردەكەیدا هەڵدەكێشێ لە ژنی دەوڵەمەند. ((رای فەردی))

❖ ژن،یەكە لایەنە كە لە شەریكایەتی ژن هێنان قازانج دەكا ((سیدنی سمیس))

❖ ژنانی خەڵكی تر هەمیشە باشترە. ((وتەیەكی چینی))

❖ ژنی ژیرماڵی پیاوەكەی دروست دەكات بێ ئەقڵیش دەیڕوخێنێ. ((سولەیمان كوڕی داود))

❖ ژنی باش،لە دایك و خوشك و برادەر دەكا. ((ئەبو حەنیفەلنوعمان))

❖ ژن،مرۆڤێكە دوو ڕووی هەیە،ڕوویەكیان لە شەرما سوور هەڵدەگەڕێ،ئەوی تریان واتای شەرم نازانێ. ((بەرناد شۆ))

❖ ژن،زۆر حەز دەكا لە دڵدارییەوە پێبگا،لە تێگەیشتنی دایكایەتی و پێگەیشتنی. ((ئەمیل لۆدفیچ))

❖ ژیان لە گەڵ پیاودا ژیرییە و لە گەڵ ژندا بیٚ ئەقڵییە. ((شۆبان))

❖ ژن،جڵەوی دونیا بە دەستیۆەیەتی،ئەگەر ویستی چاکی دەکات،کەیش ویستی خراپی دەکا. ((لابلان))

❖ ژن،دەژی بۆ ئەوەی بە خۆشەویستی،بەختیار بێت،پیاویش خۆشەویستی دەکا بۆ ئەوەی لە ژیاندا بەختەوەر بێت. ((جان جاك ڕۆسۆ))

❖ ژن،سەرچاوەی بەختیاری و هاوڕێتی و خۆشییە. ((شنینە))

❖ ژن، نۆ جار زیاتر لە پیاو کەیف خۆشتر دەبێت. ((باباس))

❖ ژن،لە ژیاندا هیوای هەموو پیاوێکە. ((شیلەر))

❖ ژن، بە هەموو جۆرەکانییەوە لە پیاو زیاتر توانای ئازاری هەیە.

((ردیارد کبلنگ))

❖ ژنان، بەوە زیاتر کەیف خۆش دەبن،کە خۆشی بخەنە دڵی خەڵکییەوە،نەك بە دڵی خۆیانەوە. ((ڕۆشید یپر))

❖ ژن،یا ڕزگارکەر یا ڕوخێنەری خێزانە،دووا ڕۆژی هەریەکە لە خێزانەکەی لە ناو لۆچەکانی کراسەکەیدایە. ((ئەمیل زۆلا))

❖ ژنەکەم وای لێکردم، کە بزانم من کێم. ((بسمارك))

❖ ژنان،پیاو دروست دەکەن،یەك گەورەم بۆ بێنە پێشانی دەدەم نهێنی گەورەییەکەی دایکێتی یا ژنەکەیەتی. ((د٠حوسێن موئنس))

❖ ژنان،بە دەستیان موحاکەمەی پیاوەکانیان دەکەن و پیاوان موحاکەمەی ژنانیان بە قاچیان دەکەن. ((ئۆسکار وایڵد))

❖ ژن، لە مارەوە سیٚ شت فێر بووە،سەما،غەدر،زمان درێژی.

((عەلی سەعد موراد))

❖ ژن، دوو چاو و دوو لێوو دوو لاقە. ((ئەندریٚ دی بلزاك))

❖ ژن، چوار چەکی هەیە : زمان،نینۆك،فرمێسك،لە خۆچوون. ((ئیتاڵی))

❖ ژن، ئارەزووی لەوەیە،بە گوێ ببیستێ،پیاویش ئارەزووی لەوەیە کە بە چاو ببینێ. ((مارسیل ئەشار))

❖ ژن،بۆ ئەوەی خۆشمان بوێت،نەك لێیان تێبگەین. ((ئۆسكار وایڵد))

❖ ژن، چۆن دەسكێشەكەی دەگۆڕێت،ئاوهاش دڵی دەگۆڕێت. ((بلزاك))

❖ ژنان دڵیان هەیە،بەڵام لە نێوان هەزار دڵدا،یەك دڵێك هەیە،كەمێك پاكە.

((سانت بوف))

❖ ژن، وەكو ئیسفەنجە،ئەگەر گوشیت هەموو ڕەحم و هەستی بەتاڵ دەكەیت،ئەگەر لێی گەڕێت ووشك و سیس دەبێتەوە. ((سۆمەرست مۆم))

❖ ژنی جوان چاو پێی خۆشە،ئافرەتی باشیش دڵ پێی خۆشە یەكەمیان :گەوهەرێكی بە نرخە،ئەوی تریان كانزایەكی گەورەیە. ((ناپلیۆن))

❖ ژن هەموو جۆرە ئازارێك دەخوا،بۆ ئەوەی جوانییەكەی زیاد بكا.

((مۆنتانیۆ))

❖ ژنی جوان بە گاڵتە تیری چاوەكانی لە پیاو دەگرن،ئەو پیاوانەش بەو تیرانە دەمرن. ((شیللی))

❖ ژن،وەكو ئەستێرە وایە،جوانییەكەی بەشەو دەردەكەوێ. ((بایرۆن))

❖ ژنانی باش،وەكو گوڵن لە هەموو جێگەیەكدا دەڕوێن.

❖ ژیان نرخی نییە،تەنها ئەو كاتە نەبێ كە شتێك هەبێ لە پێناویدا تێبكۆشین.

((سۆفاج))

❖ ژمارەكان درۆ ناكەن،تەنها ئەو كاتە نەبێ كە تایبەت بێ بە ئافرەت.

❖ ژیان لە لای من لە هەشتا ساڵیدا دەستی پێكردووە كە هەستم كرد هەمان لاوم،كە بۆ یەكەمجار هاتمە ناو ژیانەوە و لە بەردەم بەری ڕووبارێكدا وەستام كە لە خۆی دەگەڕا، لە هەرای دەریاكەدا. ((سۆمەرست مۆم))

❖ ژیان وەكو بیابانە،ئەگەر ڕێگاكانی نەزانی وون دەبی.

❖ ژیانی ئافرەت زنجیرەیەکە لە هەست وخۆشەویستی،ئازارو قوربانی.

((بلزاك))

❖ ژن هێنان سەرنەکوتووە،بە بەردی بچکۆلەش سەرسەم دەدا،ژن هێنانی سەرکەوتوو لە سەر بەردی گەورە بنیات دەنرێ.

❖ ژنی بە وەفا وەکو ژوورێکی گەرم وایە.

## - ح -

❖ حەسوود،حەسانەوەی نییە.

❖ حەسوودی شتێکی سروشتییە لە ئێمەدا،بەڵام ئەگەر وازی لیٚ بێنین باشترین میوەمان چنگ دەکەویٚ. ((گنسن))

❖ حەسوودی وەکو بڵێسەی ئاگر وایە،ئەوەی لە سەرەوەیەتی ئەگەر نەیسوتێنیٚ ڕەشی دەکا. ((یۆلیۆس قەیسەر))

❖ حەقم خۆش دەویٚ،لە هەڵەش دەبوورم. ((ڤۆلتێر))

❖ حەق،لەو جێگەیەدایە کە هێز پاڵپشتی بیٚ. ((گۆستاف لۆبۆن))

❖ حەزرەتی موسا لە گەڵ خوا دا قسەی کرد ووتی :خوایە کیٚ لە لای تۆ لە هەموو کەس خۆشەویسترە ؟

– ووتی : ئەو زانایانەی کە داوای زانیاری دەکەن.

حەسوود،خۆی دەخوا چۆن ژنگ ئاسن دەخوا. ((ئەستۆ تالیس))

حەسانەوەی لەش لە کام خواردنە.

حەسانەوەی ڕوحیش، لە کام گوناهە.

حەسانەوەی دڵیش، لە گویٚ نەداتە.

حەسانەوەی زمانیش، لە کەمی قسەیە.

## - ت -

❖ تەماشای دەم و چاوی ژن بکە.پاشان حوکم بەسەریا بدە بە پێچەوانەی ئەوەی بۆت هاتووە. ((جاك ليندن))

❖ تاسیری ژن لە سەرمان،لە ژیاندا کۆتایی نییە،چونکە ئەسڵی هەموو شتێکە کە لێمان ڕوو دەدا. ((بيكنسفيلد))

❖ تۆ دەگەیتە دووا پلەی نەشونما کردنی تەواو،ئەو کاتەی یەکەمین پێکەنینی گاڵتە جاڕی بە خۆت دەکەی. ((ئیسیل باریمۆد))

❖ تۆم هەڵبژارد چی بە چاك دەزانی بیکە. ((ڕامبۆ))

❖ تۆ جوان بە، جیهان بە جوانی دەبینی. ((ئیایا ئەبو مازی))

❖ تۆ،هەمیشە چاوەڕوانی ئەو ئافرەتەی کە خۆشەویستی و بەختیاریمان بۆ دێنی. ((شكسپير))

❖ تەمەڵ،برای سواڵکەرە. ((عەرەب))

❖ تۆ چاکە بکە،خەڵکی چی دەڵێن با بڵێن. ((فەرەنسی))

❖ تەمەڵی تاوانێکی گەورەیە. ((رۆزفێلت))

❖ تیمساح،مەکە برادەری خۆت،ئەگەر فرمێسکیش لە چاوی ڕژا. ((چینی))

❖ ترس،چاوی کراوەی هەیە. ((ڕوسی))

❖ تەمەڵی، لە ئێستاوە، وەکو قەمچییەکە لە شاخ.

❖ تۆز، بەرز دەبێتەوە و بەرزدەبێتەوە،پاشانیش بە توندیش دەنیشێتەوە.

❖ تاجی پادشاهان لە زێڕە،تاجی قوتابیش ئەدەبەکەیەتی.

❖ تووڕە بوون شیرینە،بەڵام بەرەکەی تاڵە،ئامۆژگاری تاڵە،بەڵام بەرەکەی شیرینە ((عەرەب))

❖ تووڕە بوون لای پیاوی باش، كەمە. ((ئینگلیز))

❖ تووڕە بوون وەكو یەكێكی سەر بەتۆ وایە،یەكەم جار دەتجولێنێ بۆ بەرژەوەندیت ئەگەر بە قسەیت كرد،بەرەو بەرژەوەندی خۆی دەتجولێنێ.

((ئەفلاتوون))

❖ تا دەتوانی چاكە لە گەڵ خەڵكدا بكەو زەرەر بە كەس مەگەینە.

((تەنسین))

❖ (تیفۆنی) دەربارەی ڕەزیل ووتی : سامانی مرۆڤ لە گەڵدا بۆ قەبر نایەت.

❖ تووڕە بوونی نەزان لە قسەی دایەو تووڕە بوونی ژیریش لە ئیشیدایە.

((عەرەب))

❖ تاكو ئێستاكە پیاو هیچ ڕێگایەكی نەدۆزیوەتەوە، كە ئافرەت ئامۆژگارییەكانیان قەبوڵ بكەن،تەنانەت ژنە كانیشیان. ((بلزاك))

## - ی -

❖ یەك ژن،بووە هۆی ئەوەی ئادەم نەوەكەی لە بەهەشت دەر بكا،ئەی رات لە سەر ئێمەی پیاو چییە كە ئەرز لە ژن پڕە. ((س٠ ص٠ ع))

❖ یەكە جێگا كە دەتوانم لە سەری دانەم و بە ئیسراحەت و بە دڵنیاییەوە بخەوم،ئەوە كۆشی دایكمە. ((ڤۆلتێر))

❖ یەكەمین جودایی،لە نێوان ژن و پیاودا،سەبر كردنە لە سەر ئازار٠ژن فێرە دەربارەی ئازار٠بەلأم پیاو٠نە ء ((فردریك برۆكۆش))

❖ یەك بزە،لە لێوی خۆشەویستەكەم٠٠دەرگای بەهەشتم بۆ دەكاتەوە. ((گۆتە))

❖ یەكەمجار حوكمی خۆت بدە،بۆ ئەوەی حوكمی ژنەكەت لە لات ئاسان بێت. ((فۆلەر))

❖ یەكەمین دڵداری لە لای پیاو شەرمە،یەكەمیش لە لای ئافرەت جورئەتە. ((هۆگۆ))

❖ یەك تەماشایە بە تیلەی چاوی ئافرەتێك،یا وات لێدەكات بەختیارترین مرۆڤبیت یا لە هەموو كەس خراپتر بیت. ((جوبران خەلیل جوبران))

❖ یەك تۆز لە پشت ئاسنەوە بوەستم،هەزار خوێندنەوەی كتێبم لە بیر دەباتەوە، كە لە سەر سەربەستی خوێندومە.

❖ یەك كات ژمێر ئیش كردن،خۆشی دروست دەكات،حەسوودی و تەمەڵی،ئەمەش لە چەند مانگێكی گریان باشترە.

## - ك -

❖ کاتێ خۆشەویستی هات، سەری بۆ دادەنوێنین. ((لەیلا حەمادە))

❖ کەی تووشی نشوستی بووین،ئەو کاتە دەزانین بەختیاری چییە.

((ئینگلین))

❖ کاتێ پیاو ئافرەتێکی خۆش بوێت،لە پێناویدا هەموو شتێك دەکات.

((م.ع))

❖ کەرێك هەڵتگرێ باشترە، لە ئەسپێك بە ئەرزت دا بدا.

❖ کتێبی بێ کەڵك لە جیهاندا نییە، با زۆر هیچ و پوچیش بێ.

❖ کۆیلە،سەربەستە،ئەگەر قەناعەت هەبێ،ئازادیش کۆیلەیە ئەگەر تەماعی هەبێ.

((ژیرێك))

❖ کەمی تەماع کاری،تووشی زەرەری زۆرمان دەکا. ((تورك))

❖ کاتێ ئافرەت دەگری،پیاو بەر هەڵستی نامێنێ.

❖ کاتێ ئارەق وشك دەبێتەوە،دایك ئێشی لە بیر دەچێتەوە. ((بەلجیکی))

❖ کتێب یەکە هاوڕێیەکە کە دوو زمانی نییە بێزار نابێ و گلەییت لێ ناکا،کاتێ وشك بێت لە گەڵیا نهێنییەکانت بلاّوناکاتەوە. ((ئیبنولتەقتەقی))

❖ کەی قوماشت کڕی تەماشای قەراخەکەی بکەو کە ویستت یەکێك بخوازی دایکە ببینە. ((وێژەی هیندی))

❖ کتێبخانەیەکی بە سوود،سامانێکی زۆرە،لە ژوورێکی بچوکدا. ((مارلۆ))

❖ کۆنفۆشیۆس دەڵێ :گومانی تێدا نییە لە ڕێگەی ژیاندا لە نێوان دوو کەسدا مامۆستایەك بدۆزمەوە.

❖ کەمترین زانست ئەوەیە کە مرۆڤ لە کتێب و مامۆستاکانەوە فێر بووە،لەوەش گەورەتر، کە بەڕاڤەی خۆیی و لە خەڵکییەوە فێر بووە.

((قاسم ئەمین و لمسری))

❖ کچێکم نەدی تەمەنی سی سالّی تێپەڕکردبیّ و هێمن بیّ. ((م٠ع))

❖ کات وەکو شمشێر وایە،ئەگەر نەیبڕی دەتبڕیّ.

❖ کاتیّ لیمان پرسی کام ژن وەفاو ئیخلاسی هەیە بۆ مێردەکەی،پرچ زەرد ؟یا پرچ ڕەش ؟یا پرچ سوور ؟بزە گرتمی و ووتم :زۆربەی ئەو ژنانە کە وەفایان هەیە بۆ مێردەکانیان،پرچ سپییەکانە. ((ئەنویّ مۆرا))

❖ کاتێك پیاوێك بە دوای ئافرەتێك دەکەویّ ژن دێنیّ کاتێك ئافرەتێك دووای پیاوێك دەکەوێت دەکەوێتە چالّەوە. ((ووتەیەکی هیندی))

❖ کاتێك ژن،مێردەکەی باش نابێت ئەمە بە ڕوونی لە دەم و چاویدا دەبینریّ.

((گۆتە))

❖ کاتێك مندالّ لە باوکی دەکا،هیچ گومان لە دایکی ناکریّ. ((ئیسپانی))

❖ کوا ئەو نووسەرە کە جوانیمان پێشان بدا،وەکو ئەو جوانییە کە لە چاوی ئافرەتێکدا ئەیبینین. ((شکسپیر))

❖ کچ،پێش شووکردنی بە چاو قسە دەکا،پاشان بە زمانی. ((تۆلّستۆی))

❖ کیّ دەتوانیّ لە بەردەم ژنیّ بوەستیّ کە دەگری،ئەگەر ڕاوەستاو هۆی بێدەسەلاّتی بێت. ((بیرۆن))

❖ کاتیّ دەبینی ژن لە بەردەمتا بیّ هێزە،بزانە کە لەو پەڕی بەهێزییەتی.

((براندیللۆ))

❖ کچی بەختیار،ئەوەیە دەست بە ئەقلّی خۆیەوە دەگریّ،کاتیّ دلّی نامێنێت

((پۆلّ گلبرت))

❖ کیّ دەتوانیّ لە ئافرەت بگات. ((شکسپیر))

❖ کچە بچکۆلّەکان خۆشەویستی دەکەن وبێدەسەلاّتن لە تێگەیشتنی گەورەکانیشیان لە خۆشەویستی تێدەگەن بەلاّم بێدەسەلاّتن لە کردنیا.

((پن جۆنسن))

❖ کاتێ پیاو دەڵێ باوەڕم بە ژنەکەم هەیە،واتە بە تەواوەتی ڕاست دەکات،بەڵام کاتێ ژن دەڵێ باوەڕم بە پیاوەکەم هەیە،ئەوە مەبەستی ئەوەیە باوەڕی بە خۆی هەیە.

((فەرەنسیس دوکریت))

❖ کوڕم کوڕمە،تاکو ژن دەهێنی،کچم کچمە،بە درێژایی تەمەنی.

((وتەیەکی ئوسکۆتلەندی))

## - گ -

❖ گریان یارمەتیت دەدات لەوەی بۆتە هۆی گریانت.

❖ گرنگ نییە خەڵکی باوەڕت پێبکەن،گرنگ ئەوەیە لە گەڵ خۆتا ڕاست بیت.

❖ گوڵی یاسەمینی بۆندار،بۆنی دەردەچێ ئەگەر داشپۆشرێت. ((هیندی))

❖ گەورەترین ئافرەت ئەو ئافرەتەیە،کە فێرمان دەکا چۆن خۆشەویستی بکەین کاتێ ڕقمان هەڵسێ و چۆن پێدەکەنین کاتێ بگرین چۆن بزە بمانگرێ کاتێ ئازارمان هەبێ.

❖ گومانی تێدا نییە کە پارە هەموو شتێك نییە،بەڵام بە ڕاقە ئیسپات بووە،کە یەکە چارەیەو هیچسش بە سەریدا زاڵ نەبووە.

❖ گەورەترین ئیشی ژیان ئەوەیە،ئامادەبی بۆ مردن. ((ئینگلین))

❖ گەورەترین گیروگرفت،ڕوو بە ڕووی ژن و مێرد دەبنەوە ئەوەیە سوورن لە سەر خواردن کولآنن لە سەر ڕێگای دایکیان،ئافرەتیش بە تایبەتی کچی گەورەترین چێشت لێنەرە لە جیهاندا. ((ماریا فلۆریس))

❖ گەورەترین مەرگەساتی ژیان ئەوەیە شتێك لە ناخی مرۆڤدا بمرێ و هێشتاکە کە خۆی زیندووە.

❖ گاڵتە بەو بەختیارییە دەکەین کە لە ژیاندا دراوە پێمان چونکە ئێمە داوای وەدەس هێنانی بەختیاری گەورە دەکەین،بەڵام بەختیاری گەورە نییە،لەوەی زیاتر کە وەدسمان کەوتووە،ئەی چۆن نا،بەختیاری ژیانە، کە لەو بەختیارییە گەورەتر نییە. ((تۆڵستۆی))

❖ گەورەیی پیاو بەوە دەپێورێ چەندە ئامادەیە کە یەکێك لە گەڵیدا خراپەی کرد لێی ببورێ. ((ج· بانگ))

❖ گوڵی سوورو ڕاستی، دڕکیان هەیە. ((ئیسپانی))

❖ گریان پێویستە،بەڵام چارە نییە. ((یابانی))

❖ گرنگ نییە دوکانێك بکەیتەوە،گرنگ ئەوەیە بەردەوام بی لە کردنەوەی دوکانەکە. ((چینی))

❖ گەورەترین خەسارەت، خەسارەتی برادەرە.

❖ گەورە،لە هەل ناگەڕێ،بەڵکو دروستی دەکا. ((کۆلتۆن))

❖ گەورەیی ئافرەت ئەوەیە، پیاوی گەورەی دەکا.

❖ گەورەترین ئازار ئەوەیە،خۆشەویستی بەبێ هیوا.

❖ گرانترین شت لە پەیدا کردنی نان ئەوەیە،تۆ ناچاری هەموو ڕۆژێك ئیش بکەی

❖ گوڵی وەریو،بۆ جاری دووەم،بۆ لقەکەی ناگەڕێتەوە. ((وێژەی ئیتاڵی))

❖ گەورە پیاوان لە دڵی مندا سیانن،گەورەیەك ئاگادارم بکاتەوە و گەورەیەك مزگێنیم بداتێ و گەورەیەك پێشوازیم بکات.

❖ گەش بین و ڕەش بین :

بە دوو کەس نیو پەرداخ ئاویان داو لە ڕەش بینەکەیان پرسی و ووتی :دەبینم نیوەی پەرداخەکە بەتاڵە.

لە گەش بینەکەیان پرسی ووتی :

دەبینم نیوەی پەرداخەکە ئاوە.

❖ گەڕان وەکو ئەوە وایە بە دوای دڵدارییەوە بکەوێت،چونکە ئەو توانایيەکی زۆرت دەداتێ،وەکو بڵێت جیهان لە تازەوە دروست کراوە. ((جین میردل))

❖ گەورەترین خۆهەڵکێشان ئەوەیە کە خۆت هەڵنەکێشی. ((ئیمام عەلی))

## - ل -

❖ لە نێوان لێوی ژنەوە،پیاو دووا ڕۆژی خۆی دەزانێ و لە چاوییەوە ئاوات و خەونەکانی دەزانێ. ((مارك توین))

❖ لە وێدا هەندێ ژنان هەن وەکو شانۆگەری وان،شایستەی ئەوەن دووبارە بکرێتەوە،چونکە زیاتر خۆشی دەدەن. ((ئەتیان رای))

❖ لە هەموو دونیادا یەك ئافرەت بمێنێ،هەموو ڕۆژێك گوێمان لە شتێکی نوێ دەبێ. ((محەمەد جەعفەر))

❖ لە گەڵ پیاودا قسە لە گەڵ ئەقڵی دا بکە،لە گەڵ ئافرەتدا،قسە لە گەڵ دڵی دا بکە،لە گەڵ بێ ئەقڵدا،قسە بە گوێدا بدە. ((ئەلفۆنس دۆدیە))

❖ لە نێوان هەموو ژنێکدا،کۆیلەیەك و جەورکەرێك هەیە. ((نیشە))

❖ لە دڵی هەموو ئافرەتێکدا،پشکۆیەك ئاگر هەیە،پیاوی بەختیاریش ئەوەیە بەو ئاگرە بسووتێ و گەرمایی پێبدا. ((ئەرفەنج واشنتۆن))

❖ لە تۆڵستۆیان پرسی (لە قەڵەمدا چیت دۆزیوەتەوە.·ووتی :دڵێکی هەمیشە لێدەرو برینێکی سارێژ و ڕوحێکی خەیاڵاوی و لە قەڵەمدا خۆم دۆزیوەتەوە،کە لە تەمەنی منداڵیدا بۆی دەگەڕام.

❖ لە هەموو شتێ زیاتر ژن تورە دەکا،ئەوەیە کە پێی بڵێت پیری. ((پێرس))

❖ لە دڵداری لادان،زۆر جار ئەوە دەگەیەنێ، کە لە دڵداری بێزارە.

((دۆناس))

❖ لووت بەرز مەبە بە پارەو سامان،چونکە ڕۆژگار یاری دەکا بە سامان و جیهان وەکو چۆن منداڵ یاری بە تۆپ دەکا. ((هیندی))

❖ لە وێدا ڕاستییەك نییە لێی بترسم بڵاوی بکەمەوە،یان لە جیهان بیشارمەوە
((تۆماس جیسۆن)) لە جیهاندا یەك کەسێك هەیە،لە ژن باشترە،ئەویش دایکە.

((شامن))

❖ لە جۆرەکانی بەختیاری ئەوەیە،پێویستە بزانین تا چی ڕادەیەك بەد بەختین

((لاروشکفوکۆ))

❖ لە هەندێ دڵدا چاو هەیە. ((عەرەب))

❖ لە جیهاندا سێ شت لە هەموو شتێك بەنرخترە، زانست، خواردن، برادەری

((چینی))

❖ لە هەر جێگایەك ژیان هەبێ،لەو جێگایە مەترسی هەیە. ((شۆپنهاوەر))

❖ لە ژیانی مرۆڤدا دوو مەرگەسات هەیە،مەرگەساتی یەکەم ئەوەیە کە خۆشی وون دەکا،بەڵام دووەمیان ئەوەیە کە دەیدۆزیتەوە. ((بەرناد شۆ))

❖ لووتی گەورە،دەم و چاوی جوان،ناشرین ناکا. ((ئەڵمان))

❖ لە سەر خۆ برادەر بگرەو لە سەر خۆ بیان گۆڕە. ((فرانکلین))

❖ لە ڕێگەی برادەرییەوە، خۆشەویستی دەکەین.

❖ لە نێوان دڕکی خەتەرەوە،گوڵی ئاشتیت دەس دەکەوێ. ((شکسپیر))

❖ لە وێدا نە وولاتێکی جەورکەر هەیە، نەوولاتێکی جەور لێکراو هەیە،تەنها لە وێدا ئەوانە هەیە کە ڕێگە بە خۆیان دەدەن،جەور قبوڵ بکەن.

((مستەفا کامیل))

❖ لاواز،هەڕەشە دەدات و بە هێز ئیش دەکا.

❖ لە حاتەمی تەییان پرسی هیچ کەست بینیوە لە خۆت سەخی تر بێت ؟

— ووتی : ڕۆژێك لە ڕۆژان لە چۆڵێکدادەگەڕام و پیاوێکم بینی پووش ووشکی بۆ سووتاندن کۆدەکردەوە،پێم ووت :بۆ ماڵی حاتەمی تەی بڕۆ و لەوێ نان و

گۆشت بەمیوان دەدەن،وەلامی دایەوە و ووتی :ئەوەی بتوانێ بە ئارەقی ناوچەوان نانی خۆی بخواو پێویست ناكا چاكەی حاتەمی تەی هەڵگرێ.

❖ لە وێدا ئافرەتێك نییە قینی لە دڵداری بێت،تەنها ئافرەتێك نەبێت كە لە خۆشەویستیدا تووشی ناڕەحەتی بووبێت. ((سیرۆس))

❖ لە جیهاندا نییە وەكو ئافرەتی شووی كردبێ،ئەمەش هیچ مێردێك هەستی پێ ناكاو ڕێزی لێ ناگرێ. ((ئۆسكار وایلد))

❖ لای پەسەندە،كە خۆشم بوێت،خۆشحاڵیشە،لە ڕێگایدا لانەواز بم.

((شیلەر))

❖ لە بیر چوونەوە نەخۆشی مرۆڤە،زۆر جاریش ڕەحمەتە.

❖ لە گەڵ برادەرا كۆت وزنجیر بكرێت لەوە باشترە بەسەربەستی لە گەڵ دوژمندا لە باخچەدا بیت. ((فارس))

❖ لە هەموو گرنگتر ئەوەیە لە ماڵەوە بەختیار بین ئەگەر لەوێ بەختیار نەبین،لە شوێنێكی تر چۆن بەختیار دەبین. ((ئینگلین))

❖ لە خۆشیدا لاوەكان نرخی كارەكەیان دەدەن و پیرەكان ئەوەی نایكەن نرخی دەدەن. ((بۆمارشیە))

❖ لە بەر ئەوەی لە دڵدا سوچێكت هەیە،لە ماڵیشدا سوچێك دەدۆزیتەوە.

((وێژەی گەلی))

❖ لە هەموو شتێكا بەختیار بوون لە سیمرخ دا نسقەترە. ((ئینگلین))

❖ لە وانەی كە تووشی پیاوی تەمەن گەورە دەبێ،بیر لە ئافرەت دەكەنەوە نەك هەستیان بەرامبەریان هەبێ.

❖ لە ڕەزیلێكی گەمژەیان پرسی و ووتی :من سامانم نییە،بەلام سامان منی هەیە.

((بیۆن))

❖ لە خۆبایی بوون،نەخۆشییەکی سەیرە،هەموو مرۆڤێك نەخۆش دەخا تەنها ئەو مرۆڤە نەبێ کە تووشی بووە.

❖ لویسی چواردەهەمی فەرەنسا،خزمەتکارێکی تایبەتی هەبوو،ئەم خزمەتکارە شکاتێکی هەبوو دژی خزمێکی،لە پاشا تکای کرد کە بە دادگا بڵێ یارمەتی بدەن،پاشا نەیکردو سوور بوو لە سەر نەکردنەکەی. خزمەتکارەکەی ووتی :گەورەم بەداخەوە،تۆ ئەگەر یەك ووشە بڵێی شکاتەکەم دەبەمەوە،پاشا ووتی :تۆ بە هەڵەیەکی گەورەدا چووی،ئەگەر تۆ دوژمن بوایت و دوژمنەکەت خزمەکاری من بوایە بە لاتەوە ڕاست دەبو ئەو قسەیەم بکردایە.

❖ لە دیاردە سەیرەکانی مرۆڤ ئەوەیە،کە لە خۆشیدا دەگرین،بەڵام لە ناخۆشیدا پێناکەنن. ((بایکۆن))

❖ لەم جیهانەدا تەنها ڕوح هەموو شتێك دەکا،ئیتر ئەوانی تر تەنها خەیاڵە.

((جۆرج میریدیس))

❖ لە شیعرو هەڵکۆڵین و وێنەدا حاڵ چۆنە،هەروا ژیان شتی جوان و بە نرخی هەیە. ((ئۆسکار وایڵد))

❖ لە هەر کوێ بم بە هەموو هێزمەوە ئیش دەکەم،ئەگەر ئیشیشم نەدۆزییەوە،بۆخۆم ئیشێك دەدۆزمەوە. ((هۆگ))

❖ لە فەیلەسوفێکیان پرسی،لە هەموو فەلسەفەکانتا چیت چنگ کەوتووە،وەڵامی دایەوەو ووتی: ئەوەم دەست کەوتووە بووم بە هاوڕێی خۆم.

❖ لەو کاتەیدا کە قوتابی بووم،زۆر شتم دەخوێند،ناچار بووم و بە زۆر بوو،نەمان دەزانی ئەوە فێر دەبین لە زمان مێژوو ماتماتیك،یا ئەوانی تر و ڕۆژێك دەبێ سوودی لێوەردەگرین،بەڵام ئەمڕۆ،کە پلیەکی زۆرم لە ژیان بڕیوە،تەماشای دوواوە دەکەم و دەبینم،هەر پەرەگرافێکی مێژوویە و هەموو ڕایەکی پسپۆری و هەموو بناغەیەکی و زمان وهەموو ماتماتیك،هەر ووشەیەك کە پێویست بوو لە سەرم بیخوێنم ولێی

تێبگەم،لە کاتێکی تایبەتیدا سوودم لێ وەرگرتوون،یا لە کاتی خوێندنەوەدا،لە کاتی ئالّ و گۆڕ و مامەڵەدا یا لە کاتی قسە کردنا یا لەنووسیندا،یا لەو شتانەی کە ڕۆژانە پێویستە. ((سەرفەنتس))

❖ لاڵ لە درۆزن باشترە،ڕاست گوێی،یەکەم بەختیارییە.

((هەندێ لە پسپۆران))

❖ لەو ژنە مەترسە کە هەست دەکات چاوەکانی جوانە،چونکە ئەوە چاوگی خێرو شەڕە. ((کۆنفۆشیۆس))

❖ لە هەموو کات و جێگایەکدا، ژنی جوان چی ویستبێ کردویەتی. ((ئۆیدا))

❖ لە توانای ژن و پیاودا نییە بزانن خۆشەویستی تەواو چییە،ئەگەر چارگە سەدەیەك بە سەر ژن هێنانیدا تێپەڕێ. ((مارك توین))

❖ لە ڕابردوودا ژنان پیر دەبوون بەلاّم هێشتاکە جوان بوون،ئەمڕۆ پیر نابن،بەلاّم ناشرین دەبن. ((ئەلکۆنت دۆ بۆمۆن))

❖ لە یەکێ لە فەیلەسووفەکانیان پرسی،بۆچی ژنێکی ناشرینت هەڵبـژاردووە وتـۆ پیاوێکی جوانی ؟ وەلاّمی دایەوە و ووتی کەمترین شەڕم هەڵبژاردووە.

((سوکرات))

❖ لە وێدا ژنان هەن،پیاو شێت دەکەن،ژنانیش هەن شێت ئاقڵ دەکەن.

((وشینالّ))

❖ لە نێوان سەد پیاودا دوو زیرەك دەدۆزیتەوە.. لە نێوان سەد ژندا یەك دانە بێ ئەقڵ دەدۆزیتەوە. ((مەدام دۆگرادۆن))

❖ لە بگرەو بەردە، ڕووناکی دەرکەوت. ((فەرەنسی))

❖ لەوە شەرم مەکە کە نازانێ،بەڵکو شەرم بکە لەوەی نەت خوێندووە.

❖ لە ناو چوونی سامان کەمە،هەر چەندە زۆر بێ،بەلاّم خەسارەتی پیاوان زۆرە هەر چەندە بچووك بێ.

❖ لەو ماڵەی مریشك بە ئیشی کەڵەشێر هەڵدەستیَ بەرەو ویَران بوون دەچیَ.

((چینی))

❖ لە زەوقی ژنەکەت مەدە،چونکە ئەو یەکجار تۆی هەڵبژارد.

❖ لە شەڕو ڕامیاریدا،ئەو هەلەی وون دەبیَ ناگەڕێتەوە.

❖ لە بیرت نەچیَ داوای لێبوردن بکە لەو پیاوەی هەڵەت لە تەکدا کرد،داوای لێبوردنیش بکە لە ئافرەت ئەگەر مندالَ بوویت.

❖ لە ویَدا مۆسیقای بێدەنگ نییە،مۆسیقای ڕاستی ئەوەیە کە قسەی بە ماناووشە دەکا.

((محەمەد عەبدولوەهاب))

❖ لە باتی ئەوەی ڕۆژی ماسییەکی بدەیتیَ،فێری ڕاوی بکە. ((ویَژەی چینی))

❖ لە دووای خۆشەویستییەوە،هیچ نییە،تەنها ئازار نەبیَ. ((بەرنادشۆ))

❖ لاوازترین کەس،ئەوکەسەیە کە ناتوانیَ نهێنی بشارێتەوە. ((سویدی))

❖ لە نێوان ژیر و شێتا ماوەیەك هەیە لە ڕستەی جاڵجاڵۆکە باریکترە.

((جوبران خەلیل جوبران))

❖ لە هەندیَ لە ئەدیبەکانیان پرسی ووتیان کیَ بەختیارترین کەسە ؟

ووتیان :

+ ئەو کەسەی کە تەندروستی باش و بەهێزە.

+ ئەو کەسەی بە دیمەنێکی جوان بەختیارە،بەبیَ ئەوەی هی خۆی بیَ.

+ ئەو کەسەی بە هەموو دلْو گیانەوە جوانی سرووشتی خۆشبویَ.

+ ئەو کەسەی کە هەژاری و ناخۆشی،بە ئازایەتی و بە قەناعەت و خۆشییەوە پێش وازی دەکا.

+ ئەو کەسەی ناوی باشی پیَ باشترە لە زێڕ.

+ ئەو کەسەی ژیانی ساکارەو بیرو ووزەی بەرزە،ئەوانەی دەوڵەمەندی ڕاستین.

+ لە ژیانی هەموو پیاوێكدا،سێ ئافرەت هەیە،ئافرەتێكی خۆشبوێت،ئافرەتێك بیپارێزی، ئارفەتێك كە دەیخوازێ. ((بایكۆن))

❖ لەوەی كە لێی ئەمینی،لەوە بترسە،چونكە تۆ لەوەی دەترسی ئاگاداری. ((الجاحين))

❖ لە خۆشەویستی ئافرەت دوور كەوە،لەڕق و كینەی پیاو مەترسە. ((سوكرات))

❖ لە هەموو شتێ گرانتر ئەوەیە مرۆڤ لە گەڵ خۆیدا هێمن بێ،هێمنی لە گەڵ كەسانی تردا زۆر ئاسانە. ((ئەدوارد دینسۆن))

❖ لە ئامۆژگارییەكانی حەزرەتی لوقمان :

- هیچ كانگایەك لە زانست بە سوودتر نییە.
- هیچ شتێك، لە ئەدەب قازانجی زۆرتر نییە.
- هیچ هاورێیەك، لە ئەقڵ جوانتر نییە.
- هیچ خوا پەرستییەك،لە بێدەنگی باشتر نییە.
- هیچ خراپەیەك، لە درۆ خراپتر نییە.

❖ لە ژیانمدا خۆشترین كاتم ئەوە بووە،كە لە نێوان كتێبدا بەسەرم بردووە. ((جیمس شارڵی))

- م -

❖ ما دام ماف لە گەڵ تۆدایە مەترسە،ئەگەر هەموو جیهان لە ڕووتا وەستان.

❖ مێرد،ئەو پیاوەیە کە لە تەنیشت ژنەکەیەوە ڕادەوەستێ لە ناخۆشیدا،ئەوەش ڕووی نەدەدا ئەگەر نەی خواستایە.

❖ مردووەکان،چاوی زیندووەکان دەکەنەوە. ((ئینگلیز))

❖ میللەتی بەهێز،لە سەر بەستەکان دروست دەبێ.

❖ من ئیشەکەم خۆشدەوێ،هەر چەندە چەن کاتژمێرێکیش تەماشای بکەم هەرگیز بێزار نابم،چونکە ئەو ژیانمەو پەرستگامە،بیری واز لێهێنانی دڵم دەبچڕێنێ. ((جیرۆم جیرۆم))

❖ من دەس بۆهەمووکەس درێژدەکەم،بەڵام دڵم بۆ خۆشەویستەکەمە ((هیگۆ))

❖ مرۆڤ کۆیلەی مرۆڤ نییە،بەڵام هەیشە کۆیلەی پارەیە.

❖ ماچی دوو خۆشەویست وەکو هەنگوینە.

❖ ماچی دەزگیران وەکو میوەیە.

❖ ماچی ژن و مێرد وەکو نانە —

❖ مرۆڤی سەربەست،خاوەنی خۆیەتی بە تەواوی،بۆ میللەتەکەیشێتی بە تەواوی ((عەبدولڕەحمان ئەلکەواکبی))

❖ مێژووی هونەر،مێژووی ڕزگار بوونی مرۆڤە. ((ئەندریە مالرۆ))

❖ من دەزانم چیم دەوێ،چونکە من هەژارم. ((ئەدگار ئەلان بۆ))

❖ ماڵێك،بەبێ کتێب،وەکو ژووری نوستنی بێ پەنجەرە وایە. ((بێشەر))

❖ ماڵ،بەبێ ئافرەت وەکو قەبر وایە. ((گاندی))

❖ مادام ئاسنەکەت گەرمە بیکوتە. ((بلیۆسی بچوك))

❖ منداڵ فێر مەکە ئەگەر تەندروستی باش نەبوو،ئەگەر ویستت شتێك لە دەروونە پاکەکەیدا بچێنێ،ووریابە بە درۆ نەبێ کە خۆتیش بزانی درۆیە. ((جۆن رسکن))

❖ مردن لە گەڵ ڕاستیدا باشترە،نەك ژیان لە گەڵ درۆدا. ((ئەرستۆ تالیس))

❖ ماف و ڕۆن،هەمیشە بەرز دەبنەوە. ((ئینگلیز))

❖ من لە سێ ڕۆژنامە زیاتر دەترسم،نەك لە سەد هەزار شەڕکەر. ((ناپلیۆن))

❖ ماچ کردن،قەیدی ناکا،تەنها ئەو کاتە نەبێ کە ئەنفلۆوەنزا هەبێ.

❖ ماچ کردن لە هەموو زەمانێك و جێگایەك ڕەوایە، لە گەڵ یاسای قەیسەرو گوستنیان وناپلیۆن و یاسای سی نترالْ بارکێشیش.

((لویس برۆدسکی،دادوەری نیویۆرك))

❖ مردن،نهێنییەکە،لە نهێنییەکانی سروشت. ((مورقوس ئەنتانیۆس))

❖ من،زۆر بیر دەکەمەوە،نەك لە بەر ئەوەی هەژارم،بەڵکو بێ دەسەلاتم لە یارمەتی هاوسێ هەژارەکەم. ((مارك تووین))

❖ مردن،شەڕی بەلا نییە،بەڵکو شەڕ ئەوەیە،داوای مردن بکەیت و دەستت نەکەوێت. ((سۆفۆکلیس))

❖ مردن نزیکەو زۆریش تەمەنی نییە،لە بەر ئەوەی تا زیندووی خێر بکە.

((مورقوس ئەنتانیۆس))

❖ من،پیاو بە عەقڵ جیا دەکەمەوە نەك بە چاو. ((سنیکا))

❖ من،ڕێزی خایەنەکان ناگرم. ((ناپلیۆن))

❖ من،چاکە لە کەس قەبوڵ ناکەم،ئەگەر نەتوانم ئەو چاکەیە بدەمەوە.

((مارکۆس ئۆر))

❖ ماڵی شەڕ خوازان وێران دەبێ و دەواری ڕاستەکان پەرە دەسێنێ.

((سولەیمانلحەکیم))

❖ مرۆڤـ،بۆ ئیش کردن دروست کراوە،هەر وەکو باڵدار بۆ فڕین. ((مەسیح))

❖ مەزنترین خۆشەویستی،خۆشەویستی دایکە. ((لنکۆڵن))

❖ من سەیرم دێت بەو ژنانە هەندێ جار شوو بە پیاوێك دەكەن و خۆشیان ناوێت و خۆشیان هەڵیان بژاردووە،تەنها لە بەر عینادی خۆی نەبێت.

((سینسەرتراس))

❖ مرۆڤ،بە لاوێتی دەمێنێتەوە، لە بەر ئەوەی ئافرەتێك هەیە خۆشی بوێ و خۆشی بوێت. ((ناپلیۆن))

❖ من لە گەڵ كاتدا لە زۆرانبازییەكی هەمیشەدام،كات زۆر كورتە بۆ ئەوەی ماوە هەبێ ئیشەكانم تەواو بكەم،درێژیشە كە دەمەوێ شتێ بكەم. ((شكسپیر))

❖ مێردی لاڵ و ژنی كوێر،بەختیارترین ژن و مێردن. ((دەنیماركی))

❖ مرۆڤی تەواو سێ شتی تێدایە :

یەكەمیان هەمیشە پەسەندە.

دووەمیان لە خواوەیە.

سێهەمیان،هەمیشە ئاساییە.

## - س -

❖ سەربەست،ئامآژەيەكی بەسە.

❖ سەربەستی لە كۆشی زانستدا نەشونما دەكا وەكو ئەو گيا تازەيەی كە بەسەردا سەردەكەوێ. ((ڕۆجيە گاردوی))

❖ سوپايەك لە گوێرەكە،شێرێك لێيان بخوڕێ باشترە، لە سوپايەكی شێر ،گوێرەكەيەك لێيان خوڕێ. ((ناپليۆن))

❖ سەركەوتن،لێت ڕادەكا،وەكو چۆن (لم) لە نێو پەنجەكانت و ئاو لە ناو گوێلت

دا ڕادەكا،ئەگەر ڕۆژ لە دووای ڕۆژ و شەو لە دووای شەو و ساڵ دووای ئاگاداری نەبی و ئيش نەكەيت.

❖ ئەوەی هەميشە سەيری پشتی خۆی بكا،چاوەڕوانی دوو ساڵ هەميشەيی ئيش

كردن ناكات،دەگەڕێتەوە بۆ گرتنی (لمە)كە بە پەنجەيەيو،ئاوەكە بە دەستی.

❖ سێ شت گرانە،نهێنی شاردنەوە و سەبر كردن لە سەر جنێوو بەكار هێنانی

كاتی دەس بەتاڵی. ((ڤۆلتێر))

❖ سوواربووی شێر،دەترسێ دابزێ. ((وێژەی چينی))

❖ سامان و زانست :

لە ژيرێكيان پرسی،كاميان باشترن سامان يا زانست ؟ ووتی :

زانست باشترە ؟

پێی ووت :بۆ دەبينين زاناكان لە بەردەم ماڵە دەوڵەمەندەكانن،بەلآم

دەوڵەمەندەکان لەبەردەم ماڵە زاناکان نابینین ؟
ووتی :لە بەر ئەوەی زاناکان ڕاستی سامان دەزانن و دەوڵەمەندەکان سوودی
زانست نازانن.

❖ سەبر کردن،باشترین دەرمانە،بۆ هەموو خۆشییەك. ((بلۆتس))

❖ سەبر کردن،دەرمانی هەموو خەفەتێکە ((بیبلۆس))

❖ سوڵتان مەحموود بە سەمعونی ووت،ئامۆژگاریم بکە بە کورتی :ووتی چۆن حەز دەکەی خوا چیت لێ بکا،تۆش ئاوها لە میللەتەکەت بکە.

❖ سەربازێك بە (بلۆبیدس)دەڵێ :کەوتنە نێوان دوژمنانەوە،ووتی بۆ دەڵێی کەوتینە نێوانیانەوە،بۆچی ناڵێی کەوتنە نێوانمانەوە.

❖ سامان،دەسەلاتێکە هێز دەدات. ((هۆراس))

❖ سەرخۆشی و خراپە وەك یەك وان. ((فیتاغۆرس))

❖ سامانی خۆت پێکەش بکە و ئاگات لە سمانی خەڵکی بێت. ((ژیرێك))

❖ سوڵتان عوسمان لە وەسیەتەکەیدا بۆ ئۆرخانی کوڕی ووتی :کوڕم سوڵتانی بە نازناو سەوڵەجان نییە،بەڵکو بە عەدالەت و چاکەیەتی.

❖ سروشت جوانی داوەتە ژن،وەکو قەڵغانێك بۆ پاراستنی.

❖ ئافرەتی جوان بە هێزە وەکو ئاگرو ئاسن. ((ئاناکرۆن))

❖ سروشت،بە ژنی ووت،ئەگەر دەتوانی جوان بە..ئەگەر ویستت ژیر بە..دایکێکی بەڕێز بە،پێویستیشە وابێت. ((بۆمارشیە))

❖ سەرکێشی ئافرەت پاش شوکردن زەرەری پێدەگەیەنێ،هەروا پێش شوکردنیش. ((ئەدیسۆن))

❖ سەدەی ئێستا داوا لە ژن دەكا ئیش بكەن،وایان لێ دەكا خەو بە بەختیاری و حەسانەوە وخۆشی ببینن،لە شوكردنەكەیان وەكو پلیتی یانەسیب،لە نێوان هەزارەها ژن،یەكێكیان قازانج دەكەن. ((سیمۆن بۆڤار))

❖ سروشت،بە ئافرەت دروستی كردووم،بەلاّم ئیشەكانم بەسەر ئازاترین پیاودا سەركەوتووە. ((شاژن سەمیر ئەمیس))

❖ سكی دایك،باخچەیەكە هەموو میوەیەك دەگرێ. ((ئیسپانی))

❖ سۆزانی یەك لەم ژنەیە،ژنێكە هەزار دڵی هەیە،یا ژنێكە یەك دڵی هەیە.

((بەلزاك))

❖ سەدەها ژنم ناسیوە،دەتوانی وای لێ بكەیت قەپ لەئاسنی گەرم بدات،بەلاّم ناتوانی لە كاتی تورەبونیدا لە سەر ڕایەكی خۆی واز بێنێ.

((مۆنتاین))

❖ سەد چاكە بكەی لە گەڵ ناپیاودا،كە بێ دڵێت كرد دەیدا بە ئاوا.

❖ ساتە بەختیارەكان،زیاتر گەش بین دەبین،یا زیاتر شێتی. ((مارك توین))

❖ سوپاس، بە زمان نابێت،بەڵكو بە كردار و چاكە.

## - ف -

❖ فێر بە ئەگەر لە دوژمنەکەتیشەوە بێت. ((ئەڵمانی))

❖ فرمێسکی ئافرەت،ئەو بیرەیە کە تێدا دەمری. ((چینی))

❖ فێری ڕۆیشتن بە،لە کەوتنی زۆرت. ((باستیان))

❖ فرمێسکی منداڵ پاڕانەوەیە،ئەگەر جێ بەجێ نەکرێ دەبێ بە ئەمر.

((ڕۆسۆ))

❖ فێر بە لە بەلای خەڵکی کەوە، بۆ ئەوەی بزانی لە چی دوور دەکەویتەوە.

((بیلیۆس))

❖ فێڵبازی لە ژندا،بەرامبەر هێزی پیاوە. ((دی لانکۆس))

❖ فرمێسکی ئافرەت سەرمایەیەتی. ((بیلی))

❖ فەیلەسوف محەمەد ئیقبال وتی : لە هەموو ئامۆژگارییەك لە ژیانمدا کاری تێکردووم ئەوەبو لە باوکم بیستم (کورم قورئان بخوێنە وەکو بلێی بۆ هاتبێتە خوارەوە).

## - ق -

❖ قسەی چاك زمان ناڕوشێنێ. ((فەرەنسی))

❖ قین،ئەو دڵەیە،هەرگیز خۆشەویستی نازانێ.

❖ قسەم دنیای پڕ کردووە،باوەڕیشم ئەوەیە ئیشی چاکە بکەم. ((تۆماس))

❖ قین توڕەبوونێکی ناخییە،ئەو کاتە دەردەکەوێ کە مرۆڤ هەست بە بێ دەسەڵاتی دەکات.

❖ قوڵایی خۆشەویستی نازانرێ،ئەو کاتە نەبێ کە بە جێی دێڵێ.

❖ قەبر،کۆمەڵگەی گشتییە. ((ئینگلیز))

❖ قسەکردن بەبێ بیرکردنەوە وەکو ئەوەیە تیر بهاویت بەبێ نیشان گرتن. ((ئینگلیز))

❖ قەناعەت،کانزایەکە تەواو نابێ. ((عەرەب))

❖ قەڵەم زمانی عەقڵە. ((هیگڵ دەسەرفتش))

❖ قەرز،خەڵك لە یەك دوور دەخاتەوە،بەڵام هەرگیز قەرزم نەکردووە هەر چەندە پێویستیشم پێی هەبووە. ((ولنتۆن))

❖ قورسترین سزای ژن ئەوەیە،لە کۆشکێکا بەندی بکەیت و ئاوێنەی تێدا نەبێت. ((پۆڵ هەندێت))

❖ قسەی پیاو،تەرازووی ئەقڵێتی.

❖ قورماچی،دزی لە خۆی و برادەرەکانی دەکا. ((م. ع))

## - ر -

❖ ڕۆژان پێنجن،ڕۆژێکی لە ناو چوو ئەویش دوێنییە،ڕۆژێکی بینراو،ئەوەش ئەمڕۆیە کە تیایدای،ڕۆژێکیش کە دیت،ئەویش بەیانییە،ڕۆژێکیش چاوەڕوان کراو،ئەویش دووا ڕۆژتە،ڕۆژێکی درێژیش ئەویش ڕۆژی قیامەتە.

❖ ڕوح لەم جیهانەدا هەموو شتێك دەکا،ئەوەکانی تر خەیاڵە. ((جۆرج مێریدس))

❖ ڕۆژێك پێیان ووت،ئەوەی پیاو لە ژنی دەوێت لێی تێبگات،ژن قیژاندی بەدەم و چاویداو ووتی: ئەوەی ژن لە پیاوی دەوێت ئەوەیە خۆشی بوێت.

((سوکرات))

❖ ڕەزیل،پیاوێکە لە برسا خۆی دەکوژێ و وەرەسەکەشی بە تورخە دەکوژێ.

❖ ڕەحم کردن لە دڵداریدا،وەکو هەتاوی زستانە،خراپە دەکا،گەرمیش ناکاتەوە. ((ئەتان یای))

❖ ڕاسترین ڕێگا بۆ ئەوەی پیاو خۆی هەڵخەڵەتێنێ،وا باوەڕ بکات لە هەموو کەس زیرەکترە.

❖ ڕۆژی قیامەت سێ شت فریات دەکەوێ،پێغەمبەرەکان،زاناکان،پاشان شەهیدەکان. ((پێغەمبەری گەورەمان))

❖ ڕاڕایی،ئەوەیە خۆری ئەمڕۆ،بخەیتە سەر هەوری سبەی.

❖ ڕێگام بۆگاڵتە ئەوەیە،هەق بڵێم،ئەوش خۆشترین میوەیە لەجیهاندا

((بەرنارد شۆ))

❖ ڕەوشتی باش،وەکو گوڵی (یاسەمین)وایە،بۆنی خۆشی هەیە.

❖ ڕووداوەکان لە ووشە بەرزترن. ((ڤۆڵتێر))

❖ ڕاڕاترین کەس لە بەندینخانەدا،پۆلیسی بەندینخانەکەیە. ((بەرنارد شۆ))

❖ ڕەزیل وەکو هەژار لەم جیهانەدا دەژی،لەو دونیاش حیسابی دەوڵەمەندی لە گەڵدا دەکرێ. ((عەرەب))

❖ ڕەزیل،بێ نرخە،تەنانەت لە لای باڵندەکانی ئاسمانیش. ((یابانی))

❖ ڕەگی خۆشی لە ئازاردایە،ڕەگی ئازاریش لە خۆشی دایە،بەڵام بەختیاری بە هیچ جۆرێ ڕەگی نییە. ((میخائیل نەعیمە))

❖ ڕێزی ئافرەت پێویستە لە لایەن پیاوی ژیرەوە. ((لامارتین))

❖ ڕاستی بە ئەقڵ و دڵیش دەزانین. ((باسکال))

❖ ڕاستی قورسە لە بەر ئەوە هەڵگری کەمە. ((بۆلانۆ))

❖ ڕەش بین،ئەو کەسەیە،کە بەندینخانەیەك لە هەوادا دروست دەکا.

❖ ڕێزی خەڵك بگرە،خەڵکی ڕێزت دەگرێ،هیچ شتێك لە دونیادا لە سەخیەتی باشتر نییە،ئەگەر بەشی خەڵکیت دا بەختیاری،سەخیەتی دووروونەوەی ژیانە،خوا سەخییە،تۆش سەخی بە،چونکە سەخی خۆشەویستی خوایە.

❖ ڕێزی قسەکانت بگرە زیاتر لە سوێندەکانت و هەرگیز درۆ مەکە،گاڵتەش بە شتی گرنگ مەکە. ((دیۆ گنیس))

❖ ڕاست گۆیی باشترین بەڵگەیە. ((سۆفۆکلیس))

## - ش -

❖ شەرم كردنی پیاو،ئەگەر لە جێی خۆیدا نەبێ،بێ دەسەلآتییە. ((عەرەب))

❖ شارستانییەت،هیچ نییە تەنها ئەوە نەبێ،كە كارێكە بۆ ئەوەی فێری نەرم و نیانی بی. ((جارلس لۆكاس))

❖ شتێك هەیە هەمیشە بەردەوامە و ناڕوا،ئەویش ئەخلاقە.

((هوزاس كریلی))

❖ شەڕ بە شەڕ بەربەرەكانی مەكەن. ((تۆلستۆی))

❖ شەڕەكان،میللەتان هەڵدەسێنن. ((لۆرد ولتۆن))

❖ شیعرو پەیكارتاشی و وێنە چۆنە،ژیانیش شتی جوانی بە نرخی تێدایە.

((ئۆسكار وایلد))

❖ شەرم و بێدەنگی بۆ ژن جوانترین ڕازاوەیە.

❖ شەش شت لە سەر مرۆڤــ گرانە :خۆی بناسێ،عەیبی خـۆی بزانێ،نهێنـی خـۆی بـشارێتەوە،ئارەزووەكانی بـەجێ بهێڵـێ،دژی سكـسییەكەی بێت،ئـەوەی پەیوەندی بەوەوەیە لێی گەڕێت. ((یەكێ لە ژیرەكان ))

## - خ -

❖ خیرا بمریت چاکترە لەوەی چاوەڕوانی مردن بکەیت.

❖ خۆشەویستی و مالی دونیا سەرچاوەی هەموو خراپەیەکە.

❖ خوایە، ئەو مرۆڤە چەندەگەمژەیە،کە یەکەم ماچی داهێناوە.

((جۆناسان سویفت))

❖ خەڵکی ئیشەکانی مردوو وەبیر ناهێننوە،تەنها ئیشە خراپەکانیان نەبێ بەلاَم ئیشەباشەکانیان لە گەیاڵیاندا گۆڕی دەکەن. ((شکسپیر))

❖ خۆهەڵکێش گوی لە دەنگی حەق و ڕاستی و ئاین ناگرێ. ((ناپلیۆن))

❖ خۆشی مامۆستا ئەو کاتەیە کە دەبینێ بیرو باوەڕەکەی بە تەواوی بە قوتابیان گەیشتووە.

❖ خۆشەویستی ڕاستی تەواو نابێ ئەگەر خۆشەویستەکە،بەختیار نەکەی.

((هیلۆبر))

❖ خراپەی برادەرەکانت لە بیر بکە،برادەریتان بەردەوام دەبێت.

((عەرەب))

❖ خەڵکی لایەنگری تۆڵەسەندنەوە زیاتر دەگری لەوەی هەوڵی پاداشت دانەوەی بدات. ((ئینگلیز))

❖ خۆشەویستی ئافرەت ئیعتراف بە پەیمان و داب و نەریت و واجیبات ناکات،تەنها بەو ئاگرەدا دان دەنێت کە دەیسووتێنێ.

((ئەتیان رای))

❖ خۆشەویستی ئافرەت بۆخۆی،وەکو دەریایەکی بێ سنوورە. ((ویلیس))

❖ خۆشەویستی پیاو،بە قسە دەردەکەوێ،بەلاَم ئافرەت بە فرمێسك و ماچ.

((بیرۆن))

❖ خۆشەویستی بەهاری ئافرەتەو پایزی پیاوە. ((هێلین ڕۆلاند))

❖ خۆشەویستی گوڵێکە،ئافرەتیش دڕکەکەیەتی. ((شۆپنهاوەر))

❖ خۆشەویستی ئافرەت،دان بە پەیمان و عادات دا نانات.

❖ خۆشەویستی ئافرەت،دان بە پەیمان و داب ونەریتا نانێت،تەنها بەو تەلە شقارتەیە نەبێ کە دەیسوتێنێ. ((ردیارد کبلنگ))

❖ خۆشەویستی زۆرانبازییە،ئافرەت بەسەر کەوتووانە لێی دەردەچێ ئەگەر ویستی. ((لابروبیر))

❖ خۆشەویستی مێژووی ئافرەتە،وەکو مانگ وایە ئەگەر لە زیاد بووندا نەبێ بەرەو کەمی دەڕوات. ((سیگار))

❖ خوا ئافرەتی جوان کردووە،بەلاّم ئەهریمەن وایان لێ دەکا ببنە هۆی فیتنەیی.

((فیکتۆر هۆگۆ))

❖ خوێندەواریی کەم بۆ ژن وای لێ دەکا مەغرور بێت و خوێندەواری زۆر وای لێ دەکا موتەوازع بێت. ((مارسیل بریفۆ))

❖ خولاسەی ژیانی ژن،خۆشەویستی و ئازار و ئیخلاس و لە خۆبووردنە.

((ئەنوریە دی بەلزاك))

❖ خەڵکی هەمیشە شکات لە سروشت دەکەن چونکە دڕکی ناوەتە نێوان گوڵ،ڕاستیش ئەوەیە سوپاسی سروشت بکەین چونکە دڕکی ناوەتە نێوان گوڵەوە.

❖ خۆشەویستی چەند سەیرە،بەختیاریمان لە ناخۆشی بۆ دەرئەکاو ناخۆشیمان لە خۆشی بۆ دەر ئەکا.

❖ خۆشەویستی،بە خۆشییەوە دووان بەیەکەوە دەبەستێ،لەهەمان کاتدا،سەربەخۆیی وبوونی دەپارێزێ. ((ئەریك فرۆم))

❖ خۆشەویستی،وەك ڕوناكی وایە جارو بار ڕەحمان پێدەكەن و جاروباریش ئازارمان دەدەن. ((كەمال شەناوی))

❖ خۆشەویستی،دەرگایەكە هیچ كەس نایكاتەوە،ئەوانە نەبێ كە بە وەفان.

❖ خۆشەویستی،هەستێكی پیرۆزی مرۆڤایەتییە،مرۆڤایەتی بەیەكەوە دەبەستێتەوە و بەختیاریشیان دەداتێ. ((كریستۆفەر))

❖ خۆشەویستی،لە لای پیاواندا هەست نییە،بەلآم بیرە. ((ئەرستۆ))

❖ خۆشەویستی،میوانێكە،بەبێ گەڕانەوە،سەفەریشی كرد ناگەڕێتەوە.

❖ خەلَكێك بگرە و بەردە دەكەن بۆ ئەوەی تێبگەن،خەلَكیش تێگەیشتووە بۆ ئەوەی بگرەو بەردە بكەن،زۆریشمان،بگرەو بەردە بۆ بگرە و بەردە دەكەین.

((عەرەب))

❖ خۆشەویستی،هەوەلَی ووشەیەكە و كۆتایی چیرۆكێكە بۆ هەولَی ژن هێنان.

❖ خۆشەویستی،زۆر شت دەكا،بەلآم سامان هەموو شتێك دەكا.

((فەرەنسی))

❖ خۆشەویستیت مەدە بە یەكێك وەفای نەبو.

❖ خۆشەویستی،وەكو دار گولَ وایە،هەركاتێ گولَێكی سیس بو چرۆیەكی تر دەردەكەوێ.

❖ خەلَكی وەكو ئاو وایە،ئاو هەمووی هەر یەكە،بەلآم لە نێوان ئاوەكاندا هەیە تەسكەو هەیە توندەو هەیە لە سەر خۆیە،یا پاكە یا ساردە یا لێلَە،یا گەرمە.

((تۆلَستۆی))

❖ خۆشەویستەكەم،هەموو سەوزایی باخچەی دزی و لە نێوان هەردوو پێلَویدا شاردییەوە. ((ئیلوار))

❖ خۆشەویستی نەخۆشییە،لەش ساغەکان ئارەزووی دەکەن.

((ئەلمەنفەلۆتی))

❖ خۆشەویستی،وەکو مردن وایە نە دان بە چینایەتیدا دەنێ و نە بە سامانیدا.

((باینۆن))

❖ خۆشەویستی بێدەنگی،جوانترین دڵدارییە،بەلام خۆکوشتنێکی لە سەر خۆیە.

((مارك توین))

❖ خۆشەویستی لاوان لە قولایی دڵەوە نییە،بەڵکو لە چاوییانەوەیە.

((شکسپیر))

❖ خۆشەویستی نامرێ، لە بەر ئەوەی ژیان بەردەوامە.

((ئەکتەر هالە فوئاد))

❖ خۆشەویستی،گرنگترین شتە لە جیهاندا. ((ئەکتەر یوسرا))

❖ خراپترین جۆری جەور ئەوەیە،کە بڵێت لە وێدا عەدالەت هەیە.

((ئەفلاتون))

❖ خوێندنەوە،هەموو نەخۆشییەکانی ژیان لە بیر دەباتەوە. ((سنیکا))

❖ خۆشەویستی،هەوەڵی هەموو شتێکەو ناوەڕاستێتی و کۆتایشە.

((لارکۆریۆ))

❖ خراپترین پیاو ئەو پیاوەیە،کە باوەڕی بە ژنەکەی نییە،بەوە خۆی بێ نرخ دەکا بەبێ ئەوەی بزانێ. ((مارگریت))

❖ خۆشەویستی،بەرز دەبێ و دادەبەزێ،نایەڵێ پیاو وەکو خۆی بێ.

((گۆستاف لۆبۆن))

❖ خۆشەویستی وەکو شێر هێرش دەبات و وەکو مەڕ دەگەڕێتەوە.

((هۆگۆ))

❖ خۆشەویستی،باڵندەیەكە تەنها دانی دڵ دەخوات. ((بریفۆ))

❖ خۆشەویستی،شۆڕشی دڵی داڕێژراوە هەركاتێكیش مرۆڤ گریا بەردێك لە بینای لە خۆ بایی دەڕوخێ. ((لامارتین))

❖ خۆشەویستی،ئەوەیە بە دڵ پەیوەستی بێ و باشتریش وایە بە ئەقڵت بێ. ((ژیرێك))

❖ خۆشەویستی بە هێز زنجیر دەكاتەوەو كۆتیش دەشكێنێ.

❖ خۆشەویستی،ڕاڕایی ژیانەو برادەری هێمنی ئیسراحەتە. ((نن))

❖ خۆشەویستی،بنكەی ژیانە،ئەگەر ئەوەش نەبوایە ژیان دروست نەدەبو.

❖ خۆشەویستی،هەستێكە لە ناو دڵدا جێی خۆی دەكاتەوە ڕۆحیش تا دووا تەمەن تیر دەكات. ((فەرید ئەلئەترەش))

❖ خۆشەویستی،كتێبێكی بە نرخە،نیشانەی ماچە.

## - ن -

❖ نەزان دوژمنی خۆیەتی،ئیتر چۆن بە هاورێی یەکێکی تر دەبێ.

((ئەرستۆ))

❖ نە قەرز دەکەم،نە قەرز دەدەم،چونکە قەرز ڕێگەیەکە بۆ خراپ بوون.

((شکسپیر))

❖ نەزانێکی سەخی،لای خوا خۆشەویسترە لە خوا پەرستێکی ڕەزیل.

((ژیرێك))

❖ نابێ هەرگیز ئیش و کشتوکاڵ لە کاتی خۆی دا دووا بخەی،ئەگەر هەلت لە دەس دەرچوو ناگەڕێتەوە.

❖ نابلیۆن ووتی :من لە شەڕی (ئەرکولا) سەرکەوتم بە بیست و پێنج سوارەوە،چونکە من ئەو هەلەم بە کار هێنا کە دوژمن ماندووبوون و بەو ژمارە کەمەوە سەرکەوتم بەسەریاندا،شوپای شەڕکەریش لە دوو زۆرانباز دەکەن،ئەگەر یەکێکیان هەڵەیەکی بچوکی کرد،ئەوی تریان ئەو هەڵەیەی لە دەس نەدا بەسەری دا سەردەکەوێ،هەروا ووتی :جارێکیان (نەمساوی)یەکانم شکاند چونکە گوێیان بە کاتیان نەدا.

❖ نهێنی بە ڕای ئافرەت دووانە،نهێنییەك کە لای ئەو هیچەو پێویست بە شاردنەوە ناکا،نهێنییەکیش لەوە گەورە تر بشارێتەوە.

❖ نەزان سوورە لە شتەکەو زانا بە گومانە و ژیر پەلە ناکا. ((ئەرستۆ))

❖ ناودارێتی،بەری هەوڵدانە. ((ڕێلّندن))

❖ نەزان چی دەڵێ با بڵێ،چونکە زانست نرخێکی هەیە و ئینکار ناکرێ.

❖ ناخۆشترین خەفەت ئەوەیە،ڕۆژانی خۆشی و شادیمان بیرکەوێتەوە لە کاتی ناخۆشیدا. ((دانتی))

❖ نهێنی سەرکەوتن ئەوەیە،بزانین چەندێ کاتمان پێویستە بۆ سەرکەوتن.

❖ نیشتمانی ئافرەت پیاوەکەیەتی. ((ڕووسی))

❖ ناخۆشی وخۆشی ژیانم چەشت،ناخۆشی و خۆشی،وەك یەکن لە شرین و تاڵیدا.

((نەجیب ولڕەیحانی))

❖ نیشتمان پێش ڕوحە،چونکە ئەو بارەگای حەسانەوەتە.

((وێژەی حەبەشی))

❖ نیشتمان پەروەرێتی هەستە لە ناخەوە زیاد دەکاو گڕی لە دڵدا زۆر دەبێ،ئەو کاتەی خەم و خەفەتی وولآت گەورە بێ و زیاد بکا.

((مستەفا کامیل))

❖ نابێ ئەوەی دەیزانی بیڵێی،بەڵام ئەوەی دەیڵێی دەبێ بیزانی.

((کلۆدیۆس))

❖ نهێنی شاردنەوە گرانە،لەوەش گرانتر ئەوەیە بلآوی بکەیتەوە.

❖ نهێنی خۆت بە خزمەکارەکەتیش مەڵێ. ((وێژەی یابانی))

❖ ناخۆشی پیاو دروست دەکا،بەختیش دڕندە دروست دەکات.

((فەرەنسی))

❖ ناوی باش،لە زنجیری زێڕ باشترە.

❖ نامەوێ بژیم بە هەستێکی بەستەڵەکی، لە بەر ئەوە باوەڕم هەیە بە خۆشەویستی زانیاریانە. ((ڕەغدە))

❖ نان و خۆشەویستی، جیهان دەجولێنێ. ((شیلەر))

# بەشی شەشەم

## پێشەکی

خوێنەرانی ئازیز و خۆشەویست،داوایەکی زۆر لە لایەن هەندێ کەس و برادەران و ناسیاو داوای بەردەوام بونیان دەکرد دەربارەی (وتەکانی ژیان)، لە ڕاستیدا بەشی شەشەم ئامادەم کردبو کە هەمووی ووتەی ئینگلیزە هەر چەندە بڕیارم دابو کۆتایی پێبێنم ئەوا بەشی شەشەمم چاپ کرد،هیوادارم جێی ڕەزامەندیتان بێت.

بەڕاستی من زویرم لە وانەی کە بە ئاشکرا دزی ئەدەبی دەکەن و کتێبی یەکێکی کە چاپ دەکەن وبە ناوی خاوەنەکەیەوە،کە خاوەنەکەی ئاگای لە هیچ نەبووە وبە بێ ڕەزامەندی خاوەنەکەی چاپ کراوە،ئەمەش دیاردەیەکی ناشیرینە.

هەر بۆ نموونە هەر دوو بەشی یەکەم و دووەم لە ووتەکانی ژیان لە ساڵی ١٩٩٨ لە هەولێر ژمارەی سپاردن (١٦٢)ی دراوەتێ کەچی فەرمانبەرەکانی هەولێر ئاگاداری ئەو ژمارەیە نین سەیر تریش لەوە لە دووا لاپەڕەی بەشی یەکەمدا نووسیویەتی مافی لە چاپدانی پارێزراوە بۆ نوسەرەکەی.

جا کاکی برا تۆ بە چ مافێ ڕێت بە خۆت دا کە نوسراوە (مافی لە چاپدانی)پارێزراوە بە چ مافێك (خ) تۆ ئەو دزییە دەکەی، من لە هەموو ئەوانەی ئەو کتێبە یان کڕیوە پێیان ووتم کە تۆی. سەیر تریش لەوە بەشی یەکەم ناوی

چاپخانەكەش نەنووسراوە تا ڕادەیەكیش ناوی چاپخانەكەشیان پێم داوە كە لە سلێمانی كراوە.

لە كۆتاییدا دەڵێم هەر كەسێ بەبێ ڕەزامەندی كتێبی منی لە لایێ مۆری منی پێوە نەبێ بە دزی دەزانم بە پێی یاسا تاوانباری دەكەم.

**محەمەد عبدولڕەحمان زەنگنە**
**كەركوك ٢٠٠٧**

## - ئا -

❖ ئافرەت لە شەڕدا، لە پیاو ژیر ترن.

❖ ئاسنی سارد، دەکوتیٚ.

❖ ئافرەت شەریکە، هیچ چارەش نیە.

❖ ئافرەت، ئەو کاتە پێدەکەنیٚ کە دەتوانیٚ،بەلاّم ئەو کاتەی بیانەویٚ دەگرین.

❖ ئایا دەتوانی لە (لم) ڕۆن دەربکەی ؟

❖ ئافرەتی ناشرین،ئەگەر جلی باش و جوان لە بەرکەن،زیاتر ناشرین دەبن.

❖ ئاوی زۆر،ناتوانیٚ دلّداری کوێر بکاتەوە.

❖ ئاگرێك مەکەرەوە، کە نەتوانی بیکوژێنیتەوە.

❖ ئامۆژگاری بە نهێنی بکەو، مەدح کردن بە ئاشکرا.

❖ ئامۆژگاری هەموو کەس بکە، بەلاّم کەفیلی کەس مەکە.

❖ ئاگر و ئاو دوو خزمەکاری باشن،بەلاّم دوو مامۆستای خراپن.

❖ ئامۆژگاری و خوێی،بە کەس مەدە ئەگەر داوات لێنەکرا.

## - ئە -

❖ ئەی پزیشك، خۆت چارە بکە.

❖ ئەوەی لە قەرز کردن دوور بکەوێتەوە،لە خەتەر دوور دەکەویتەوە.

❖ ئەو شتە کەمەی لە دەستایە، لەو شتە زۆرەی کە چاوەڕوانی دەکەی باشترە.

❖ ئەوەندە بخۆ کە پێت خۆشە، ئاو بخۆرەوە کەمە کەمە.

❖ ئیشی ئازایەتی، پێویستی بە شەیپور نیە.

❖ ئیش کردن، خۆی ژیانە.

❖ ئەو هەورانەی خۆر دروستی کردووە، خۆر دەشارنەوە.

❖ ئەوەی ئەگەر بانگ نەکرابێ، خواردنی بۆ دانانرێ.

❖ ئیش و جولە، ئەقڵ بەهێز دەکا، بەڵام وانەی لاوازی دەکا.

❖ ئەوەی لە سەرتە بیکە، پاشان داوای حەقی خۆت بکە.

❖ ئەگەر پیاوێك لە کاتی تەنگانەدا ئامۆژگاری کردی، باوەڕی پێمەکە.

❖ ئەو خواردنەی بۆ پیاوێك خۆشە، بۆ یەکێکی کە ناخۆشە.

❖ ئەگەر پێویستیت بە ئامۆژگارییەکی باش بو، پرس بە پیاوی بەساڵاداچوو بکە.

❖ ئەگەر میوەت ویست، فێر بە چۆن سەر دەکەویت.

❖ ئەگەر سەرنەکەوتی، دووەمین جار هەوڵ بدە.

❖ ئەگەر ویستت لە یەك کاتدا دوو ئەسپ بگریت، هەر دووکت لە دەست دەڕوا.

❖ ئەگەر نەتوانی قسەی باش بکەی، قسەی خراپیش مەکە.

❖ ئەو شتانەی کە بە حەرام دەستت کەوتووە، بەر ناگرێ.

❖ ئەوەی کە بە فێڵ دەستت دەکەوێ، پەنجەی مرۆڤ دەسووتێنێ.

❖ ئەوەی پێش بکەوێ، ئەو یەکە کەسە دەبێ کە خواردنی بدەنێ.

❖ ئەو سەگانەی زۆر دەوەڕن، کەمجار قەپاڵ دەگرن.

❖ ئەو میوانانەی بە ڕۆژ دێن، ڕێزیان لێدەگیرێت.

❖ ئەوەی چاكە بكات، بە ڕێی دێت.

❖ ئەوەی ترشی نەچێژێت، تامی شیرینی نازانێت.

❖ ئەوەی لە كاتی خۆیدا شتێك دەدات، وەكو ئەوە وایە دوو قات بێت.

❖ ئەوەی نەزانێ پارەو پولی چۆن خەرج بكات، ئەو كەسە شایستەی نیە.

❖ ئەو كەسەی بە بەختیاری بژی، تەمەنی درێژ دەبێ.

❖ ئەوەی قەرز بە برادەرەكەی بدا، برادەرەكەی لە كیس دەچێ.

❖ ئەوەی ئەوەندە بخوات تاكو نەخۆش دەكەوێ، پێویستە بەڕۆژو بێت تاكو چاك بێتەوە.

❖ ئەوەی تووڕە بێت، زۆر كەم دەحەوێتەوە.

❖ ئەوەی هێلكەیەك بدزێ، گایەكیش دەدزێ.

❖ ئەگەر یەكێك برادەری زۆر بو، برادەری نیە.

❖ ئەگەر من خۆم بە گەورە بزانم و تۆ خۆت بە گەورە بزانی كێی خۆڵەكەوە دەكوژێنێتەوە.

❖ ئەگەر دوو برادەری موخلیس پێكەوە بوون، خودا سێیەمیان دەبێ.

❖ ئەوەی شاردراوە بێت، هەر بڵاو دەبێتەوە.

❖ ئەوەی ڕاست نەبێت هەڵەیە.

❖ ئەگەر پشیلە نەبو، مشكان تلیلیانە.

❖ ئەوەی بە باشی دەستی پێبكرێت، كەوابو نیوەی تەواو بووە.

❖ ئەوەی مرۆڤــ دەیەوێ، بە ئاسانی باوەڕی پێدەكا.

❖ ئەگەر ئیشەكەت دوو جار كرد، هەموو خەڵكی ژیرن.

❖ ئەوەی لات جێگیر بوو، بە زوویی پێت ناگۆڕدرێت.

❖ ئەوەی ناتوانرێت بگۆڕدرێت، پێویستە لێی بێزار نەبێت.

❖ ئەوەی منالّ لە مالّەوە دەیبیسێت، یەکسەر لە دەرەوە بلاّو دەبێتەوە.

❖ ئێمە کە مندالّ بوین هەلّەمان دەکرد، بەلاّم کە گەورە بوین پەشیمان نابینەوە.

❖ ئێمە ئەوەندە مەیوس و بێبەخت نین، بەو جۆرەی بیری لێدەکەینەوە.

❖ ئەگەر دەست بلاّو نەبیّ، هەژار نابی.

❖ ئەقلّت وەکو قەلّغان بەکار بێنە، نەك وەکو شمشێر.

❖ ئەگەر (با)ت هەلّیکرد، بیقۆزەوە.

❖ ئەوەندە خراپ نیە، وەکو دەر دەکەویّ.

❖ ئەوەی بژی، دەبینیّ.

❖ ئەو ڕێگەی بۆ (بابل) دەڕوا ناتگەیەنێتە (قودس).

❖ ئەو مرۆڤەی کە داوای مافی خۆی ناکا، بە زیندۆیەتی مردووە.

❖ ئەوەندە بەرز دەبیتەوە، ئەوەندەش دێیتە خوارەوە.

❖ ئەوەندەی بە سەر خۆتا زالّ دەبیّ، گەورەترین سەرکەوتنە بەسەر خەلّکی تردا.

❖ ئەو کەسەی ئیشی نەبیّ، شەیتان ئیشی بۆ دەدۆزێتەوە.

❖ ئەگەر زۆر قسەت کرد، هەلّەش زۆر دەکەی.

❖ ئەوەی هەموو خەلّکی دەلّیّ، ڕاستە.

❖ ئەوانەی لێرە نین، هەمیشە هەلّەن.

❖ ئەو دارە ڕاستانە، ڕەگەکانیان گێڕە.

❖ ئەگەر دار بەکار نەهێنین، مندالّ لە ڕێگە دەردەچن.

❖ ئەگەر کەش و هەوا باش بو ئەرز بکێلّە، چونکە تۆ نازانی سبەی چی دەبێت.

❖ ئەو ئافرەتە ناخوازم کە یەك عەیبی هەبیّ، ئەو ئافرەتە دەخوازم کە دوو عەیبی هەبیّ و هەر کەس بیّ.

❖ ئەوەی بە پەلە بێت، بە پەلەش دەڕوا.

❖ ئێش و ئازار لە بیر دەچیّ، کە قازانج دەسکەوت.

❖ ئەوەی ئاوێنەکەت پێت دەڵێت، هیچ برادەرێکت پێت ناڵێت.

❖ ئەی گەدەم پڕ بویتە، ئێستاکە ئیش بکە.

❖ ئەگەر ویستت نهێنی لە ناخۆشی و خۆشیدا بۆی بگەڕێ.

❖ ئەگەر ویستت قیمەتی پارە بزانی، برۆ کەمێك پارە قەرز بکە.

❖ ئەو ئیشەی زوو تەواو دەبێ، خۆشحاڵمان دەکا.

❖ ئەوەی خۆشتی دەوێت، ئامۆژگاریەکەی بنوسە، دوور نیە لەم کاتـەی ئیستەدا قەبوڵی نەکەی.

❖ ئەو کەسەی لە دوواجاردا پێدەکەنێ، زۆر باش پێدەکەنێ.

❖ ئەگەر دوو کەس یەکێکیان ژیر بێت، هەر دووکیان بەختیار دەبن.

❖ ئیرادە هەبێ، ڕێگا لە وێیە.

❖ ئەگەر قسە سودی نەبوو، لێدان سودی دەبێت.

❖ ئەگەر لە (ڕۆما)بویت، ڕۆمانیەکان چی دەکەن، تۆش وا بکە.

❖ ئەگەر (مەی)لە سەری دا، ئەقڵ دەردەچێ.

❖ ئەگەر ئاسن گەرم بوو، ئەو کاتە کاتی لێدانێتی.

❖ ئەگەر خەفەت نوستبو، هەڵی مەسێنە.

❖ ئەوانەی بێئیشن، لە هەموو کەس زیاتر ماندوون.

❖ ئەگەر ئامۆژگاری سوودی نەبوو، داریش سوودی نیە.

❖ ئەگەر پیاوەکەت لێی کەوت، هەموو کەس پێی بەسەریدا دەنێ.

❖ ئەگەر کەیف خۆش زۆر بو، دەبێتە هۆی ناخۆشی.

❖ ئەوەی درەنگ بنوێت، بەیانی درەنگ هەڵدەسێت.

❖ ئەوەی ئەمڕۆ پێتدەکرێ، مەیخەرە سبەی.

❖ ئیشی باش بەردەوام دەبێ، ئەوەی بە پێچەوانەی ئەوەوە بو نامێنێ.

❖ ئەوەی بیەوێ سەرکەوێ بە سەر هەموو کەسێکدا، هەموو کەسێ دەدۆڕێنێ.

## - ب -

- ❖ بە سەبر کردن، هەموو شتێك دەتوانی بکەی.
- ❖ بەخێر بێت ئەی شەڕ، ئەگەر بە تەنهای.
- ❖ بە دانسقەیی بۆمان دەردەکەوێ کە ئێمە هەڵخەڵەتاوین.
- ❖ بمانەوێ برادەرمان هەبێ بەبێ هەڵە، ئەوە نادۆزیتەوە.
- ❖ بێدەنگی ناماقوڵ، شێتیە.
- ❖ بێستانی چاکە، سیس نابێتەوە.
- ❖ بەهێز بوون، لە یەککگرتندایە.
- ❖ بە هیچ شتێك باوەڕ مەکە، تاکو بە چاوی خۆت نەیبینی.
- ❖ بە بەردێك دوو چۆلەکە دەکوژێ.
- ❖ برادەری لە گەڵ ئافرەتانا، قوتابخانەی ئەدەبە.
- ❖ بەیانان بۆ شاخ بڕۆ، ئێواران بۆ کانی.
- ❖ برادەری کۆن، باشترین ئاوێنەیە.
- ❖ باوك بە مردنی منداڵێکی ئاخ و داخێکی زۆر دەخوا لە وەی بزەیەك بیگرێ کە منداڵی زۆری دەبێ.
- ❖ باوك چۆن بێ منداڵیش وا دەبێ.
- ❖ برادەرەکانت بە باشی باسیان بکە، هیچ شتێك دەربارەی دوژمنەکەت مەڵێ.
- ❖ بە یەککگرتنمان بەردەوام دەبین، کە یەکمان نەگرت دەڕوخێین.
- ❖ بێدەنگی، ڕازی بوونە.
- ❖ بێدەنگی زیرەکییە، کاتێك قسە جۆرێك لە شێتی بێت.
- ❖ بە دەستێ بڵاو بکەرەوەو بە دوو دەس کۆبکەرەوە.
- ❖ بەردی کلۆ بو، گیا لە گەڵ خۆی کۆناکاتەوە.

❖ برۆ بۆ نووستن بە برسێتی، باشترە لەوەی هەڵسی و قەرزار بیت.
❖ بێدنگ بە باشترە، لەوەی ئەگەر گوێت لێنەگرن.
❖ بە تەنها دانیشی باشترە لەوەی لە گەڵ خراپەکاراندا دانیشی.
❖ برادەر لە کاتی تەنگانەدا دەر دەکەوێ.
❖ بەرانگیر خەتەر بەرەوەباشترە لە ترسێکی هەمیشەیی.
❖ بە نەرم و نیانی، هەموو دەرگایەك دەکرێتەوە.
❖ بەو بەشە ڕازی بە، کە پێت دراوە.
❖ بە پێی بەڕەکەت، لاقت ڕاکێشە.
❖ بەرگەی شەڕ بگرەو، چاوەڕوانی خێر بە.
❖ ببە بە برادەری خۆت، خەڵکانیش بە برادەرت دەبن.
❖ باوەڕ پێکردن، کێو لە بن هەڵدەتەکێنێ.
❖ بە هیچ مرۆڤێك مەڵێ بەختیارە، تا نەمرێ.
❖ باوەڕ، هاوڕێی سەرکەوتنە.
❖ باوەڕ بە برادەرێك مەکە، لە کۆتاییدا بە جێت بهێڵێ.
❖ با برادەر بین، بەڵام کیسەمان جودابێت.
❖ برادەرت کەم بێت و ناسیاوت زۆر بێت.
❖ برسێتی، لە دیوارەوە دەردەچێ.
❖ بۆ هەموو ئازارێك، بۆ لای پزیشك مەڕۆ، بۆ هەموو شەڕێك بۆ لای پارێزەر مەڕۆ بۆ لای هەموو کوپەیەك ئاو خواردنەوە مەڕۆ ئەگەر تینوت بو.
❖ بێ ئیشی هەمیشە، حەسوودی بە ئیش دەبا.
❖ بە مۆمەوە بە دوواتا، دەگەڕام.

## - پ -

❖ پاداشتی چاکە، هەر چاکەیە.

❖ پەیوەندی خراپ، ئاکار تێکدەدات.

❖ پیاوی باش، چاکە بە چاکە دەداتەوە، پیاوی خراپ زیاتر داوا دەکات.

❖ پێدان لە گەڵ ڕووخۆشی، دوو دەس کەوتە.

❖ پیاوی برسی، تورەیە.

❖ پێش ژن هێنانت،ماڵێکی باشت هەبێ تێدا بژیت.

❖ پیاوێك ئەگەر مێشکی نەبو، بە ڕاستی ئاژەڵێکە.

❖ پیاوێك دە منداڵ بەخێو دەکات، بەڵام هەر دەیان باوکیان بەخێو ناکەن.

❖ پێت سوڕا باشترە، لەوەی زمانت بسوڕێ.

❖ پیاوێکی تەمەن گەورە، لە ماڵەوە بەڵگەی خێرە.

❖ بۆ ڕۆژ هەڵات و ڕۆژ ئاوا بڕۆیت، وولات لە هەمووی باشترە.

❖ بەڵێنی دوژمن، دووا دەکەوێ.

❖ پیاوی خراپ، دان بە چاکەدا نانێت.

❖ پێویستە ئاشتی کۆتایی هەموو شەڕێك بێت.

❖ پیاوانی بەخت دار، پێویستیان بە ئاگاداری نیە.

❖ پێویستی، دان بە یاسادا نانێ، ئەوەی زەرور بێت قەدەغە کراویش بە باش دەزانێ.

❖ پەنجەکانی دەس لە یەك ناچن.

❖ پارە خەرج کردن لەوە خراپترە کە پارەت نەبێ.

❖ پێویستە لە سەر نەشتەرگەرەکان، چاوی هەڵۆیان هەبێ و دڵی شێر و دەستی ئافرەت.

❖ پێپلکە بە دوای پێپلکە، سەر دەکەوێتە سەرەوە.

❖ پێویستە چاکەتەکەت، بە قەد قوماشەکەت ببڕیت.

❖ پێویستە لاوەکان فێر بن، کاتێ بە ساڵەچووەکان ئیش دەکەن.

❖ پێویستە بە قەڵەوی و لەڕی ڕازی بیت.

❖ پێویستە لە سەر ئافرەت لە ژیانا ئامۆژگارییەکانی جێ بەجێ بکات، بەلاَم کە مرد ناتوانێ.

❖ پێویستە ئەو چاکانەی لە گەڵ خەڵکدا کردوومانە یادی بکەینەوە، بەلاَم نابێ ئەو چاکانەی لە گەڵماندا کراوە لە بیری بکەین.

❖ پێویستە یاری بکەین بۆ ئەوەی بژین، نەك بژین بۆ ئەوەی یاری بکەین.

❖ پێداویستی، دایکی ئیشە.

❖ پشت گوێ خستن، پیاو بەرەو مەیوسی دەبات.

❖ پیاو خراپان، خۆیان بە گەورە دەزانن لە پیاو چاکان.

❖ برادەرەکەت تاقی بکەوە، پێش ئەوەی باوەڕی پێبکەی.

❖ پێویستە قەڵەمی زمان، بکرێ بە مەرەکەبی دڵدا.

## - ج -

❖ جێی پێت دیاری بکە، پێش ئەوەی هەنگاو بنێیت.

❖ جەنگ چەندە ئاسانە، بۆ ئەوانەی تەماشا دەکەن.

❖ جەنگ خوانی مردنە.

❖ جلەکان، کەم مەکەرەوە، تاکو مانگی نیسان تەواو دەبێ.

❖ جل و بەرگی جوان هەموو دەرگایەکی بۆ دەکرێتەوە.

## - چ -

❖ چاکەو خۆهەڵکێشان،دوو ئامرازی جیاوازن،بەلآم هەردوو کیان نان بە هەژار دەدەن

❖ چاکە بکەو فڕێی دە دەریاوە.

❖ چاو دەبینێ و، دەست ئیش دەکا.

❖ چ تاوانێك گەورەترە، لە وەی کات وون بکەی ؟

❖ چاو مرواری دەم و چاوە.

❖ چەندە تەمەنت گەورەبو، بەردەوام بە لە خوێندن.

❖ چاکە لە گەڵ هەژاراندا بکە، سامانت زیاتر دەبێ.

❖ چەند ژیان ناخۆشە، ئەگەر هیوا نەبوایە.

❖ چاکە زیاتر کاریگەری هەیە، لە خراپە.

## - د -

❖ دەوڵەمەندی و کەرامەت، هەرگیز دڵێکی بریندار چاك ناکاتەوە.

❖ دوور نیە گوێت لێبێ، هەر گیزیش نابینیت.

❖ دوێنێ ناگەڕێتەوە.

❖ دوور نیە قسە، ببێ بە ئیش.

❖ دەوڵەمەندی لە هەژاریەوە دەزانرێت.

❖ دەوڵەمەندی دوژمنی، تەندروستیە.

❖ دەتوانین بە بێ برادەر بژین، بەلاّم ناتوانین بە بێ هاوسێ بژین.

❖ دوور نیە یارمەتی گەورە بدەی، بەلاّم لە دەست کەوتندا.

❖ دەتوانین هەموو شتێك وا دەر بخەین وەکو دەمانەوێ.

❖ دەست بلاّوی، بە هەژارت دەکات.

❖ دوو چاو، لە یەك چاو باشترە.

❖ دوو ڕا، لە یەك ڕا باشترە.

❖ دوو شت هۆی ترسناکە، حەسودی برادەرو رق و کینەی برادەر.

❖ دەچیتە شتێکەوە، کە پەیوەندی بە تۆوە نیە.

❖ دیوار، گوێی هەیە.

❖ دار بە بەرەکەی دەناسرێت.

❖ دەوڵەمەندی، باڵی هەیە.

❖ دایکی باش، ناڵێت ئایا چیت دەوێ، بەلاّم هەر لە خۆیەوە خێر دەداتەوە.

❖ دوور نیە ناوداری وەربگرن بە بێ ئەوەی شایستەی بن و دوور نیە لە دەستی بدەن بە بێ ئەوەی هەڵتان کرد بێ.

❖ دوو سەگ لە سەر ئێسکێك شەڕیان بو سەگی سێیەم دەیقرتێنێ.

❖ دوور نیە لە سەر ڕاستی لۆمەت بکەن، بەڵام شەرم مەکە.

❖ دەم و چاوی گرژی برادەر باشترە لە بزەی بێ ئەقڵ.

❖ دووا بزەت باشترە، لە پێکەنینی یەکەم.

❖ دوور نیە پارو لە نێوان دەست و لێودا بکەوێت.

❖ درۆزن، باوەڕی پێناکرێ، تەنانەت ئەگەر ڕاستیشی ووت.

❖ دەم و چاوی جوان، پێویستی بە میکیاج نیە.

❖ دەم و چاو سوور بوون لە شەرما، ڕەنگی جوانیە.

❖ دان پێنان، لێکدابڕان نابێ.

❖ دەنگی بەرز لە ناخێکی بەتاڵییەوەیە.

❖ دڵۆپە لە دووای دڵۆپە، مەسینە پڕ دەکات.

❖ دڵداری، کاڵتە بە قفڵی ئاسنگەر دەکات.

❖ دەستی زۆر، ئیش ئاسان دەکات.

❖ دوور نیە لە خراپەکاری ببوری، بەڵام لە بیری ناکەی.

❖ دوو بەرەکی، پێویستی بە دوو کەسە.

❖ درۆی گاڵتە، دەبێتە هۆی رق و کینە.

❖ دەس بە کەمەکەوە بگرە، تا زۆرت بۆ دێت.

❖ دوور نیە کراسی جوان بێ ئەقڵ بشارێتەوە، بەڵام ووشەی بێ مانا ئاشکرا دەکا.

❖ دان نان بە چاکەدا، بەڵگەیە بۆ بەرزێتیت.

- ٥ -

❖ هەموو شتێك بە کۆتاییەکەی دەر دەکەوێ.

❖ هەموو شتێکی بریقەدار، زێڕ نیە.

❖ هەلت لە دەس چوو، ناگەڕێتەوە.

❖ هەموو ڕۆژێك سێوێك بخۆ، پزیشك لێت دوور دەکەوێتەوە.

❖ هەژار، کەسوکارەکانیان، نایناسن.

❖ هێزی ئافرەت لە زمانیدایە.

❖ هیچ کەسێك ناتوانێ یەکەم بێ لە هەموو شتێکدا.

❖ هەرچەندەدەتوانی کەیف خۆش بە، هەر پیاوێك کەیف خۆش نەبوکەس خۆشی ناوێ.

❖ هەموو شتێك هەوەڵی هەیە.

❖ هەموو شتێك لە کاتی خۆیدا باشە.

❖ هەر کەسێ سەبر بکا، ئەوەی ئاواتی بێ بە دی دێت.

❖ هەڵە زۆر بێت لەو شوێنە، خۆشەویستی کەم دەبێت.

❖ هەموو هەڵەیەك، سزاکەی لە گەڵ خۆیەتی.

❖ هەموو کەسێك هەڵەکانی، بە سەر زمان دەخا.

❖ هەموو کەس لە پیاوی دەوڵەمەندەوە، نزیکە.

❖ هەموو مرۆڤێك بەشی خۆی هەیە.

❖ هەموو مرۆڤێك، پزیشکی خۆیەتی.

❖ هەموو سەگێك ڕۆژێکی هەیە،هەموو مرۆڤێکیش کات ژمێرێکی هەیە.

❖ هەژارەکان، لە شۆڕش ناترسن.

❖ هەل، نابێ چاوەڕێی بکرێ.

❖ هیچ ئامۆژگارییەك، وەك ئامۆژگاری باوك نیە.

❖ هیچ دەسکەوتێك، بە بێ ماندوو بوون نایەت.

❖ هیچ کەسێك ناتوانێ دوێنێ بگێڕێتەوە.

❖ هیچ کەسێك ناتوانێ بە تەنها بژی، ئەگەر لە بەهەشتا بێت.

❖ هیچ شتێك وەکو فرمێسك زوو وشك نابێتەوە.

❖ هیچ شتێك لە ژێر چاوی مامۆستا، ناشاردرێتەوە.

❖ هیچ شتێك لە بێدەنگی باشتر نیە.

❖ هێمنی و لە سەر خۆیی، سەلامەتییە و پەلەکردن پەشیمانیە.

❖ هیواو ئاواتی گەورە،پیاوانی مەزن دروست دەکات.

❖ هەر کەسێ بە سەر پردێکدا تێپەڕی، پێویستە وەسفی بکات.

❖ هەر چیت هەیە ئاگاداری بە، ڕۆژێك دێت بەکاری بهێنی.

❖ هەواڵی خراپ زوو بڵاو دەبێتەوە.

❖ هیواو ئاوات ناتوانێ کیسە پڕ بکات.

❖ هەموو شتە لاوازەکان، یەك بگرن، بەهێز دەبن.

❖ هەموومان لە قەبردا وەك یەك پاڵ دەکەوین.

❖ هەڵەکانمان، بە ئاسانی لە بیر دەکەین ئەگەر کەس پێی نەزانێ.

❖ هیچ تاریکیەك، لە نەزانین تاریکتر نیە.

❖ هیچ جێگایەك، لە وولات باشتر نیە.

❖ هیچ کاتێك، لەم کاتە باشتر نیە.

❖ هەموو شتێك، کات و شوێنی خۆی هەیە.

❖ هیچ دووکەڵێك، بێئاگر نیە.

❖ هەمیشە ئەو شتە ڕوو دەدات کە چاوەڕوانی نەبوی.

❖ هەمیشە یەکێك هەیە لە تۆ بەد بەخت تر.

- هەر چەندە ناسیاو زۆر بوو، خەتەر زۆرتر دەبێت.
- هەر چەندە وانەت زۆر بوو، زانست زۆر دەبێ.
- هەنگاوی یەکەمی مرۆڤـ دەبێتە پردێك بۆ پیاوی دووەم.
- هەر چەندە مەیمون بەرز بێتەوە، بەلاّم کلکی دیارە.
- هەست بە نەخۆشی دەکەین، هەرگیز هەست بە تەندروستی باش ناکەین.
- هەڵەشەیی ئازایەتی نیە.
- هەر چەندە دەتوانی، کات ژمێری شەڕ دووا بخە.

## - و -

❖ وریابە لە خەرج کردنی کەم کەم.
❖ وریا بوون، بەشێکە لە زیرەکی.
❖ وشەی نەرم و نیان، بەکار بێنە، بۆ بگرەو بەردەو رق و کینە.
❖ واز لە گاڵتە بهێنە، ئەگەر خۆشیشی تێدا بێت.

## - ز -

❖ زۆر قسە هەیە،لە شمشێر زیاتر بریندار دەکات.
❖ زۆر خەڵك کۆیلەن، لە بەر ئەوەی ناتوانن بڵێن نەء
❖ زۆر گرانە خۆی خراپەکاری بگۆڕێ.
❖ زۆر جار دوو زمانی درۆ، زەرەرو زیانێکی گەورەی دەبێ.
❖ زانست کانزایە، بەڵام مەشق کردن لە سەری کلیلەکەیەتی.
❖ زۆر جار ئارەزووەکانمان، خراپمان دەکات.
❖ زمان درێژە دەستی کورتە.
❖ زانستێکی کەم، دژوارە.
❖ زیرەك، لە ئاماژە تێدەگات.
❖ زیرەکی لە بازرگانیدا، ئیشی یەکەم و دووەم و سێیەمە.
❖ زمانت بەند بکە،تاکو بەندت نەکات.
❖ زیرەك ئەو کەسەیە، لە یەکێکی کەوە فێر بێت.
❖ زیرەکەکان، وەڵامی حازر بە دەستیان پێیە.
❖ زانست لە منداڵیەوە،نیگارێکە لە سەر بەرد.

❖ زۆرتریانمان لە بیر چووە، لەوەی لە یادمان دایە.

❖ زۆر جار سوکایەتی بەوە دەکەین کە سودی هەیە بۆمان.

❖ زۆر جار ئێمە بەڵگە بە دوژمنەکانمان دەدەین، بۆ ئەوەی لە ناومان بەرن.

❖ زمان حاڵی ئەسپ ئەسپ دەڵێ لە سەرکەوتنا ئاگات لێم بێ و لە دابەزینا لێمگەڕێ، کە ماندو بووم ئاوم مەدەرێ.

❖ زۆر بیر بکەرەوە، کەم قسە بکە، لە کەم کەمتر بنووسە.

❖ زۆر بوونی چێشت کەران، چێشتەکە خراب دەکەن.

❖ زیاد بوونی پارە، لاوەکان تێکدەدا.

## - ژ -

- ❖ ژیرەکان لە هەڵەی کەسانی ترەوە فێر دەبن، بەڵام نەزان لە هەڵەی خۆیەوە.
- ❖ ژیرەکان بڕیاریان دەگۆڕن، بەڵام نەزان بڕای ببڕ.
- ❖ ژن،خانووی هەیە، بەڵام کلیلەکەی لە گیرفانی کارەکەرەکەیدایە.
- ❖ ژیرەکان، کەم قسە دەکەن.
- ❖ ژیان لە ئاوێکی لیڵەوە دێت.
- ❖ ژیانێکی باش، لۆچی دەم و چاو ناهێڵێ.
- ❖ ژنێکی باش و تەندروستی باش، بۆ پیاو باشترین سامانە.
- ❖ ژن، هەڵبژێرە بە گوێ نەك بە چاو.

## - ی -

❖ یەکێ ناو دەردەکات و یەکێکی تر ئیشەکەی کردووە.

❖ یەکسانی لە موعامەلەدا، برادەریێتی درێژ دەکاتەوە.

❖ یا دەبێ لە منداڵەکەت بدەی، یا سەر زەنشتی مەکە.

❖ یەك ووشە بۆ ژیر بەسە.

❖ یەکێك هەڵە دەکا، یەکێکی کە سەر زەنشتی دەکرێ.

❖ یەك شاهێد بە چاوی خۆی کێشەکەی بینیوە، لە دەس باشترە کە دەڵێن بیستومانە.

❖ یەکێ تر ماڵ دەسوتێنێ، یەکێ تر سەر زەنشتی دەکرێ.

## - ك -

❖ کاتێ بەساڵا چووەکان ئیش دەکەن،پێویستە لاوەکان فێر بن.

❖ کاتێ گیا سەوز دەبێت، ماینەکەت تۆپیوە.

❖ کاتێ بە قسەی سەرکردەکەت دەکەی، ئەوانەی خوار خۆت فێر دەکەی بە قسەت بکەن.

❖ کاتێ شەو زوو تاریك بوو، بەیانی نزیکە.

❖ کاتێ بیر (البئر) ووشك دەکات،ئەو کاتە نرخی ئاو بزانە.

❖ کاتێ کەس چاودێری نەکات، لە خۆت بترسە.

❖ کاتێ حەسانەوە بەکار بێنە، بۆ ئەوەی کاتت بە فیڕۆ نەڕوات.

❖ کەمجار دوو کەس ڕێکدەکەون، ئەگەر هەر دووك هەمان شت بفرۆشن، هەروا چیرۆك نووسی خۆش ناوێ.

❖ کات هەموو شتێك ڕاو دەکات.

❖ کۆشکی لە هەوادا دروست دەکات.

❖ کتلی، بە قازان دەڵێ تۆ ڕەشی.

❖ کۆکردنەوە نە بریندار دەکاو نە عەیب و عارە.

❖ کەل و پەلی دانسقە، زیاتر تەکلیف دەکا لە هی باش.

❖ کەم بژمێرە و زۆر ئیش بکە.

❖ کاکیلەکەت هەڵکێشی، باشترە لە ئێشێکی هەمیشەیی.

❖ کۆکردنەوە باشترە، لە دەست بڵاوی.

❖ کتێبی باش،برادەرێکی بە وەفایە.

❖ کرێکاری چاك،لە گەڵ ئامێرەکاندا، دوژمنایەتی ناکات.

- كەم كەم وەرگرە و كەمێك بەجێ بهێڵە.
- كچ،هیچی ناوێ غەیری مێرد نەبێ،كە شوی كرد هەموو شتێكی دەوێ.
- كانوونی دووەم هەڵە دەكاو، مانگی ئادار عەیب و عارەكەی هەڵدەگرێت.
- كێڵگەكان، چاویان هەیەو گەشت و گوزاریش گوێی هەیە.
- كەم كەس هەیە بتوانێ هاورێتی ڕاستی تا سەر بكا.

## - گ -

❖ گەنمی خەڵكی بە قزناخی خۆت دەپێوی.

❖ گەورەترین دوژمنمان لە نێوان خۆماندا دەشارینەوە.

❖ گەورەیی لە زماندا نیە،بەلاَم لە دلّدا جێی خۆی دەكاتەوە.

❖ گەورەیی، مروارییەكی بەنرخە.

❖ گەورەترین رق هەڵسان، لە گەورەترین خۆشەویستیەوە دێت.

❖ گویَ، بە بەیانی مەدە.

❖ گەورەترین دار سیس دەبێت و پاشان دەمریَ.

❖ گاڵتە كردن دوژمن ناكاتە دۆست، بەلاَم زۆر جار برادەری لە دەست دەدات.

❖ گاڵتە پێكردنێكی ناشرین، ئەوە گاڵتە نیە.

❖ گویَ لە یەك كەس مەگرە، بۆ ئەوەی حوكم بەسەر دوو كەسدا بدەیت.

❖ گوریسی درۆ، كورتە.

❖ گوێم لە چەقچەقەی ئاشەو بەلاَم ئارد نابینم.

## - ل -

❖ لێم دەپرسی و لێت دەپرسم، بەم جۆرە کات بەسەر دەچێت.

❖ لەو شوێنەی خۆشەویستی نەبێ هەموو هەڵەکان دەبینرێ.

❖ لە کوێ زیرەکی هەبێ زانست دەبێت.

❖ لە کوێ ژیان هەبوو لەوێ هیوا هەیە.

❖ لە دایك دەبین دەگرین، دەژین و ئێمە بێزارین و ناڕەزاین.

❖ لە شەڕ ترسان لەوە زیاترە کە شەڕ دەست پێبکا.

❖ لە کاتی لاوێتیدا کۆ بکەرەوە، لە پیریدا خەرجی بکە.

❖ لە گۆڕ (قەبر)دا، هەموو کەس وەك یەك وایە.

❖ لێگەڕێ با دز، دز بگرێت.

❖ لە هەموو کەسێك ببورە، تەنها لە خۆت نەبێ.

❖ لە روودا بەرخە، لە ناخیشا وەکو گورگە.

❖ لە گەڵ هەموو خەڵکدا ڕاست بە، بەڵام باوەڕ بە هەموویان مەکە.

❖ لە پاش نان خواردنی نیوەڕۆ کەمێ حەسانەوە، لە پاش نان خواردنی ئێوارە میلێك ڕێ بکە.

❖ لە پاش تەنگانە خۆشییە.

❖ لە پاش زریان، باران دەبارێ، لە پاش هەور هەتاو دەردەچێ.

❖ لە یەکێك بدە، بۆ ئەوەی یەکێکی تر لێت بترسێ.

❖ لە سەگی بێدنگ و ئاوی مەنگ بترسە.

❖ لە کاتی روو بە روودا، ڕاستی دەردەکەوێ.

❖ لە سەر خۆبە کە پەیمان دەدەی، بەڵام بە پەلە جێ بەجێی بکە.

❖ لە نرخدا فێڵم لێبکە، بەڵام لە قوماشدا فێڵم لێمەکە.

❖ لە یەك کاتدا، یەك ئیش بکە.

❖ لە سەر هەموو کەس پێویستە بەرماڵەکەی بماڵێ.

❖ لە هاواری زۆر، زۆرت بۆ نایەت، تەنها کەمدێت.

❖ لە ئاوی لێخندا، ڕاو مەکە.

❖ لە یاسا ترسان، سەلامەتیمان بۆ دێنێ.

❖ لە گەڵ بەرخدا بۆ نووستن برۆ، بەیانان لە گەڵ چۆلەکەدا هەڵسە.

❖ لە پاشە ڕۆژدا ئیشەکان، باش دەبێ.

❖ لە سەر پیاو پێویستە مکوڕ بێت،لە سەر ئەو ئیشانەی کە هەر پێویستە بیکات.

❖ لە کاتی دەوڵەمەندی و دەس ڕۆییدا، برادەر زۆر دەبێ،لە کاتی تەنگانەدا لە نێوان سەد کەسدا یەکێك نادۆزیتەوە.

❖ لە شەڕ دووربکەوەوە، نە شاهید بە نە شەریك.

❖ لە شەقامە گشتیەکاندا برۆ، لە مەترسیدا نابیت.

❖ لە ڕابوردو گەڕێ، ئەوەی بەسەر چو، مرد.

## - م -

- مرۆڤـ، ئەو كاتە فێر دەبێ، كە ئازاری پێبگا.
- میوانێكی بانگ كراو، كە دەڕوا زیاتر بەخێرهاتنی دەكەین.
- مانگەشەو گوێ بە وەڕینی سەگ نادات.
- مریشك كە ئاو دەخواتەوە تەماشای خودا دەكات.
- مندالّی سوتاو، لە ئاگر دەترسێ.
- مرۆڤـ، خۆی بێت و ئامادە بێت، باشترە لە نامە نووسین.
- مالّێكی چۆلّ باشترە، لە كرێچیەكی خراپ.
- مالّەكەت مەسوتێنە، بۆ ئەوەی مشكەكان بترسێنی.
- مالّێك هەتاو بێتە ناوی، پزیشك نایەتە ناوی.
- میوانی بانگ كراو، لە كاتی نان خواردندا ئامادە دەبێ.
- مێردێكی باش بە، پارە دەبێ بۆ خەرج كردن.
- مرۆڤـ،بە برادەرەكانی دەناسرێت.
- موعامەلە لە خەلّكدا بكە وەكو ئەوەی دەتەوێ موعامەلەت لە گەلّدا بكەن.
- مردن، گالّتە بە پزیشك دەكات.
- مەپرسە چی لە مەنجەلّی خەلّكدایە.
- مندالّ و شێت، ژیانێكی بەختیاریان هەیە.
- مندالّ، سامانی هەژارانە.
- مندالاّن و شێتەكان، ڕاست دەلّێن.
- مشكێك كراسێك كون دەكا، هەموو مشكەكان دەكەونە زەحمەتەوە.
- مەڕی گول، هەموو مەڕەكان توش دەكا.
- مویەك لێرەو مویەك لەوێ، ریشی لێ دروست دەبێ.

❖ مەژێ بۆ خواردن، بەڵكو بخۆ بۆ ئەوەی بژی.

❖ ماسیو میوان، دووای سێ رۆژ بۆنیان دەردەچێ.

❖ میوەی قەدەغەكراو، شیرینە، خۆش تر شت بۆ مرۆڤ ئەوەیە كە قەدەغە لێكراوە.

❖ماڵی حەرام، تا سەر نامێنێ.

❖ ماینی باش، هەرگیز ناكەوێ.

❖ مریشكەكان لێرەوە گارەگاریانەو لەوێ هێلكە دەكەن.

## - ن -

❖ ناتوانی دیوارێك، بە یەك بەرد دروست بکەیت.

❖ ناتوانی لە یەککاتدا فیکە لێدەیت و ئاو بخۆیتەوە.

❖ نابێ تەندروستیت، ماندو بکەیت.

❖ ناتوانی حوکم بەسەر مرۆڤێکدا بدەیت ئەگەر لە هەوەڵەوە تا دووایی سەر گوزشتەکەی گوێت لێ نەبێ.

❖ نەسرەوتن، تا سەرکەوتن.

❖ نەخۆشی، پێمان دەڵێ ئێمە کێن.

❖ نەبوونی، ئیش دروست دەکات.

❖ نەزانی، خراپەیەکی هەڵبژاردەیە.

❖ ناو دەرکردنێکی باش، باشترە لە دەم چاوێکی جوان.

❖ نەزان باشترە، لە زانستی نا زانست.

❖ ناوی باش، لە زێڕ باشترە.

❖ ناودارێتی، ئاوێنەیەکی گەورەیە.

❖ ناخۆشی، سەنگی محەکی ئازاکانە.

❖ نیوەی ژیان دەڕوا، بەبێ ئەوەی بزانین چیە.

❖ نە بە چاکە نە بە خراپە، باسی خۆت مەکە، ئەگەر بە چاکە باست کرد باوەڕت پێناکەن، ئەگەر بە خراپە باست کرد، ئەوەی باست کردووە هەندێکیش بەسەری دەخەن.

## - س -

❖ سەبر كردن گوڵێكە، لە باخچەی هەموو كەسێكدا ناڕوێت.

❖ سەبر كردن، باشترین چارەیە.

❖ سەبرێكی كەم، دە ساڵ ئارامیت پێ دەبەخشێ.

❖ سوار دەتوانێ ئەسپەكەی بۆ سەر ئاو بەرێ، بەڵام ناتوانێ ناچاری بكات بۆ ئاو خواردنەوە.

❖ سكی برسی گوێی نیە.

❖ سەگی زیندو، لە شێرێكی تۆپی باشترە.

❖ سامان خزمەكارێكی باشە، بەڵام گەورەیەكی بۆگەنە.

❖ سروشت رێگەی خۆی دەگرێو پشیلە دووای مشك دەكەوێ.

❖ سامانێكی زۆر سوودی چیە؟ ئەگەر خەمو خەفەت بێت.

❖ سركەی بەبێ بەرامبەر، شیرینترە لە هەنگوین.

❖ سامانێك ئەگەر بەكارنەیەت، وەكو ئەوە وایە نەبێت.

❖ سەرت بگرەو بیدە بە دیواردا.

❖ سامان، هی ئەو كەسە نیە كە هەیەتی، بەڵكو هی ئەو كەسەیە كە دەزانێ چۆنی دەخوات.

❖ سفڵەو مار بران.

❖ سەری تەمەڵ كارگەی شەیتانە.

❖ ساڵی رابوردو، هەمیشە لە ئەمساڵ باشترە.

## - ش -

❖ شاخ، ژان گرتی، مشکێکی بو.

❖ شەو، عەبایەکە، بۆ گوناه باران.

❖ شتە بە نرخەکان، هی ئەو کەسەیە کە ڕێزی لێدەگرێت.

❖ شت زانین، هێزە.

❖ شووشەو کچان، زوو دەشکێن.

## - ق -

❖ قسەکانی بە تەمەن، بە ترازووی زێڕ دەکێشرێ.

❖ قەرزێکی کەم، دەکاتە قەرزار، بەڵام قەرزاری زۆر دوژمنت دەکات.

❖ قسە کردن، زیاتر فێرت دەکا لە ڕامان.

❖ قەرزاری، شەڕی هەژارییە.

❖ قسە ئەگەر زیو بێت، بێدەنگی زێڕە.

❖ قەناعەت، جەژن و خۆشییە، زۆریش گوڵەو لە خۆبایی بوونە.

❖ قسەی خۆش، ڕۆژو شەو کورت دەکاتەوە.

❖ قسە بۆ ژنان، ئیش بۆ پیاوان.

❖ قسەی کەم و ئیشێکی زۆر.

## - ر -

- ❖ راڤە، دایكی زانستە.
- ❖ رابوردو لەبیر دەچیّ.
- ❖ ریّزگرتن و بە زمان هیچ ناكەویّ لەسەرمان، بەلاّم شتی گەورەمان بوّ جیّ بەجیّ دەكا.
- ❖ روّژی لەدایك بوونت، لەبەركە.
- ❖ راست كیّشانەكەو، گران بفروّشە.
- ❖ ریّگەی راست، ریّگەی ئاشتیە.
- ❖ رزگار بوون، لە راستیدایە.
- ❖ روّما، بە یەك روّژ دروست نەكراوە.
- ❖ راستی، كچی زەمانە.

## - ت -

❖ تەنها پیاوی ژیر، دەتوانیّ لە کاتی دەست بەتاڵی سوود وەرگریّ.

❖ تۆ بە ددانی خۆت، گۆڕت هەڵدەکەنی.

❖ تۆ بە دەستی خۆت، ئاگرت هەڵگرتووە بەو دەستەکەت ئاو.

❖ تاوان لەبیر کردن، باشترە لە تۆڵە سەندنەوە.

❖ تەمەڵی گوناهێکە، لێبوردنی نیە.

❖ تەماشا بکەو گویّ بگرەو بێدەنگ بە، لە ئارامیو ئاسایشدا دەژی.

❖ تۆ نازانی، خێر لە کوێوە دێت.

❖ تەندروستی باشم بدەریّ، هەموو سامانم بەرە.

❖ تەمەڵی، کلیلی، هەژاریە.

❖ تەمەڵی، هۆی هەموو شەڕێکە.

❖ تەمەڵ لەسەرخۆ دەڕوات، تاکو هەژاری پیّ دەگات.

❖ تەندروستییەکی باش، لە سامان باشترە.

## - خ -

- خوری بدەی باشترە، لە پێدانی بەرخێك.
- خزمەکار دەناسرێ، کاتێ گەورەکەی لە ماڵ نەبێ.
- خۆری شوبات، قازانجی زۆرە.
- خوو رەوشت لە منداڵیدا، ئاساییە لە گەورەیدا.
- خۆت هەڵواسەو بەرز مەبەرەوە، نەوەك لەو بەرزییەوە بکەویتە خوارەوە.
- خوا حافیزی، ئاسانە.
- خوێن، بە ئاو نابێ.
- خەفەتە تازەکان، خەفەتە کۆنەکان وەبیر دەهێننەوە.
- خەڵك چۆن تاوانبار دەکەی، ئاوها تاوانبارت دەکەن.
- خوێو نانمان پێکەوە خوارد.
- خراپترین تایەی ئۆتۆمبیل ئەوەیە، کە تەقە تەقی زۆر دەکات.
- خزمەکاری پادشا، پادشایە.
- خۆر، لەوە گەورەترە کە دەیبینی.
- خاوەنی وورگ زل، بارووودی نەدۆزیوەتەوە.
- خواردنی پێنج کەس، بۆ دە کەس بەسە.
- خۆشییەکی کەم، پەشیمانیەکی گەورەی بە دوواوەیە.
- خەفەت بەبێ ئەوەی بانگی بکەیت، دێت.
- خەفەتو خۆشی بە دووای یەکدا دێن.
- خەوێکی هێمن، بە کەشو هەوای خراپ هەست ناکات.
- خۆشەویستیو کۆکەو ئازار، ناشاردرێتەوە.

❖ خۆشەویستی، هەڵە نابینێ.

❖ خۆشەویستی کوێرە.

❖ خۆت بناسە.

❖ خوێندەواریو زانست، لە خۆشیو ئارامیداو لە کاتی توندو تیژیدا خەندەقێکەو لە پیریشدا زەخیرەیە.

❖ خەرج کردن، پیاوەتی نیە.

❖ خۆشیو ناخۆشی، جمکەن.

# بەشی حەوتەم

## پێشەکی

خوێنەری ئازیز و خۆشەویست:

دروست بوونی ئەم کتێبە، لەبەر کز بوونی چاوەکانم، بە تایبەتی یەکێکیان، دووجار بۆ تورکیا و دووجار بۆ ئێران ڕۆیشتم بێهودە بوو. چاوەکەی ترم ئەویش کز بوو، نەك هەر کز بوون، بەڵکو بە جارێ تاریك بوون، بۆ بەغا بۆ سلێمانی بۆ هەولێر بۆ موسڵ ڕۆیشتم چارەی نەبوو، لێرە لە کەرکوك چوومە لای دکتۆر (نورالدین ابراهیم الصالحي)، پاش تەماشا کردن و گرتنی تیشکی چاو لە ئەنجامدا وتی:

(عیلاجت لە ئەردەنە، لە لای دکتۆر محمد صالح لە تیمارخانەی، (مستشفی التخصصی للعیون) بە هەرحاڵ خۆم و ئامانجی کوڕم لە سلێمانیەوە بە فڕۆکە بۆ (عمان)ی پایتەختی ئەردەن ڕۆیشتین، بۆ سبەی بۆ تیمارخانە ڕۆیشتم بۆ لای دکتۆرەکە دەرکەوت، کە خۆی خاوەنی نەخۆشخانەکەیە و خەڵکی عێراقە، پاش پرسیار و وەڵامێکی زۆر وتی:

(ئەو چاوەی کە تازە خوێن هاتۆتە ناو ئاوی چاوت دەرزی لێ دەدەین و چاوەکەی کەت سپیەکەی هەڵدەگرین جا نازانم تۆ چیی دەڵێی؟

– دکتۆر من لە عێراقەوە بۆ لای تۆ هاتووم، ئێوە چی ئەمر دەکەی من ئامادەم بۆی.

ئەمجا ناردمی بۆ لای دکتۆر (نضال)، کە پسپۆڕە لە بواری تۆڕ(الشبکیە)ی چاودا، ئەویش لە پاش پرسیار و وەڵامێکی زۆر دا وتی:

– بیبەن بۆ سەرەوە بۆ لای دکتۆر (....) ڕیشێکی سەکسووکەی هەبوو، دیار بوو هەر سێ دکتۆرەکان یەك ڕایان هەبوو، چاوێکیان دەرزی لێبدەن و ئەوی تریان لابردنی ئاوە سپیەکەی و ئەو خوێنەی کە لەناو ئاوی چاومدا ڕەق بووە و دوور نیە کاریگەر و بێتە سەر تۆڕی چاوم.

لەبەر ئەوە دووجار بۆ (عمان) ڕۆیشتم، پارەیە زۆرم سەرف کرد، بۆ ئەو دوو نەشتەرگەرییە، هێشتاکە دوو نەشتەرگەری تری دەوێ، بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە کەس یارمەتی منی نەداوە، تەنها خێزانەکەم و هەردوو کوڕەکەم نەبێ.

ئا لەم نووسینەوەدا نامەوێ پروپاگەندە (ریکلام) بۆ پزیشکەکانی ئەردەن بکەم، بەڵام ئەمە ڕاستییەکە دەبێ بووترێ. پاش لێدانی دەرزییەکە بە ماوەی دوو کاتژمێر و نیو چاوە تازە کز بووەکەم کرایەوە.

لە شەقامێکدا لە نزیك (العبدلی) کتێبخانەیەکی زۆرم بینی و چەند کتێبێکم کڕی لە ناویاندا.

١– کتێبی – موسوعة **الامثال** العالمیة. ئامادەکردنی مستەفا فەتحی.

٢– کتێبی – أروع ما قیل **للامثال** – ئامادەکردنی ئەمیل ناسیف.

ئەم کتێبە، (وتەکانی ژیان بەشی حەوتەم) بەرهەمی ئەو سەفەرەیە، کە چاوێکم باش بووە، دوور نیە چەند وتەیەکیان لەگەڵ بیر و باوەڕی مندا نەگونجێ و نووسیومە، بۆیە داوای لێبوردن دەکەم.

هەروا زۆر زۆر سوپاسی ئستافی ڕۆژنامەی (نەوشار) و (باسەڕە) و برای ئازیز کاك وشیار ئەحمەد ئەسوەد دەکەم، کە بۆ ئەو نووسینەکە لەسەر منی نووسی بوو، لە ڕۆژنامەی (باسەڕە)دا و گەورەیی خۆی وەدەرخست، بەرانبەر بەندە و سوپاسم بۆ برای ئازیز شوان جمعە نەجارِ بۆ ئەو ماندوبووەی لە ئەردەن لەگەڵمدا، هیوادارم وێنەی زۆر بێ لەگەڵ ئەوپەڕی سوپاسم بۆ هەمووان و خوێنەرانیش.

محمد عبدالرحمن زەنگنە

کەرکوك

١/ ٣/ ٢٠٠٨

# لە وتەکانی (ئەسپانیا)

* ئەوەی یەکجار دزی بکات، لە دزی بەردەوام دەبێ.
* ئەوەی مرۆڤ فرێی دەداتە ئاگر، لە خۆڵەمێشەکەیدا دەیدۆزێتەوە.
* ئەوەی چاوی لەسەردا بێت، مادامەکی زیندووە فێردەبێ.
* ئەوەی بە کەم ڕازی نەبوو، شایەستەی زیادە نییە.
* زۆرجار بێدەنگی بەهێزترە لە وەڵام دانەوە.
* پەنجەی بریندارت بە هەموو کەس پیشان مەدە، با هەرکەس بە گوێرەی خۆی نەڕوانێتە لێی.
* ماڵ لەسەر ئەرز دروست ناکرێت، بەڵکو لەسەر ژن دروست دەکرێت.
* زمان درێژیی بەڵگەی دەست کورتییە.
* هیچ کەسێ ناچێ بۆ نووستن، ئەگەر شتێکی تازە فێر نەبووبێت.
* خەو بینین باڵ بەبێ ئەقڵەکان دەدات.
* یەك پەڵە هەموو کراسەکە پیس دەکا.
* پەڵە بەسەر چاکترین پۆشاك دەکەوێت.
* ماڵەکەم بچکۆلەیە، بەڵام موڵکی خۆمە.
* هەتاو بۆ هەموو کەس دەردەچێ.
* خۆت بناسێنە، ئەگەر دەتەوێ بتناسن.
* بێدەنگی ڕۆحی مرۆڤە.
* میوەی گەییو، بەسەر ئەرز دەکەوێت.
* لەو جێگەیە مەمێنە، کاتێك (گا) و (شێت) بەربەرەکانێت دەکەن.
* جاشکی بچووك، هەموو کەس سواری دەبێ.
* لەو شوێنەی هەتاو دەردەچێ، پێویستیان بە پزیشك نییە.
* کورگ مووەکەی دەگۆڕدرێت، بەڵام ئەوەی لە ناخیدایە ناگۆڕدرێت.

* زمان مرۆڤ چاك دەكات، نەك هەتەر.

* مندالْ موویەکە لە باوکیان.

* هیچ بەردێك لە خۆیەوە ناکەویْ.

* مرۆڤ، لە شەوقی مۆمێکی داگیرساو زیاتر نابینیْ.

* کێو پێویست نیە بە بینینی یەکتری، بەلاَم مرۆڤ پێویستی بە یەکتری بینین هەیە.

* مرۆڤ پێویستی بەوە نیە دەمی بە گەورەیی بکاتەوە، کاتیْ درۆ دەکا.

* ئەوەی لە بیئاباندا وتار بێژیْ، وتارەکەی ون دەبیْ.

* ئەوەی بۆ پێشەوە نەڕوانێت، هەمیشە دوا دەکەوێت.

* ئەوەی یەك ئەشکەنجە بدات، هەڕەشە لە سەد کەسی کە دەکات.

* ئەوەی لە کارکردن ڕابکات، لە حەسانەوە ڕادەکات.

* ئەوەی جوجەڵەی هەبێت، لەگەڵ ڕێویدا شەڕ ناکات.

* ئەوەی تێر نەخوات تەنها خواردن نەبیْ، لێسانەوە سوودی نییە.

* دەتوانین بەبیْ برادەر بژین، بەلاَم بەبیْ هاوسیْ ناتوانین بژین.

* کاتیْ خەڵکی پێتی وت کەرە، کاتی ئەوە هاتووە بزەڕی.

* زانست وەرگرە و بیدە بۆ ئەوەی فێرببیت.

* کاتیْ شەڕ دەستی پێکرد، شەیتان دۆزەخ گەورەتر دەکات.

* گەورە هەڵەی کەمە، بەلاَم حیسابی لەسەر دەکریْ.

* مرۆڤ بەرامبەر هەڵەکانی خەڵکی، چاوی تیژە.

* لە دنیادا عەدالەت هەیە، بەلاَم بە بیرەوەری غەیری ئێمە.

* هەل، لێرەو لەویْ سووڕ دەخوا، ئەوەی بیگریْ بەختیار دەبیْ.

* ئەوەی زۆر ببینیْ، بەقەد چاوێکی بەسە.

* ئەوەی لە گیان تەڕکردن بترسیْ، نابیْ ماسی بگریْ

* لە ناو عارەبانەدا ناتوانی بۆ ئاسمان سەربکەوی.
* ئەوەی شەرەفی ون کرد، لە پیاوی مردوو خراپترە.
* مرۆڤ هیچ لەگەڵ خۆیدا نابات، تەنها پیشە باشەکانیان نەبێ.
* ئەوەی عاباکەی سووتا، بە باشی هەست بە ئاگر دەکا..
* پێوستە ئیشی ئاسان بە گران وەرگرین و ئیشی گرانیش بە ئاسان وەرگرین.
* چاڵ و چۆڵ، گۆڕستانی خۆشەویستە.
* بەخت بادەم بۆ بێ دانەکان دەنێرێ.
* بە تۆپینی گورگ، شایی ڕێوییە.
* کۆلیتەکەت نزیك کۆشکێك دروست مەکە.
* کەر، هێستر بە گوێ درێژ ناو دەبا.
* قەلەڕەش بەخێو بکە چاوت دەردێنێ.
* ڕۆژی هەژار درێژە.
* پەنجە مەخەرە نێوان دوو براوە.
* ئەو کەسەی خۆی بە هەنگوین کرد، مێش دەیلێسێتەوە.
* ژن و هێستر لە دوای دەس بازی، خۆیان بەدەستەوە دەدەن.
* ئەو کەسەی ژنێکی هەیە، دوژمنێکی هەیە.
* ئەوەی داری بەدەستەوە بوو، سەگ نایگەرێ.

# لە وتەکانی (ئوسترالیا)

* ئەو شتانەی ڕوویدا، هیچ چارە نەبوو دەبوایە ڕووی بدایە.
* پێش ئەوەی لۆمەی خەڵکی بکەی، هەڵەکانی خۆت بزانە.
* ئەگەر ناتوانی قەپاڵ بگری، دانەکانت ڕیچ مەکەرەوە.
* ئەگەر مرۆڤێك جارێ خەڵەتاندمی، ئەمە عەیب و عارە بۆی، بەڵام ئەگەر دوو جار خەڵەتاندمی عەیب و عار بۆ خۆم.
* هیوایەکی دواکەوتوو، دڵ دەگوشێ.
* ئەوەی کوڵ لە خەڵکی دەگرێ، قسەی باش لە خەڵکی نابیستێ.
* قاپی بەتاڵ، زیاتر دەنگی دێت.
* پشتم بخورێنە، پەشتت دەخورێنم.
* ئارەزوو کردن، چاوەڕوانی زۆری دەوێ.
* هاوڕێی باش لە ڕێگادا، ڕێگاکەت کورت دەکاتەوە.
* ئەو شایتانەی کە دەیناسی لەو شەیتانە باشترە کە نایناسی.
* هەموویان قسەیان کرد، کەس نیە گوێیان لێ بگرێ.
* ئەو باڵندەیەی کە زوو هەڵدەستێت، لە پێش هەموویانەوە کرم دەخوات
* پێویستە وورچە راوبکەی، پێش ئەوەی پێستەکەی بفرۆشی.
* چاوی، لە گەدە برسی ترە.
* میوەی حەرام، شیرینە.
* یەك قاچ باشترە، لە دوو دار شەق.
* هەموو کەرێك حەزدەکا گوێ لە زەڕەی بگردرێت.
* نۆر بوونی چێشت لێنەر، خواردنەکە خراپ دەکەن.
* کەورە چۆن بوو، خزمەتکارەکەشی وادەبێ.
* دڵێکی لاواز، ناتوانێ ژنی جوانی دەس کەوێ.

* هەموو دراوێك، دوو رووی هەیە.

* كراسە پیسەكەت لەبەر چاوی خەڵكی مەشۆ.

* خۆت بە مشك مەكە، ئەگینا پشیلە دەتخوات.

* سەركەوتوو، برادەری زۆرە.

* هیچ كەسێك ناتوانیٚ لە یەك كاتدا و لە دوو شوێن بێت.

* دزی كۆن، باشترین حەسحەسە.

* وەسف كردنی باشەكان باشتر دەبن، خراپەكانیش خراپتر دەكا.

* ئەوەی موغامەرە نەكا، سەرناكەویٚ.

* ئەوەی هاورێتی گورگ دەكا، دەبیٚ لورە لور فێر بیٚ.

* ئەوەی بیەویٚ هەموو قسەیەك بكا، گوێی لەو شتە دەبیٚ كە پێی ناخۆشە.

* نیوەی جیهان، نازانیٚ نیوەكەی تریان چۆن دەژین.

* دەتوانی ئەسپەكەت بۆ سەر ئاو بەری، بەڵام ناتوانی زۆری لیٚ بكەی ئاو بخواتەوە.

# لە وتەكانی (ئەڵمانی)

* ئەگەر لە نێوان كویرندا بیت، هەر دوو چاوت بنووقێنە.

* ئەگەر هەل نەقۆزیتەوە، پشتت تێدەكا.

* ئەگەر نەتوانی سەر شاخ بكەویت، لە شیوێكدا مەمێنەوە.

* سەركەوتن خوا دەماندات، ئێمەش پێویستە هەردوو دەستمان بەرزكەینەوە.

* دەبێ زۆر سەبرت هەبی، یاخود زوو بمرە.

* برسێتی، زۆر فرت و فێڵی دەبێ.

* زانست و ژیری، كانزایەكە پارێزراوە.

* نانی خوراو ، زوو لە بیر دەكرێ.

* باش وایە دوو جار پرسیار بكەیت، نەك جارێ هەڵە بكەیت.

* باشتر وایە بەرێزێكی بچووك بیت، نەك خزمەتكارێكی گەورە.

* پەلەیی و پەشیمانی، وەك بران.

* شەیتان دە كاتژمێری پێویستە پیاوێك بخەڵتێنێ، بەلاّم ژن یەك كاتژمێری بەسە بۆ ئەوەی دە پیاو بخەڵەتێنێ.

* ئەو چاوەی كە نابینێ، چاویلكە بە كەڵكی نایەت.

* بۆق، لەسەر كورسییەكی زێڕ دانە، یەكسەر بۆ ناو زەلكاو دەگەڕێتەوە.

* چاوی هەڵخەڵەتاو پڕە لە فرمێسك.

* چاوەكان، پەنجەرەیەكە، مرۆڤ دەڕوانێتە دڵەكان.

* لەسەر مرۆڤ پێویستە، بەو بەردە خانوو دروستكا كە هەیەتی.

* هەژاری زەرەری نییە، ئەگەر پێشووتر دەوڵەمەند نەبوو بێت.

* جێگا بەندیخانەی تەمەڵەكانە.

* مانگ، لە گورگ ئەمینە.

* كەمێك ئاو، قازان لە كوڵان بێدەنگ دەكا.

*هەموو خۆشییەك، ناخۆشی لەسەر پشتی هەڵگرتووە.

* زۆر کەس هێلکە قووت دەدەن، پیاوەتی بە تۆکڵەکەیەوە دەکەن.

* کە جەنگ تەواو بوو، پێویست بە ئازایەتی ناکا.

* تەنها راکردن بەس نیە، بەڵکو پێویستە بگەیت.

* هیچ باڵندەیەك، واز لە پەڕ و باڵەکەی ناهێنێ.

* قفڵ و کلیل، بۆ دەستی پاك و ئەمین دروست کراوە.

* ئەو زورانەی کە ئارەزوویان لێیەتی، کەم کەسانێك هەیانە.

* ئەوەی ویستی گەورەی ماڵ بێت، ماڵ ناخوازێ.

* ئەوەی لە (خڕۆکە) بگەڕێ، پێویستە لەسەری بەدوای دەزۆکە (داوەکە) بگەڕێ.

* ئەوەی بۆ لای گورگ بڕوات بۆ نانخواردن، پێویستە سەگەکەی لە گەڵ خۆیدا بێت.

* ئەوەی بە کوێری لە دایك دەبێ، باوڕ ناکا کە ڕووناکی هەیە.

* ئەوەی مۆمی غەیری خۆی کوژاندەوە، لە تاریکیدا دەمێنێتەوە.

* ئەوەی بێ دەسەڵاتی خۆی لە بیر نەکرد، لە هەموو هێزەکان بە هێزترە.

* تۆپییەك، قەلەڕەشەکان بە زۆری لە سەری کۆ دەبنەوە.

* هەموو جۆگەلەکان، کۆتایی بۆ ناو دەریایە.

* هەندێ جار پێویستە بە شێلم بڵێی، هەڵوژە.

* زینی زێڕ، کەر بە ئەسپ ناکات.

* خواردنی کەم، تەمەنت درێژ دەکا.

* ناودارێتی باش، هەموو عەیبێ دادەپۆشێ.

* ئافرەتێك بەبێ پیاو، باخچەیەکە بەبێ شورە.

* ئیشی بەیانیان، زێڕە.

* میر، گوڵێك دەکاتەوە، خزمەتکارەکان دارێك دەبڕن.

* ئەوەی درۆ بنێژێ، درك دەدورێتەوە.
* پشیلە، هەرگیز واز لە گرتنی مشك ناهێنێ.
* سێ شت بە ماڵانەوە بەبێ ئیزن دەچێت، قەرز، پیری، مردن.
* مەڵێ، دوایی دەیدەم، بەڵکو بیدە.
* کوڕ، چرای ماڵی تاریکە.
* ماسییەکی بچووك لەسەر مێز، باشترە لە ماسییەك لە دەریا.
* قاچی درۆ کورتە.
* ئەوەی لەسەر مێزی نانخواردن قسە زۆر بکا، بە برسێتی دەردەچێ.
* ئەوەی دوژمنی نەبێ، برادەریشی نییە.
* قەرز وەرگرتن، لە سواڵ کردن باشترە.
* ئێمە کچمان خۆش دەوێ وەکو هەیە، کوڕەکانیش وەکو ئەوەی دەبن.
* هەر کاتێ مەی بە ژوورەوە چوو، نهێنی دەردەچێ.
* بیر، کە منداڵێکی تێکەوت، پاشان سەری بیرەکە دادەپۆشن.
* هیچ کەس تف لە ڕیشی خۆی ناکات.
* ئەوەی کە پیاز بنێژێ، بۆنی ناکا.
* ترسنۆك، لە کاتی ترس دا بیر لە هەر دوو قاچی دەکاتەوە.
* گەنج، بەبێ مەی زەوقی هەیە، پیریش سەرخۆشە بەبێ مەی.
* کاتێ هەژاریی لە دەرگا دەدات، خۆشەویستی لە پەنجەرەوە رادەکا.

# لە وتەکانی (ئەمەریکی)

* ئەگەر ویستت مرۆڤێك تاقی بکەیتەوە، دەسەڵاتی بە دەس بدە.

* ئەگەر ویستت ئەو شتە زۆر باش بێ، خۆت دروستی بکە.

* تەماشای دایکە بکە. پێش ئەوەی داوای کچەکەی بکەی.

* چی ئەحمەقێ دەتوانێ پارە کۆ بکاتەوە، بەڵام ژیر دەتوانێ ئاگاداری بێت.

* بە قەرز بکڕە، بە نەقد بفرۆشە.

* ئێمە راستیەکان ون دەکەین، لەو کاتەدا بە دوای هی کەدا دەگەڕێین.

* مریشکی گەڕۆك، بە دەسکەوتێکی زەرەرەوە دەگەڕێتەوە.

* جیهان هەمووی ئامێرێکی وێنەگرە، پیاوەتی بکە و ڕووخۆش بە.

* میوان، رۆژوو نازانێ.

* منداڵی مودەلەل، ناوی زۆرە.

* هەڵەکەر، دەدۆزرێتەوە.

* چۆن ئاگر دووکەڵی هەیە، گومان لێکراویش قسە بەدوواوەی دەکرێ.

* چەندە لە ترۆپکە نزیك دەبیتەوە، لە کۆتایی نزیك بوویتەتەوە.

* تەمەڵ، فێری شەڕت دەکا.

* شوێن پێی، بە دواوە نادۆزێتەوە.

* قازانەکەت چەند دەگرێت، ئەوەندە بکوڵێنە.

* گاڵتە بەوانە مەکە کە کراسەکانیان دڕاوە، ڕۆژێ لە ڕۆژان قۆندرەکەت دەدڕێ.

* هیچ کاتێ دوژمن بچکۆلانە نیە.

* ئەگەر سەد کەس بە ژیرێکیان وت: شێتە، شێت دەبێت.

* ئەوەی لە ئەوەڵەوە هێزی نەبێ، بە درێژایی تەمەنی هێزی نابێ.

* ئەوەی تامی تاڵی نەزانێ، تامی شیرینیش نازانێ.

* ئەوەی چیی بوێ و حەزی لێ بێ، ئەوەی ئارەزووی لێ نیە گوێی لێدەبێ.

* کە سەبەتەکەت لە هەنجیر پڕ بوو، هەموو کەسێ هەوڵ دەدات لێت نزیك بێتەوە.
* ئەوەی لەسەر جێیەکی زیو خەوت، خەو بە زێڕشەوە دەبینێ.
* ئەوەی بە پەلە بڕوا بکات، بە پەلە دەخەڵەتێ.
* ئەوەی بەبێ منال بژی، خەفەتی نابێ، ئەوەشی بە منداڵی مرد خۆشی نەزانیوە.
* ژنان شمشێرەکانیان بە دەمیان هەلگرتووە.
* خەو، گەورەترین دزە، چونکە ژیان دەدزێ.
* گوڵ سیس دەبێت، بەڵام دڕکی هەیە.
* لە پێناو هێلکەیەك شەڕ دەکەن، مریشکەکە بەجێ دەهێڵن تاکو دەفڕێ.
* شووشە ئەو بۆنەی تێدا دەمێنێ کە یەکەمجار پڕ کراوە.
* هەر کەسێ کلکی مار ماسی گرت لە ئاودا، مەرج نییە مار ماسیەکە بگرێ.
* بەبێ بزە گوناهە.
* میوەی دزراو هەمیشە خۆشترە.
* دڵی دایك، قوتابخانەی منداڵە.
* ئیش کردن کورتترین وەڵامە.
* هیچ شتێك لە هەنگوین شیرینتر نیە، تەنها پارە نەبێ.
* چاکترین چاکە ئەوەیە، یاسا بەسەر هەمووداوەکو یەك بێت.
* لە بیرت بێ کات وەکو سامانە.
* دەتوانی ڕای باش پێشکەش بکەیت، بەڵام ناتوانی ئاکاری باش پێشکەش بکەیت.
* ئەوەی دەرگاکەی لەسەر پشتە و عەبوسە، هەڵەیە.
* ڕەزیل، هەمیشە ئامادەیە، ئەگەر بەشی هەبێ لە هەتاودا بیفرۆشێ.
* ژیان بەبێ ئاکار، هیچە.
* ئاکامی ئیشەکانت، لە قسە گەورەترە.

* ئەگەر بەرەو پێشەوە نەڕۆی دووا دەکەوی.

* ئەگەر ویستت قیمەتی پارە بزانی، کەمێ پارە قەرز بکە.

* ئەو ئیشەی ئەمڕۆ پێت دەکرێ، مەیخە سبەی.

* کەر، وای دەزانی زانا و رۆشنبیرە، لە بەر ئەوەی کتێبیان لێ بار کرد بوو.

* ئەگەر بەڵگە ببوایە بە زیرەکی، بزن فەیلەسوف دەبوو.

* ئافرەت جوانە، ئەگەر کەوتە نێوان باوەشەوە نەك نێوان دەستەوە.

* ئەو کەسەی توڕە بێت، سواری ئەسپێکی کێوی سەرکێشە.

* خەفەت تەنها بۆ خۆت، بەشداری خۆشی خەڵك بکە.

# لە وتەکانی (ئینگلیز)

* خوا دوو دەستی داوە پێمان، چاوەڕوانیەتی پردی پێدروست بکەین.

* ناخۆشترین کاتژمێر، پێش کازیوەیە.

* چوار چاو باشتر دەبینیّ لە دوو چاو.

* گیای زەرەرمەند، بە پەلە دەڕویّ.

* پێکەنە، جیهان لە گەڵتا پێدەکەنیّ، بگری تەنها خۆت دەگریت.

* ڕووداوە کۆنەکان، بە ڕووداوی کۆن بزانە.

* ئەوەی زۆر پێدەکەنیّ، ئەو کەسەیە کە لە دواییدا پێدەکەنیّ.

* دووری، ئاگر لە دڵ بەردەدا.

* هەواڵی خراپ، بە زوویی بڵاو دەبێتەوە.

* پێش ژن هێنانت چاوت باش بکەرەوە، پاش ژن هێنان چاوت بنوقێنە.

* قەرزی بە پەلە بدرێتەوە، تەمەنی برادەری درێژ دەکاتەوە.

* پیاوی برسی، تووڕەیە.

* ژیر، یەك وشەی بەسە.

* ئەوانەی لە خانووی شووشەدان، پێویستە بەرد لە کەس نەگرن.

* پێویستیی، یاسای نییە.

* ڕێگە بۆ دڵ پیاو، لە گەدەیەوە دەبیّ.

* جیهان هەوڵ دەدەن بۆ زانیاری، بەڵام نەزان وا دەزانیّ تەنها ئەو دۆزیویەتیەوە.

* چۆنت دەویّ خەڵکی هەڵسوکەوتت لەگەڵدا بکەن، ئاوها هەڵسوکەوت لە گەڵ خەڵکدا بکە.

* هەموو ئیشیّ چاکە، ئەگەر بە چاکە کۆتایی بێت.

* ئەو سەگەی زۆر دەوەڕیّ، کەم دەگەزیّ.

* چی دەچێنی ئەوە دەدوریتەوە.

* برادەر، وەکو برادەری ئاو و ڕۆنە، ئاو ژێر دەکەوێ و ڕۆن بۆ سەرەوە.
* سەگ، سەگ ناگەزێ.
* هەموو کەس قازانەکەی بە گوێرەی خۆی دادەنێ.
* قسەی هەنگوینی، خواردن بیناکەیەتی.
* زۆر بوونی دەست، ئیشەکە ئاسان دەکات.
* مرۆڤ ناتوانێ لە کاتێکدا خزمەتی دوو گەورە بکات.
* گریان سوودی نیە بۆ ماست ڕژاو.
* لەوانە کوێرتر نیە کە نایانەوێ بە باشی ببینن.
* هیچ کەس ناتوانێ لە بەرد، ئاو دەربێنێ.
* لە هیچ جێگایەك گوڵ بێ دڕك نییە.
* ئەوەی هەڵە نەکا، واتا هیچ شتێك ناکا.
* ئەوەی ئازاری ئیش کردن نەچێژێ، ئازاری هەژاری دەچێژێ.
* بەڵا کەم جار بە تەنها دێت.
* سوودی جیهانی فراوان چییە، ئەگەر پێڵاوەکەت تەنگ بوو.
* ئەوەی بە ئاسان دەستت بکەوێت، بە ئاسان لەناو دەچێت.
* جل و بەرگ حکوم بە سەر مرۆڤ دا نادات.
* شەیتان ئیش دەداتە ئەوانەی ئیشیان نیە.
* دوور نیە شەیتان کیتابی پیرۆز بخوێنێتەوە بۆ مەرامی خۆی.
* مرۆڤی ترسنۆك، چەند جارێك دەمرێ، پێش مردنی ڕاستی خۆی.
* چەپکە گوڵ بۆ هەموو سەرێك نیە.
* بدەو سەرف بکە خوا رزق دەدا.
* قەناعەت کردن لە دەوڵەمەند باشترە.
* نۆکێك بە ئازادی باشترە لە خواردنێکی زۆر وەکو کۆیلە.

* باڵندە، بە خوێندنەکەی دەناسرێ و پیاویش بە قسەکەی.
* سەگ، ناوەڕێ ئەگەر ئێسکێکی بۆ فڕێ بدەی.
* لە کاتێ تەنگانەدا برادەر دەناسرێ.
* باوك کانزایە، برا خۆشەویستە، برادەر هەر دووکیانە.
* پاش زریان بارانە، لە پاش هەور خۆرە.
* برادەر، لە کاتی تەنگانەدا، دەردەکەوێ.
* لە پاش ناخۆشی خۆشییە.
* هەموو ئەو شتانەی دەیزانی ناوترێ.
* پیاو بە برادەرەکانی دەناسرێ.
* دار بە مێوەکەی دەزانرێ.
* زیرەك، بە یەك ئاماژە تێدەگا.
* بەقەد بەڕەی خۆت، پێت درێژ بکە.
* قسە قەرزەکان ناداتەوە.
* زمانت بگرە، با بەندت نەکا.
* ئەگەر خەتەر نەما، خوا ناناسن.
* لە سێبەری خۆی دەترسێ.
* تەندروستی باشترە لە سامان.
*ماڵی حەرام تا سەر نامێنێ.
* ئەگەر سەر نەکەوتن، جارێکی تر دەستی پێبکەنەوە.
* پەتی درۆ، کورتە.
* خۆشەویست کوێرە.
* گوێم لە چەق چەقەی ئاشە، بەڵام ئارد نابینم.
* هیچ دوکەڵێك، بێ ئاگر نابێ.

* هەموو تازەیەك، خۆشە.
* هیچ شتێك بەبێ ماندوویەتی دەست ناکەوێ.
* مەڕی گول، هەموو مەڕەکان تووش دەکات.
* ئەی پزیشك چارەی خۆت بکە.
* لە روو وەسف کردن، زەم کردنێکی ئاشکرایە.
* ئەوەی بە پەلە  بێت بە پەلەش دەڕوا.
* شاخ ژان گرتی، مشکێکی بوو.
* رزگار بوون لە ڕاستیدایە.
* ژیرەکان کەم قسە دەکەن.
* چۆن ڕەخنە لە خەڵك دەگری، ئاوها ڕەخنەت لێ دەگیرێت.

# لە وتەكانى ( ئەندەنووسيا )

* بزە، كورتترين ڕێگايە بۆ دڵ.
* ئێش و ئازارى خەڵكى لە لات ئاسانە.
* مرۆڤى بێ سامان و پارە، گورگێكە بێ ددان.
* ئەگەر باوەڕت بە ئيشێ كرد، نابێ دوو دڵى و گومانى لێ بكەى.
* ئەگەر گومانت لە شتێك بوو، نابێ بە كارى بێنى.
* گوڵى خەڵكى هەميشە سوورترە.
* پياوى پير ئەگەر كچێكى تەمەن بچووكى خواست، واتە شەيتان دەخوازێ.
* دەمى داخراو، مێشى تێناچێ.
* دەوڵەمەندى ڕەزيل، بۆ دزەكانى بەجێ دێڵێ.
* دەرگاى ماڵەكەت، لە ماڵەكە گەورەتر مەكە.
* باوەڕ بە برادەرە دوو زمانەكە مەكە.
* گومان لەوەدا نييە، درێژترين ڕۆژ كۆتايى هەيە.
* ئەو كەسەى لەبەر شتێ خۆشتى دەويست، ئيشەكەى نەما ڕقى لێت دەبێتەوە.
* ئەو كەسانەى چەند دەستێك ماچ دەكەن، ئاواتيانە ئەو دەسانە ببڕێتەوە.
* مەرج نيە ئەوانەى سەگ پێيان دەوەڕێ دز بن.
* ئەوانەى هەموو شتێك بزانن، هيچيان بە باشى نازانن.

# لە وتەكانى ( ئۆغەندا )

* ئەگەر لەگەڵ منداڵدا نانت خوارد، خواردنت پڕ تۆز دەبێ.
* ئەگەر لە چاو بدەی، پێڵوەكان دەبینێ.
* ئەگەر مار دايپێتەوە، لە چل وچوار پێی مەترسە.
* ئەو تەڵەی مشك دەگرێ، فيل ناگرێ.
* يەك فيل تۆزى زۆر ناكات.
* ئەوەی لە گوێی ئاو دانيشت، گوێ لە هاژەی ئاو ناگرێ.
* يەك دەست، پەتی پێ گرێ نادرێ.
* خوا دەماندات‌ێ، بەڵام نافرۆشێ.
* مردن تاقی بكەرەوە، ئەو كاتە دەزانی كێ بە ڕاستی خۆشی دەوێی.
* تەنانەت ئەگەر خەڵكی خۆشتی نەويست، يەكێك دەدۆزيتەوە كە سەرت بتاشێ.
* ئەگەر فيل لاوازيش بێت، ئەو پاشای دارستانە.
* دەمت پڕ مەكە تا ئەو تيكەی لە دەمتايە قوتی بدەی.
* گران نيە ئەوانەی خەڵك دەيكا، خوا تۆ و ئەويشی خوڵقاندووە.
* خواوەند ئەوەی داپێت، (با) ناتوانێ لێتی بسەنێ.
* ئەو بزمارەی كە لە قەرەوێلەكەتايە، هيچ كەسێ ئازار نادات، تەنها تۆ نەبێ.
* ئەوەی لە دوای (فيل) ەوە بێت، لە ڕێگا لە هيچ شتێك نەترسێ.
* ئەوەی لە قەراخی دەريا بژێت، جێگای ماسی دەزانێ.
* ئەو دارە دەبڕی كە ڕۆژێك لە فيل رزگارتی كردووە.
* ئاژەڵ بەچكە بچكۆلەكەی دەلێسێتەوە ئەگەر ناشرينيش بێت.
* سێمورە بچووكە، بەڵام كۆيلەی فيل نيە.
* بۆقی گەورە خۆی بەوەوە خەريك ناكا كە بزانێ بۆقە بچووكەكان چی دەكەن.
* دەم، هەرگيز لە بيری ناچێ ئەوەی خواردوويەتی.

* منداڵی شیرە خۆرە، قسە لەلای گرنگ نیە دەربارەی ڕۆیشتن.

* بیبەری تون (تفت) هەر چەندە بچووکیش بێت، تامەکەی بەهێزە.

* دەوڵەمەند بە پارەکەی خۆی ڕزگار دەکا، هەژاریش بە زمانی.

* مانگە شەو زۆر جیگا ڕوون دەکاتەوە، بەڵام هەندێ جێگاش بە تاریکی دەهێڵێتەوە.

* نهێنی خۆت بپارێزە، ئیش و کاری خۆت پاراستووە.

# لە وتەكانی (ئێرانی)

* ئەگەر بینیت ماڵی هاوسێكەت دەسووتێ، پەلەكە بۆ كوژاندنەوەی.
* گەورەترین سەركەوتوو ئەو كەسەیە كە بەسەر خۆیدا سەركەوێ.
* باوەڕ، شاخ دەجوڵێنێ.
* ژنێكی بە ژن كورت بخوازە، پۆشاكەكانی لە سەرت كەم دەكەوێ.
* سەری تەمەڵ چێشتخانەی شەیتانە.
* پیاو دەریایە و ژن جۆگەلە.
* ئازایەتی بەبێ وریا بوون، ئەسپێكی كوێرە.
* سەبر كردن، كلیلی بەهەشتە.
* پێنج ساڵ منداڵەكەت وەكو میر بژمێرە، دەساڵیش وەكو كۆیلە، لە پاشان وەكو برادەر.
* ئەو تۆزەی كۆمەڵە بەرخێك دەیكەن، گورگ ناخنكێنێ.
* هەژاری گوناه نیە.
* پێش ئەوەی بڵێی دەمەوێ، بە خۆت بڵێ لایقە پێم.
* ئەو دڵەی خۆشەویستی كردبێ، كەس نابینێ.
* ئەو دڵەی پڕە لە خەم و پەژارە، وەكو بەرداخێكی پڕە، هەڵگرتنی قورسە.
* هەموو شتێ نامێنێ، تەنها ئەو خێرە نەبێ كە دەیكەی.
* مەیەڵە زمانت، ملت بە بڕین بدات.
* هەموو خاوەن عەمامەیەك شێخ نیە.
* هیچ شتێك لە نەزانین تاریكتر نیە.
* گورگ، تەنها گورگی دەبێ.
* هەر ئاوێك لێڵ بوو، لە كۆتاییدا ساف دەبێتەوە.
* ئەوەی لە ئاو بترسێ ماسی بۆ ڕاو ناكرێ.

* ئەوەی عەیب و عاری خەڵكی ئاشكرا دەكا، لە لایەن گوێ گرانەوە بەبێ قیمـەتی دەزانن.
* ژن، هەرچەندە لە خوا ترس و ئاین پەروەر بێت، دەبێ خۆی جوان بكات.
* مردن لەگەڵ كۆمەڵ و مەوكیبدا نایەت، بەڵكو بەبێ دەنگی دێت.
* ئەستێرەكان، ئەگەر ئاسمان ساف بوو دەدرەوشێتەوە.
* وەعد و پەیمان، تۆڕێكە بێ ئەقڵەكان تێدەكەوتن.
* دەستی دایك نەرمە، تەنانەت ئەگەر لێشت بدات.
* ئەو دەستەی نابات وەرناگرێ و نادات.
* ئەگەر خوێت خوارد خوێدانەكە مەشكێنە.
* نەزانی مردنە، زانست ژیانە.
* داری تەمەڵ بەری برسیەتی دەگرێ.
* برسێتی، نە ئاینی هەیە نە ئیمان.
* سامان و پارە وەك كیسەڵ دێت و وەك ئاسكە دەڕوات.
* نەزان قسە دەكات و زانا شت وەردەگرێ.
* زانست بەبێ سەبر، وەكو مۆمی دانەگیرساوە.
* دەستی نەرم، بە یەك موویەك فیل ڕادەكێشێ.
* ئەوەی قسە دەكا سەرف دەكا، ئەوەی گوێ دەگرێ دەستی دەكەوێ.
* زمانی خەڵكی، قەمچی خوایە.
* پێش من چاندیان و نەیان خوارد، منیش دەیچێنم ئەوانەی دوای من دەیخۆن.
* جەور، وەك یەك بەش بدرێ، ئەمە عەدالەتە.
* خێر بۆ دەرگای خاوەنەكەی دەگەڕێتەوە.
* ترس برای مردنە.
* خەوتنی حەسحەس، چرای دزە.

* گومان، کلیلی هەموو زانستێکە.

* لێبوردن، خۆشییەکە لە تۆڵە خۆشترە.

* خوا هەر دە پەنجەکەی وەکو یەك دروست نەکردووە.

* دوو شمشێر لە یەك کێلاندا جێیان نابێتەوە.

* تینوی دڵ، بە یەك تنوکە ئاو تەسکینی نایەت.

* دەرگایەك مەکەرەوە، ئەگەر نەتوانی دایخەیتەوە.

* مردن هەرگیز دوا ناکەوێ.

* لە تۆپینی گورگدا، جەژنی ڕێوییە.

* تەنهایی، هێلانەی بیرکردنەوەیە.

# لە وتەكانی (ئیتالی)

* ئەگـەر قـاپ و كەوچـك دەس كـەوت، ئەمـە ئـەوە ناگەیـەنیٚ شـۆربات دەسـت دەكەویٚت.

* ئەگەر دەتەویٚ نهێنیەكانت بپاریٚزریٚ، ئەی خۆت بۆ نایپاریٚزی.

* برادەرەكەت خۆش بویٚ، سەرەڕای عەیبەكانی.

* هاندان و تەشجیع، سێیەكی یارمەتییە.

* ماف، وەكو ڕۆن وایە گومانی تێدا نیە سەردەكەویٚ.

* لێبوردن (عذر)، دانراوە بۆ ئەوەی بەكار بهێنریٚت.

* سیفاتی گەورە، كیسەی پارەكان بەتاڵ دەكاتەوە.

* برادەری هەموو برادەریٚك، برادەری نیە.

* سەبركردن، تیماری نەخۆشی هەمەچەشنەكان دەكا.

* دوژمنایەتی كۆن، بە پەلە سەر هەڵدەداتەوە.

* چارەسەر كردنی خەفەت، بە قسە گۆڕینەوە دەبیٚ.

* سزای درۆزن ئەوەیە، ئەگەر جاریٚكیش ڕاستی وت بڕوای پێناكریٚ.

* ئازاری ڕاڤە، خۆشی زانیاری تێدایە.

* قەناعەت، نیوەی بەختیارییە.

* هەموو شتێك پێویستی بە مامۆستا هەیە، بە تەنها شەڕ نەبیٚ.

* هەموو گوڵێك، لە كۆتاییدا بۆنی نامێنیٚ.

* كۆلیتەیەكی پڕ باشترە لە قەڵایەكی بەتاڵ.

* هەرگیز كەس هاواری نەكردووە، ئەگەر ئازاری پیٚ نەگەیشتبیٚ.

* هیچ كەس بە قەدەر گەورەكەی خزمەكارە، لە خزمەكارەكەی نازانیٚ.

* كەر نەرخی كلكی نازانیٚ ئەوكاتە نەبیٚ كە كلكی نامێنیٚ.

* هیچ شتێك لە فرمێسك زووتر وشك نابێتەوە.
* ئامۆژگاری هیچ کەسێ مەکە، ئەگەر خۆی داوای نەکرد.
* ئاوی دوور، ئەگەر ئاگر بەربوو نایکوژێنێتەوە.
* کاتێ ڕێوی وەعز دەدا مریشکەکەت ون نەبێ.
* هیچ کەسێ لە ئەرزی یەکێکی کە بینا بکا، ئەو بەردانەی کە بینای پێکردووە، لە کیسی دەچێ.
* ئەو کەسەی وا باوەڕ بکا، خوا دەخەڵەتێنێ، هیچ کەس ناخەڵەتێنێ، تەنها خۆی نەبێ.
* ئەوەی دەس پێ نەکا، تەواو نابێ.
* ئەوەی سەری نەبێ لاقیشی نیە.
* خەو برای مردووە.
* خۆشەویستی بەردەوامە، ئاگەر سامانت هەبوو.
* هەموو شتێ بەردەوام بێ، شیرینی نامێنێ.
* ئەوەی پیشەکەی بە باشی بکات، دەستی پیس نابێت.
* ناخۆشییەك، ناخۆشییەکی تر ڕادەکێشێ.
* میرێکی نەزان، کەرێکە و بە سەرکردە هەڵبژێردراوە.
* پەنجەکانت بە کوژانەوەی مۆمی خەڵکی مەسووتێنە.
* ئەوەی بۆ هیوا بژی، بە ئارەزوویەوە دەمرێ.
* ئەوەی لە شەڕی دڵداری ڕابکا سەرکەوتووە.
* لەو شوێنەی یاسا هەیە نان هەیە، لە کوێش گیروگرفت هەیە برسێتییە.
* قەفەسێکی زێڕین دان بە چۆلەکە نادات.
* زەرەری خوری، باشترە لە زەرەری بەرخۆلە.
* پێویستە جلی پیس لە ماڵەوە بشۆردرێت.

* خراپترین دز کتێبی خراپە.
* نابێ بە پەنجەی پیسەوە ئاماژە بۆ هەڵەکانی خەڵکی بکەیت.
* پێ هەڵکەوێ نەك زمان هەڵە بکات.
* سەرباز خوێن دەدا بۆ ناوداریێتی سەرکردەکەی.
* هەموو ئاشەوانێك ئاو بۆ ئاشەکەی ڕادەکێشێ.
* هەڵەکان گەورەن، ئەو کاتەی خۆشەویستی بچکۆڵەیە.
* هەر کاتێ ویستت دەتوانی شەڕ بکەیت، کۆتایش بێت هەر کاتێ توانیت.
* خراپترین میوە ئەوەیە کەهەرگیز ناگەێی.
* دەتوانین وێنەی گوڵێك بکەین، بەڵام بۆنی لە کوێ بۆ بینین.
*ڕووناکی نیوەی هاوڕییەیە.
* ئەو شوانەی شانازی بە گورگەوە دەکات، بەرخەکانی خۆش ناوێت.
* یەك ڕۆژ وەکو شێر، باشترە لە سەد ڕۆژ ژیان وەکو مەڕ.
* ئەوەی لەسەر خۆ بڕوات، بەسەلامەتی دەگا.
* جیهان  بە سەبر دەگیردرێت.
* ئەوەی ئازایەتی نییە، دوو لاقی هەیە.
* پەلێك لە دوای پەلێك قازەکە ڕووت دەبێتەوە.

# لە وتەکانی (بەرازیل)

* کوڕم، کوڕمە تا ژن دێنێ.
* خزمەتی خۆت بکە تا منداڵەکانت گەورە دەبن.
* ئەگەر ویستیان سەگێك بکوژن، دەڵێن هارە.
* ویستت شتێ بکڕیت و پێویستت نەبێ، وەکو ئەوەیە شتێ بفرۆشیت و پێویستت پێەتی.
* ویستت شتێ بکەیت، بیر لە ئەنجامەکەی بکەرەوە.
* ئەگەر دوو دز بو بە ناخۆشییان، فەلاحەکە مانگاکەی دەگێڕدرێتەوە.
* کەی سامان قسەی کرد، جیهان بێدەنگ دەبێ.
* ئەگەر مرۆڤ ویستی تا تێر خواردن، تامی نانەکە نامێنێ.
* ئەگەر خەفەت بار بویت، ناخۆشییەکەت لای خۆت شکات بکە.
* ئەگەر شێر تۆپی، ڕێوی لە جەنگەڵدا لە جێی شێر دادەنیشێ.
* شێر مشك ڕاو ناکا.
* بە نهێنی ئامۆژگاری برادەرەکەت بکە و بە ئاشکرا مەدحی بکە.
* ماڵێك ژنی تێدا نەبێ، بیرێکە دەلوەی نیە.
* ماڵێك سووتەمەنی تێدا نەبێ، لەشێکە بەبێ خوێن.
* ئاگاداری گوڵەکان بکە بەرەکەی دەخۆی.
* دەست ڕەنگینی لە دەوڵەمەندی باشترە.
* چاك وایە دەستی پێنەکەی، نەك دەستی پێبکەیت و تەواوی نەکەی.
* جیهان، مامۆستایەکی ڕاستە، بەلام داوای کرێیەکی زۆر دەکا.
* قەرەوێڵەیەك لە زێڕ، نابێتە هۆی چاك بوونی نەخۆشەکە.
* تێر ئاگای لە برسی نیە.
* برادەرێکی ڕێڕەو، باوەڕی پێ ناکرێ.

* ئەو باڵندانەی ناخۆن، زۆر ناژین.
* یەك چاوێك بۆ تاجر بەسە، سەد چاو بەشی کڕیار ناکات.
* چاو هەموو کەسێك دەبینێ، تەنها خۆی نەبێ.
* خواردنێکی کەم، تەمەنێکی درێژ.
* وشە، تیر نیە، بەڵام بە دڵەوە دەچێ.
* هەژار لە بیر مەکە و برینی بچوکیش.
* خۆت بە خاوەن ماڵ مەزانە، ئەگەر بە دەست بەتاڵ بە ژوورەوە چوویت.
* گەدە پەنجەرەی نیە.
* ئەوەی لە ئاوەوە دەرچوو، لە باران ناترسێ.
* ئەو کەسەی خراپەکانی خۆی بزانێ، تێبینی خراپەکانی خەڵکی ناکا.
* ئەوەی نەچەمێتەوە، دەشکێ.
* گەدە پڕکردنی ئاسانترە، لە پڕکردنی چاو.
* ئەوەی چاوەڕێی یەکێك بکا بۆ مردن، پێویستی بە مۆمێکی درێژە.
* ڕۆژ ئیشی ئێوارە ئاشکرا دەکات.
* سوور بوون لەسەر ئیش، ماوەکەمان بۆ نزیك دەکاتەوە.
* خۆشی هەژار دەوام ناکا.
* دەمی داخراو، مێش بە ناویەوە ناچێ.
* لەو شوێنەی خوێن ڕژابێت، داری لە بیرچوونەوە ناڕوێت.
* خاك تینوی خوێن نییە، بەڵکو تینوی ئارەقیانە.

# لە وتەکانی ( پورتوگال )

* ئەگەر برادەرت نەبوو، پرس بە دارەکەت بکە.

* لە کێلگە توورەبە، بەڵام لە داهاتەکەی توورە مەبە.

* ئێشەکانی پار، هەمیشە باشترە.

* سوپایەك لە ئاسکە، شێرێك لە بەریان دەدا.

* بە زیادی پزیشك، نەخۆشی زیاد دەبێ.

* کە هیچیت نەدا، هیچیش داوامەکە.

* قەرزی کۆن باشترە لە قینی کۆن.

* لە خەڵك ببورە، بەڵام لە خۆت مەبوورە.

* ماسی، لە دەمیەوە دەمرێت.

* ئەوەی بۆ ماوەیەکی درێژ لە ماڵ دوور کەوێتەوە، خواردنەکەی سارد دەبێتەوە.

* کورتترین ڕێگا بۆ خواردن، ڕێگەی پێچاو پێچە بۆ ئیش کردن.

* هێلانەی بچووك گەرمترە لە هی گەورە.

* ئەقڵی مرۆڤ وڵاتەکەیەتی.

* ژیر یەکە کەسە کە دەوڵەمەندە.

* گران هەرزانە، هەرزانیش گرانە.

* دەمی داخراو بۆ خۆی دوژمن پەیدا ناکات.

* نانی نیوەڕۆ بخۆ، بۆ ئێوارەش بکولێنە.

* سەگێك بە تەنها ناتوانێ شەڕ بکا.

* بانگی مریشك مەکە، ئەگەر هی خۆت نەبوو.

* مێش بەدەوری ماستی داخراو ناسووڕێتەوە، ئەگەر داخرابوو.

* ئاگر، بە پووش ناکوژێتەوە.

* هیچ کوێرێك خۆی نەبینیوە و هیچ خەتابارێك خۆی نەناسیوە.

* لە قسە کردنتا قسەکانت مەکەرەوە بۆ ئەوەی بزانن چی دەڵێت، زۆر قسەش مەکە ئەگینا بێزراو دەبیت.
* دەمی داخراو مۆسیقایە.
* ئەگەر هاوسێکەت زوو هەڵسا، تۆش وەکو ئەو دەبی.
* ئەوەی سەرکەوتن وەدەس بێنێ و ئیش و کاری خۆی گرتبێ، سەرکەوتنێکی گەش وەدەس دێنێ.
* کێ دووابکەوێت، ئەوە دەخوا کە ماوەتەوە.
* ئەوەی هیچی نەبوو، لە هیچ نەترسێ.
* ناخۆشی خەڵکی کە، ئازاری ئێمە چاك ناکاتەوە.
* شەرەف و سوود پێکەوە کۆنابنەوە لە یەك کیسەدا.
* هاوسێی خراپ، دەرزیت دەداتێ، بەبێ دەزوو.
* مانگە شەو و دڵداری کە زیاد نەکەن، کەم دەکەن.
* ئەوەندەی دەیزانی هەمووی مەڵێ، ئەوەندەی گوێت لێی دەبێ باوەڕی پێمەکە، ئەوەندەی دەتوانی هەمووی مەڵێ.
* زۆر بوونی مۆم، کڵێسەکەی سووتاند.
* لە دەوڵەمەند قەرز مەکە، قەرزیش بە هەژار مەدە.
* سێ برا سێ قەڵایە.

# لە وتەکانی (بۆلگاری)

* بۆ دادگا بڕۆ یەک شتت هەیە، بە دوو شتەوە دەگەڕێتەوە.
* ئەگەر خەفەت خەوت هەڵی مەسێنە.
* ئەگەر بەخت لە دەرگاتی دا، دووامەکەوە زوو دەرگا بکەرەوە.
* گرانترین مرواری لەسەرخۆ و تەوازوعە، بەڵام خەڵکی خۆی لێ دوور دەخاتەوە.
* برا قەڵایە.
* ترس، زۆر دەبینێ.
* ئیرادەیەکی باش، ڕێگا کورت دەکاتەوە.
* ئەوەی بەخشەندە بێت بە پەلە، واتا دوو جار بەخشەندەیە.
* ئەگەر باوەڕت هەبوو، باشترە لەوەی پەشیمان ببیتەوە.
* ئەگەر عەیبەکانی خۆت نەبینی، لۆمە دەکرێی کە چاوت کزە.
* بەنرم و نیانی هەموو دەرگایەکمان لێ دەکرێتەوە.
* لە برسا نامری ئەگەر تۆ سەربەست بیت، باشترە لەوەی کە قەڵەو بیت و کۆیلە بیت.
* ڕاڤە باشترە لە زانست.
* لەگەڵ خەڵکدا کەم قسە بکە و لە گەڵ خۆتا زۆر.
* سوور بوون لە ئیش، پێویست بەنیشاندان ناکات.
* ڕاستی، کوڕی زەمانە.
* مافێکی ڕەوا، پێویستی بە یارمەتی هەیە.
* لە کوێ سەربەستیم هەبوو، ئەوێ وڵاتمە.
* باشترین برادەر بۆ مرۆڤ، سەگەکەیەتی.
* دوور نیە دەم و چاوێکی جوان، نەفەسی پیسی هەبێ.

* خۆڵەمێشی مردووەکان، وڵات دروست دەکەن.
* داوێن پیسی و خراپەکاری هەمیشە هەیە، مادام مرۆڤ هەیە.
* لاوان تەماعیان نەبێ، وەك بەهاری بێ گوڵە.
* پشیلەی پیر هەرگیز خۆی ناسووتێنێ.
* مندالّی بێ تەربیەت، خراپ دەبێ وەکو گۆشتی بێ خوێ.
* پێم بڵێ: هاوڕێتی کێ دەکەی، پێت دەڵێم: تۆ کێی.
* باوك چۆن بێ، مندالّەکەشی وادەبێ.
* داری بی، بەرناگرێ.
* هەموو بزنێك لەسەر پێیەکانی دەڕوا.
* ئەوەی باوەڕی بە خەو بێ هەوا دەخوا.
* ئەوەی هەمانە ناتوانین لە کاتی مردندا بۆ قەبری بەرین.
* شیری سەرپۆش داخراو، پشیلە نایخوا.
* قسەی خۆش دەرگای ئاسنین دەکاتەوە.
* تف بەو بیرە وە مەکە، کە ئاوی لێ دەخۆینەوە.
* ناتوانین دوو کاڵەك بە یەك دەست هەڵبگرین.
* لە پیرەمێرد مەپرسە کوێت ژان دەکا، لێی بپرسە کوێت ژان ناکا.
* چاو هەموو شتێك دەبێنێ، تەنها خۆی نەبێ.
* شەیتانی ڕەش، سپیە.
* ڕاستی، ئەوەیە کە لە مێشکدا چەسپیوە و چاو دەیبینێ.

# لە وتەکانی (بۆسنە)

* هەموو ئەوانەی دەیبینی باوەڕ بە هەمووی مەکە، ئەوانەشی دەیبیستی باوەڕ بە هەمووی مەکە.

* هیچ کەس وەسف مەکە، پێش ئەوەی تاقی بکەیتەوە.

* نابێ واز لە کشتوکاڵ بهێنین، لە ترسی چۆلەکە.

* گەدەی بەتاڵ هەڵگرتنی زەحمەتە.

* ئەوەی قەرز زۆر بکا خۆی بەرەو کۆیلایەتی دەبا.

* لەوێدا هەمیشە یەکێك هەیە، لە تۆ خراپترە.

* قەمبور، قەمبوورێتی خۆی نابینێ، بەڵام قەمبووری غەیری خۆی دەبینێ.

* چاکە، گوێ هەموو زانیاریەکی ئاکارە.

* هەڵەکردن لە کرداری مرۆڤە، بەڵام سوور بوون لەسەر هەڵە ئیشێکی شەیتانیە.

* دوو ڕۆژ سەبرکردن، دوو ساڵ ئیسراحەت دەکەی.

* ئیشی باش بەردەوام دەبێ، بە پێچەوانەوە بەردەوام نابێ.

* ڕەزیل سواڵکەرێکی هەمیشەییە.

* ترسنۆك لە کاتی خەتەردا بیر لە قاچەکانی دەکاتەوە.

* باشی و بەپەلە، کەمجار یەك دەگرنەوە.

* باشترە بۆ مرۆڤ هەندێ جار ترسنۆك بێت، نەك بە درێژایی ژیانی مردوو بێت.

* هەمیشە لە خەڵکی ببوورە، پاشان لە خۆت.

* پەلە، پیشاندەرێکی خراپە.

* دووژمنێك بە ئاشکرا دووژمن کاریت دەکات، باشترە لە برادەرێك لە دڵەوە ڕقت لێ دەگرێ.

* هەموو عەیبەکان کە پیر دەبن، ڕەزیلی بە لاوی دەمێنێتەوە.

* چاوی بۆق پڕە لە فرمێسك.

* هەموو كەسێ خۆشەویستەكەی لە هەموو كەس بە جوانتر دەزانێ.

* دڵت چۆن بێ، قسەتیش وایە.

* شتی بچووكیش نرخی خۆی هەیە.

* بەچكە پشیلە گەرێ چی بكا ؟ لەوە زیاتر مشك بكوژێ.

* ئەوەی لە دڵەوە دەردەچێ، بە دڵ دەگا.

* ئەوی ئەوەندە بخوات تاكو نەخۆش بكەوێت، دەبێ بە ڕۆژوو بێت تاكو چاك دەبێتەوە.

* بە چاوی یەكێ تر ببینیت، دەخەڵەتێ.

# لە وتەكانی ( پۆلۆنی )

* ئەوەی لە قاپەكەی دا هەنگوین نەبوو، با زمانی خۆش بێت.
* زور بێ ئەقلییە، لەگەڵ كوێردا باسی ڕەنگەكان بكەیت.
* ئەوەی ئەگەر شەرەفی لە دەستدا، ئیتر هیچی ماوە لە دەستی بدا.
* ئەوەی چەنەبازیت بۆ بكا، لەسەر تۆش چەنابازی دەكا.
* ئەوەی مافی خۆی بزانێ، لەگەڵ كەسدا خراپە ناكا.
* لە شەڕانی بووردن، خراپە لەگەڵ چاكاندا دەكا.
* پارە بازنەییە، لەبەر ئەوە (خل) دەبێتەوە.
* دەم و چاوی پاك پێویستی بە شۆرین نیە.
* هەمووان دەیانەوێ بزانن، بەڵام هیچ كەس پارە نادات.
* شەیتان، ئافرەتی قووت دا، بەڵام هیچ نەیتوانی هەزمی بكات.
* ئەگەر بەڵا لە دەرگاتی دا، برادەرەكان دەخەون.
* یەك قسەی باش وەكو ڕۆژێكی بەهارە.
* ئەگەر تاوان بە تاوانێك چارە بكەیت، ترسەكانت زیاد دەكات.
* بزە لەسەر لێوی برسی درۆیە.
*بە گوێرەی لێدان، ئازار دەبێ.
* هێلكەی ئەمڕۆ لە مریشكی سبەی باشترە.
* هاوسێی خراپ وەكو وەجبە نان خواردنی خراپە.
* ریشەی زانست تاڵە، بەڵام بەرەكەی شیرینە.
* ترسان لە هەژاری، لە هەژاری خراپترە.
* كەللە ڕەقی تووشی زۆر شتت دەكا.
* داری درێژ هەموو (با) یەك دەیلەقێنێ.
* سەركەوتوو لە كاتی پێویستدا، خۆی بە دەستەوە دەدا.

* توورەیی برادەر، تازە کردنەوەی خۆشەویستییە.

* بەڕووی دار بەڕوو بە نرخ بوو، تاکە گەنمیان دۆزییەوە.

* چاکە کردن لەگەڵ سپڵە، وەکو ئەوە وایە (بۆن) بە دەریاوە فڕێ بدەی.

* مشك، پشیلە وەکو مشك دەبینێ.

* سەگی کلك بڕاو چۆن خۆشی خۆی دەربڕێ.

* هیچ شەڕێك نیە ژنی تێدا نەبێ.

* ئازایەتی نیە ئەگەر هاوڕێیەکی ئازات نەبێ.

* گرێی پەت مەپچڕە، چونکە دەتوانی گرێکەی بکەیتەوە.

* هیچ کەس کونی گۆرەویی نازانێ، لە قۆندرە بەولاوە.

* هەنگوین نیە ئەگەر هەنگ نەبێ.

* کاتێ شەڕ دەستی پێکرد، دۆزەخ (جەهەنەم) دەرگا دەکاتەوە.

* ئەوەی لێی دەترسی پێت بکەن، تۆش ئەو شتە بە خەڵك مەکە.

* ئەوەی سەما نەزانێ دەڵێ مۆسیقایەکی ناخۆشە.

* چاوی دووژمن ناخەوێ.

* ئەوەی زۆر خەرج دەکا سواڵکەرێکی داهاتووە، بەلام ڕەزیل سواڵکەرێکی هەمیشەییە.

* ئیشی باش لەسەر دەس دەنووسن و ئیشی خراپ لەسەر تاوێر.

* ئەگەر دوو کەس پێتی وت: تۆ سەرخۆشی بڕۆ بخەوە.

* کچ پێش شووکردن دەگری، پاشان پیاوەکە دەگری.

* بزەی برسی، هەڵخەڵتێنەرە.

# لە وتەکانی (تورك)

* ئەوەی هەمووان هەیانە، هەمووان گوێی نادەنێ.
* ئەوەی بۆ پێشەوە نەڕوا، ناشکێت.
* هەر کەسێ زۆر خەوت، کەم دەژی.
* گیروگرفتی خەڵکی تر، ناخۆشی ئەوانی ترە.
* ئەوەی خواردنی گەرم بخوات دەمی دەسووتێ.
* هەر کەسێ بۆ مریشکێ پەنای بۆ دادگا برد، هێلکەیەکی چنگ دەکەوێ.
* ئەوەی نەتوانی مەدحی بکەی، زەمیشی مەکە.
* زەنگ دەنگی بەرزە، چونکە بۆشە.
* خەوتن کانگای هەژارە.
* وریابە لە توورە بوونی کۆتر.
* ڕێزی هاوسێکەت بگرە، بەڵام ئەو دیوارەی لە نێوانتانە مەیڕوخێنە.
* ئەگەر پارەت خستە سەر سەرت، لە نرخت کەم دەکاتەوە، ئەگەر خستە ژێر پێت بەرزت دەکاتەوە.
* بۆ کوێ دەڕۆی بڕۆ نامری، تەنها لەو جێگەیە نەبێ کە نووسراوە.
* باشترین تۆڵە، لێبوردنە.
* هەژارترین خەڵك ئەوانن کەی بێ هیوا دەژین.
* زۆرترین خەڵکی درۆزن، ئەوانەن کە دەربارەی خۆیان قسە دەکەن.
* ئیشێك نەزانی عەیب نیە، بەڵام عەیب ئەوەیە ئیشێك نەزانی و بڵێی دەیزانم.
* چاکە داوا بکەی شتێکی باشە، بەڵام لەوە باشتر ئەوەیە خۆت چاکە بکەیت.
* ئینکار کردنی هەڵە، واتا دووجار هەڵەت کردووە.
* ڕەزیل وەکو کەر وایە کا بخوات و بارەکەی زێڕ بێت.

* ماڵ بانگی بەختیارییە.

* ڕاڤە دایكی زانستە.

* چاكە لە جێگایەكەوە بە دوو قاچ دەڕوا، بەڵام خراپەكاری لە سەر پشتی ئەسپێكی سەركێش دەڕوا.

* پەشیمانی دوواجار، سوودی نیە.

* چەنەبازی مرۆڤ، ئاوێنەی بیر و باوڕیەتی.

* وەڵامێكی نەرم و نیان تووڕە دەڕەوێنێتەوە.

* باشترین شت پیاو بیهێنێ، ژنێكی بەوەفا بێ.

* (با) یەكی هەڵكردوو باشترە لە سەڵپی بەهێز.

* ژن هێنان و كاڵەك بە ڕێكەوت باش دەردەچن.

* نهێنیت كۆیلەتە، ئەگەر لە دەمت دەرچوو بە كۆیلەی دەبیت.

*بێدەنگی نەزان، لە ناو زاناكاندا، جوانییەتی.

* كەم جار خۆشەویستی لە ناكاودا دەمرێ.

* ڕاست بڵێ و بە چاوەكانت تەماشای ڕێی ڕاكردن بكە.

* سەگی برسی، لە شێر ناترسێ.

* با پاشا دوژمنت بێت نەك هاوسێكەت.

* ئەوەی بە پەلە ڕۆیشت بە پەلە ماندوو دەبێت.

* ئەوەی بە هەنگوین بێت، مێش دەیخوا.

* قوماش بە گوێرەی قەراخەكەی و ژن بە گوێرەی دایكی.

* هەموو شەوێك ڕۆژێكی هەیە، هەموو زستانێك هاوینی هەیە.

* مردن حوشترێكی ڕەشە، لەبەر هەموو ماڵێكدا چۆك دادەدا.

* هەژاری، كراسێكە لە ئاگر.

* ئەوەی زمانی بپارێزێ، سەری دەپارێزێ.

* چاکە بکە فڕێیدە دەریاوە، ئەگەر ماسییەکان پێیان نەزانی خوا پێی دەزانێ.

* ئەو دەستە ماچ بکە کە نەتوانی بیبڕی.

* هەنگوین شتێکە و نرخی هەنگوین شتێکی ترە.

* خۆشەویستی گوڵێك، وای لە باخەوان کردووە، دیلی هەزار گوڵ بێت.

* چەك دوژمنی خاوەنێتی.

* هەر گوڵێك بۆنێکی هەیە.

* کاتێ کارەبا دەکوژێتەوە، ژنەکان باوێشك دەدەن.

* مرۆڤ لە پاش مردنی وەسفی بکە.

* ئەوەندە کەوتینەتە هەڵەوە، فێر دەبین.

* دوو شت هەیە ناتوانی تەماشای بکەیت، هەتاو و مردن.

* مرۆڤ بە قسەکانیەوە بەستراوە، وەکو ئاژەڵ چۆن بەستراوە بە مێخەوە.

# لە وتەکانی (باشووری ئەفەریقا)

* ئەگەر ئاماژەت کرد بۆ فیل، بە پەنجە ئاماژەی مەکە.

* سەگ، لە دێیەکی نامۆ بوو، کلکی بەرز ناکاتەوە.

* ئەگەر سەبەتەیەك هێلکە لەسەر سەرت بوو، سەما مەکە.

* چۆلەکە لەسەر لقی داری نەناسراو ئیسراحەت ناکات.

* هێلکە لەگەڵ بەردا شەڕ ناکات.

* تەگەی ناڕەحەت و شەڕ فرۆش، زوو شاخیان دەشکێ.

* پاپۆڕی گەورەش لە ئاودا وەردەگەڕێ.

* بۆق حەزی لە ئاوە، بەڵام ئاوی گەرم نا.

* چۆلەکە بە باڵی غەیری خۆی نەبێ نافڕێ.

* کاتێ فاق دروست بکەیت، نێچیرت بۆ دەنێرێ.

* کاتێ شێر ژێرکەوت، تەنانەت مێشیش هێرش بۆ سەری دەبەن.

* نامۆ وەکو مریشکی سپی وایە، لە یەکەم تەماشادا دەناسرێ.

* پلنگ، هێرشی بۆ سەرت برد، نایکاتە هەراو هوریا.

* پلنگ، کێوییە، بەڵام بەچکەکانی ناخوات.

* سەگی تێر ڕاو ناکا.

* لە خوێ داوای شەکر مەکە.

* زێڕ دەرناکەوێ، تەنها لەلای ئەوانەی کە نرخی نازانن، ئەگینا فلسیان لێ دروست دەکرد.

* ئاگر بەوانە پیشان مەدە، کە تووشی ئاگر بوون.

* دوو پلنگ لە ناو یەك دارستاندا ناژین.

* ئەوەی لە دەم دەرچوو ناگەڕێتەوە.

* ئەوەی بیبەری تون (تفت) دەخوا، بێگومان وەکو ئاگر لە دەمیدا بێت وایە.

* ئەوەی لەگەڵ منداڵدا سەفەر بکا برسێتی ناکێشێ.
* مێروولە لە ئاو دەپەڕێتەوە ئەگەر پردی لەسەر بێت.
* ئێمە هەموومان ورچ دەناسین، بەڵام ورچ کەس ناناسێ.

# لە وتەکانی ( دەنیمارك )

* ئەگەر زوو تۆوت کرد گەنم دەدوریتەوە، ئەگەر درەنگ تۆوت کرد پووش دەدورێتەوە.

* ئەگەر دەتەوێ رووناکی بە باشی ببینی، ئەوا بۆ چراکە نەوت پەیداکە.

* ئەگەر دەربارەی تۆ خەڵکی قسەی کرد، لۆمەی خەڵکی مەکە لە بڵاوبوونەوەی.

* ئیشەکەت بە باشی بکە، نەك دوو جار بیکەی.

* شێری بەستراوە، تەنانەت مشکیش هێرشی بۆ سەر دەبات.

* ئەگەر بێ ئەقڵەکان بۆ بازار نەڕۆن، ئەی کێ کەلوپەلی خراپ بکڕێ.

* دەتوانی دارتاش، لە ئاردی دارەکان بناسی.

* لە ڕابواردنێکی کاتی بە دووربە، چونکە ئەنجامەکەی ئازارە.

* هاوسێیەکی باش، بەیانیەکی باشە.

* بەردی باش و چاك بۆ بینا، لە ناوەڕاستی شەقامدا نامێنیٚ.

* خۆشەویستی کوێرە، باوەڕیش وایە هیچ کەس نابینیٚ.

* باش وایە لە پێشبڕکێی بچووکدا بەشدار بیت، نەك تەماشاکار.

* لێگەڕێ با هەموو مرۆڤێك ئەو پردە مەدح بکات، کە لە سەریەوە تێدەپەڕێ.

* مەیەڵە ئەو سەرانەی کە لە مۆم دروست کراوە، لە ژێر هەتاودا بەرێوە بڕوات.

* (با) یەکی بچووك ئاگردەدەمێنیٚ و (با) یەکی گەورە ئاگر دەکوژێنێتەوە.

* سەرێك و هەزار خەفەت.

* زۆرجار پیاوی گەورە لەماڵەوە خزمەتکاری دەکەن.

* پێش ئەوەی بڕۆی بیر لە هاتنەوە بکە.

* پێی شکاو بە گۆرەوی ئاورێشم چاك نابێتەوە.

* قسەکردن لە دایك بووی سروشتیە، بەڵام بێدەنگی لە دایك بووی تێگەیشتنە.

* شۆرباکەت تام نەکرد نانەکەت مەولاوە.

* واز لە سەفەرەکەت مەهێنە بە هۆی بارانی بەیانیانەوە.
* ناتوانی سەر پەیژە بکەویت، بۆ ئەوەی لە سەرەوەیە، دایگریتە خوارەوە.
* ئەوەی کەشتیەك دەکڕێ چاوی ناکاتەوە، کاتێ پارە دەدات گیرفانی دەکاتەوە.
* ئەوکەسەی بیەوێ پشیلە ڕاوی بۆ بکا، تەنها مشکی بۆ دەگرێ.
* زۆر گرانە خۆشەویستی و هەژاریی، بشاردرێنەوە.
* مانگای ڕەش شیری سپیت دەداتێ.
* جوانی بە بێ شەرف، وەکو گوڵێکە بە بێ بۆن.
* ئەوەی لە پرسیار بترسێ، شەرم دەکا فێربێت.
* پێویستە لەسەر مرۆڤ زۆر ئازار بچێژێ، یاخود بە لاویی بمرێ.
* چاو باشترین شایەتە، لە گوێ.
* بەختیاری و شوشە، بە ئاسانی دەشکێن.
* ئەوەی مەڕێ بێ، گورگ دەیخوا.
* تەماع کاری و تۆڵە سەندنەوە، برسێتیە کە تێر خواردنی نیە.
* منداڵی سووتاو لە ئاگر دەترسێ.
* ئەوەی سەری کەرەبێت، ناتوانێ نانەوایی بکات.
* بەڵێنی دەنیمارکی، قەرزە.
* پێویستە هێلکە بشکێنی ئەگەر حەلوات کرد.
* هاوسێیەکی باش لە خوشکێکی دوور باشترە.
* جۆڵایەك بە پێوە و ئاسنگەرێك بە دانیشتنەوە بە کەڵکی هیچ نایەن.
* گەنمی باش لە کێلگەی بۆگەن درەو ناکرێ.
* دار بە یەك لێدانی تەور ناکەوێت.
* ئەوەی بە سەر شانتی دەخەی، هەوڵ دەدات سەرکەوێتە سەر سەرت.

# لە وتەكانی ( روسیا )

* باشترین و خراپترین بەش ژنەكەتە.

* هەڵەی خەڵكی پرشنگدارترە لە هەڵەی خۆمان.

* هەتاو هەڵهات، بۆ هەموو كەس هەڵهات.

* ئەگەر سواری ئەسپ بوویت، یەك جار نوێژ بكە، ئەگەر سواری دەریا بووی دووجار نوێژ بكە.

* مار كە تۆپی، ژارەكەشی دەتۆپێ.

* بەڵا كە خەوت توو هەڵیمەسێنە.

* زیاد ڕۆیشتن و ڕابواردنی كاتی، لە هەموو بەڵایەك گەورەترە.

* ئیش بەرزترە لە قسە.

* تۆ لە كاتی شەڕدا ناتوانی شمشێرەكەت بە ئامانەت بدەیت.

* مرۆڤ دەتوانی خۆی ڕابهێنێ لەسەر هەموو شتێك، تەنانەت دەربارەی دۆزەخیش.

* دواخستن دزی زەمانەیە.

* ئەو سەربازەی خەو بەوەوە نابینێ ببێتە ژەنەڕاڵ، ئەوە سەربازێكی تەمەڵە.

* ئەو بەردەی بۆتە كۆسپ لە ڕێگاتدا، نابێ پێت ناخۆشبێت.

* یەك فرمێسكێك لە چاوی قەیسەر، لەسەر وڵات تەكلیفی سەد دەستەسڕ دەكات.

* میوان ڕۆژی یەكەم زێڕە و ڕۆژی دووەم زیو و سێەم ئاسنە.

* كاتێ هەژار لە دەرگاوە دێتە ژوورەوە، خۆشەویستی لە پەنجەرەوە دەردەچێت.

* وەختێك پارە قسە بكا، ڕاستی دەوەستێ.

* چەند یاسا زیاد بكا، عەدالەت دەوەستێ.

* ئەوەی ئەمڕۆ دەتوانی بیكەی، دوای مەخە بۆ سبەی.

* مەڕۆ بۆ جێگایەك، كە سەرت بە ئاسانی بە ژوورەوە نەچێ.

* جوجەڵەكان مەژمێرە، ئەگەر هێشتا لە هێلكە دەرنەچوون.

* ئاگرێك مەکەرەوە ئەگەر نەتوانی بیکوژێنیتەوە.

* بۆ زار بەکاردێنی ؟ مادام دەتوانی بە هەنگوین بیکوژی.

* بۆچی بە خۆڕایی کاتت دەکوژی، ئەگەر لە تواناتا هەیە سوودی لێ وەربگری.

* خەنجەرێك بە پیاوێکی کەر بدە، دەبێتە پیاوکوژ.

* ئەگەر دەزانی لە کێ بدەی، بزانە چۆن لێی دەدەی.

* ئەوەی ناتوانی چارەی بکەی، پێویستە لە سەرت چاوەڕێی بکەی.

* بەچکە پشیلە چی بکا، ئەگەر مشك نەکوژێ.

* سوالکەر مافی هەڵبژاردنی نیە.

* ئەوەی ئەسپێکی ویست کە لەسەری نەکەوێ، دەبێ بە پێ بڕوات.

* ئەوەی هاوڕێی گورگ بکا، دەبێ بزانێ چۆن دەلورێنێ.

* هەرچەندە پیاو ویستی دوور بڕوات، دەبێ لە دەرگای حەوشەوە دەست پێ بکات.

* ئاوی دزی شیرینە.

* ژن و شووشە، هەمیشە خەتەرن.

* کوێر چ باکێتی ئەگەر نرخی مۆم گران بوو.

* لە هەر جێگایەك هێز هەبوو، یاساش هەیە.

* کەوتن ڕێگای پێدراوە، هەڵسانیش لەسەرتە.

* ئەوەی زۆر کەس بناسێ زۆر دەخەوێ.

* وشە وەك تیرە، لە دەم دەرچوو ناگەڕێتەوە.

* لە وڵاتی هیوادا زستان نایەت.

* دەوڵەمەندی ڕەزیل لە سوالکەر هەژارترە.

* بە یەك مێشەهەنگ، هەنگوین نایەت.

* نان باوکە و ئاو دایکە.

* منالّەکانتان خۆش بویّ و بە دەستان ئەدەبیان بدەن.

* برادەرەکەت کۆشکێکت بۆ دروست دەکات و دوژمنەکەت گۆڕێکت بۆ هەڵدەکەنیّ.

* ناوی باش هەمیشە نووستوە، ناوی خراپیش لە شەقامەکاندا هاوار دەکا.

* ئەگەر کوێر دوو چاوی بدەیتیّ داوای برۆ دەکا.

* لە زەڵکاوی درۆ تەنها ماسی مردووت دەست دەکەویّ.

* مەرج نییە هەموو گۆرانی بێژیّ کەیف خۆش بیّ.

* هەرگیز ئەوەی پارەی هەیە لە سێدارە نەدراوە.

* چەند ئاسانە خەرج کردن لە گیرفانی یەکێکی کە.

* دیوار بە یەك بەرد دروست ناکریّ.

* جوانی برای خۆهەڵکێشانە و باوکی کەشخەییە.

* کەڵەشێرێك بەختی یار بوو. هێلکە دەکات.

* راستی لە زێڕ گرانترە.

* ئەگەر مالّ و سامان نەبوو، با برادەرت هەبیّ.

* ئەوەی لە گورگ بترسیّ، نابیّ بۆ دارستان بڕوات.

* ترس، وا لە کەر دەکات، لە ئەسپ خێراتر بڕوات.

* ئەگەر شەل بوویت، لەوە باشترە هەمیشە لە مالّەوە دانیشی.

* میوان زێڕە، پاشان زیو، پاشان ئاسن.

* ئەگەر دەولّەمەند نەبووی، ببەرە هاوسێی دەولّەمەند.

* دادگا کردنی خەلّك و سزادانیان، پێویستە مرۆڤ جێگەی گومان لێکراو نەبیّ.

* هەندیّ وا بۆ خۆیان حیساب دەکەن کە سواری حوشتر دەبن خۆیان بە گەورە و دەست ڕۆ دەزانن.

* زۆر جار فێلّ کردن قازانجی تێدایە، قازانجیش هەموو جار کوڕی فێلّ نیە.

* مەرج نیە پیرەمێرد بمرێ، بەڵکو پاڵەوان.

* دەستی فەلاح گرێی تێدایە و ڕەشە، بەڵام کولێرەی تەنورەکەی خۆش و سپییە.

* قسەیەکی جوان و خۆش، وەکو ڕۆژێکی بەهارە.

* خۆی خۆشەویست دەکا، بۆی هەیە گلەیی و لۆمەش بکا.

* پەشیمانی لە ڕابوردوو، ڕاکردنە بە دوای (با) دا.

* مرۆڤ باشە، ئەگەر وای لە خەڵکی کرد بەرەو باشی بڕۆن.

* بەڵێنی گەورە، هیوای شێتە.

# لە وتەكانی (ڕۆمانیا)

* سەر نەكەوتن زۆر فێری سەركەوتنت دەكا.
* ئەگەر نەتوانی شتیٚ بكڕیت، دەست درێژی كردن بۆی بێهودەیە.
* مەلەوانی لە ئاودا فێر دەبیٚ.
* مرۆڤ قەلاّ دەكا و زەمانیش دەیڕوخێنیٚ.
* یەكەم منالٚ بەختەوەرە، كچە.
* لە كاتی دەوڵەمەندیتدا هەژاری بێنەرەوە یادت، هەژاریش لە كاتی دەوڵەمەندیدا.
* هەندیٚ شتی بچكۆڵەی خراپە لێبگەڕیٚ، چونكە خۆت خراپەی گەورەت زۆرە.
* كەریٚ سواری بیت نەتخات، لە ئەسپیٚ باشترە، كە لەسەر پشتی بیت بتخات.
* برینی ئازا بەدانسقە لە پشتێوە دەبیٚ.
* باش وایە شەل بیت، لەوەی بە درێژایی تەمەنت دانیشی.
* ئاشتی، ئاشتییەكی هەمیشەییە، بەلاّم بۆ شەڕێكی چاوەڕوان نەكراو.
* سوالكەری شەرمن، گیرفانی بەتاڵە.
* كڕین فێر ناكا، بەلاّم فرۆشتن فێر دەكا.
* خاوەنی جێی گەرم، خواردنەكەی ساردە.
* دڵسۆزی نامۆ، وەكو بازگەیەكە لە زێڕ.
* دەوڵەمەند پرسیار لە هیچ كەس ناكات.
* سەگەكەت داوای تەمەن درێژی زۆرت بۆ دەكا.
* تۆ كە پارەت نەبوو (مفلس) بووی ڕەزیلی سوودی چییە.
* مالٚ هیچ زەرەرێكی نابیٚ، تەنها دەرگای پشتەوە نەبیٚ.
* ڕاستگۆ هەمیشە زمانی ئاسانە.
* لە كاتی توورە بوونتا چاو نییە.
* سێو لە دووری دارەكەی ناكەویٚ.

* ئەگەر مردووەکان لە بیر نەکەین، فرمێسکی چاوەکانمان وشك نابێتەوە.
* جل بە ئامانەت وەرگرتن گەرم ناکاتەوە.
* ئەوەی خوێندن و نووسین بزانێ، چوار چاوی هەیە.
* ئەوەی ئامادە بوو، نیوەی شەڕەکەی بردۆتەوە.
* ئامۆژگاری کردن لە دوای ناخۆشییەکە، وەکو دەرمانە پاش مردن.
* چرا بۆ خەوتوو داناگیرسێنرێت.
* ئەوەی لەلات پەسەند نییە لەسەر جۆگەلەی ئاو بینووسە.
* هیچ شتێك ئەوەندە زۆر ناگۆڕێ تەنها کاتی ئافرەت نەبێ.
* زمانی ئافرەت چەقۆی دوو دەمە.
* وەسفی درۆزن، خۆشی بێ ئەقڵە.
* لە دوای شەڕ پاڵەوان زۆر دەبێ.
* جوانێکی بێ ئەقڵ، وەکو گوڵێکە لە ناو قوڕدا.
* ئەگەر درۆزن ڕاستی بڵێ، نەخۆش دەکەوێ.
*کەرە لەسەر کەرە، نابێتە چێشتخانە.

## لە وتەکانی (سوێد)

* خواوەند رزقی هەموو باڵندەیەك دەدا، بەڵام نایهاوێتە هێلانەکەیەوە.

* لە سەرەتاوە باش دەستی پێبکە، لە کۆتاییەکەی مەترسە.

* ئەگر بیرورِا زۆر بوو، ئیش کەم دەبێتەوە.

* ئاسنەکەت بکوتە هەتا گەرمە.

* لە زستانا گورگ تێر بکە، لە هاویندا دەتخوات.

* زۆرترین بەڵاکانی خەڵك لە خەڵکەوەیە.

* باش وایە ئازار بچێژی، نەك پاداشتی درۆ وەرگری.

* سامان کۆیلەی ژیرە، گەورەیی بێ ئەقڵە.

* برسێتی زۆر شتت فێردەکا.

* تاکە پێڵاوێك بۆ هیچ پێیەك نابێ.

* تەنانەت ژیرەکانیش دیاری لە رِێ دەریان دەکا.

* تینووەکان لەسەر خۆیان ئاو دەخۆنەوە.

* چاوی نامۆ زۆر دەبینێ.

* وشەی نەرم و نیان ئازاری نییە.

* پرس بە پزیشك مەکە، پرس بە نەخۆش بکە.

* مەرج نییە ئەوەی پشتی تێت کرد رِادەکا.

* هەموو هەڵەیەك ئیعتزاری هەیە.

* ئەوەی چۆلەکەیەکی بەدەستەوە بوو بەریدا، لەبەر چۆلەکەیەك بەسەرداراەوە، کەرە.

* ئەوەی ویستی زۆرانبازی لەگەڵ گورگدا بکا، پێویستە نینۆکی ورچی هەبێت.

* ئەوەی لەبەر تۆ درۆ بکا، دزیشی بۆ دەکا.

* ئەگەر ئاسمان هەنگوین و ماسی باران، هەژار کەوچکی دەست ناکەوێ.

* ئەگەر قەرزدەر مرد، خۆ ئەوانی تر نەمردوون.

* ئەگەر تەماشا كردن بە چاو بەس بێت، دەس بەكار مەهێنە.

* ئەگەر پێستی شێرت دەست نەكەوت، پێستی ڕێوی بەكار بهێنە.

* بێ دەنگ بە، باشترە بلێی.

* مرۆڤ عەیبی خۆی بە چاو خەڵكی دەبینێت.

* ئێمە ناتوانین ئەو باڵندە شوومانە نەیەڵین بە سەرماندا بفڕن، بەڵام دەتوانین نەیەڵین هێلانە لە بان سەرماندا دروست بكەن.

* مردن گسكی خودایە.

* ئاینی دەوڵەمەند سنووقەكەیەتی.

* كاتێ گەورە دەخەوێ، خزمەتكارەكان خەو دەبینن.

*باشترین جیاكردنەوە بۆ قسە هاوردە خەفەری شەیتانن.

* نانی خوراو زوو لەبیر دەچێتەوە.

* كۆشكی میر لە كشتییەكەی نوح دەكا، لە ناویاندا جۆرەها ئاژەڵی تێدایە.

* ئەوەی خەڵكی ڕاو دەنێ ئیسراحەتی نییە.

* خۆشەویستی چەندەها پاڵەوانی دروست كردووە، هەروەها چەندەها هەڵخەڵەتاویش.

* ماسی بچكۆلە ئاوات دەخوازێ بە نەهەنگ بێت.

* دەوڵەمەند پێنج هەستی هەیە و هەژاریش شەش.

* پیاوێك بە بێ پارە وماڵ، وەك پاپۆڕێك وایە بەبێ شراع.

* بە پەلە لە بیری دەچێتەوە، كە هەموو لە سەرە مێكوتە بوون.

* باشترین قسە كردن و ڕاسترین، ئەوەیە كە لەگەڵ خۆماندا دیالۆگ بكەین.

* پیاوی ژیر، گوێی گەورەیە و زمانی كورتە.

* هەموو سپییەك ئارد نیە.

* شمشێری ژن لە دەمیایەتی.
* شەیتان یەك جار سەر لە دەوڵەمەند دەداو، دوو جار لە هەژار.
* ئەوەی كە هەمیشە دەیەوێ بیكا، كەم جار ئەوە دەكا، كە دەیەوێ بیكا.
* ئەو ماڵەی كە بە دڵی هەموو دروست بكرێ، بەبێ بان دەمێنێتەوە.
* گەنجەكان بە كۆمەڵ دەڕۆن، ئەوانەی پێگەیشتوون دوو دوو، پیرەكان یەك یەك.
* كاتێ دەریا هێمنە، كەشتیوانەكان هەموو باشن.
* دەستێ پڕ بێ لە پارە، باشترە لە دوو دەس پڕ بێ لە ڕاستی.
* بەهێزترین بێ هێز ئەو كەسەیە كە بزانێ بێ هێزە.
* ئەو دیارییەی كە درەنگ دەكات، خراپ بووە.

# لە وتەكانی ( سویسرا )

* هاوسێ لە ڕێوی زیاتر چاودێری دەكا.

* تەنانەت مێرووولەش سێبەری هەیە.

* باش وایە لاڵ بیت نەك درۆزن.

* گورگی بێ ددان، قەشمەرجاڕی سەگەكانە.

* دار كەیف خۆش نابێ بە سێوەكانی.

* چاو باوەڕی بە خۆیەتی، گوێ بە قسەی خەڵك باوەڕ دەكا.

* ئەو ئیشەی بە زووترین كات تەواو دەبێ، دوو ئیشە.

* ئەگەر خەڵكی مەدحی یەكێكیان كرد كەم كەس باوەڕی پێدەكا، ئەگەر زەمیان كرد هەموو كەس باوەڕی پێدەكا.

* هەر كاتێ مێرووولە باڵی لێ پەیدابوو، سەری لەناو دەچێ.

* ورچ ڕاو دەكەی، پێستەكەی مەفرۆشە.

* ئەو كەسە خێری تێدا نییە، ئەگەر خێری تۆی وەكو خێری خۆی نەویست.

* پاش نان خواردن كەوچك سوودی چییە.

* زمان خراپترین پارچە گۆشتە لە جیهاندا.

* ئەوەیماڵی هاوسێكەی بلەرزێنێ، ماڵەكەی خۆی لار دەبێتەوە.

* ئەوەی لە هەڵەكەی ناگەڕێتەوە، دوو جار هەڵەی كردووە.

* ئامۆژگاریی دەرمانێكی تاڵە، چەندە تاڵیەكەی زیاد بكا، سوودی زۆر دەبێ.

* دەم وچاوی بەبزە نیوەی میوانداریيە.

* دووای ئامۆژگارییەكە، بەختیار دەبێ.

* پێش ئەوەی خواردن بە میوانەكەت بدەی، بە ڕووخۆشی پێشوازی لێ بكە.

* هەندێ جار دەبێ وا بڵێین، شێلم كاڵەكە.

* ئەگەر ویستت لە مرۆڤێك تێبگەی با قسە بكا.

* ئەگەر میوانی یەکێك بووی، چاوت بکەرەوە و دەمت داخە.
* ئەگەر خوا گیانت لێ نەسێنێ، هیچ کەس ناتوانێ لێت بسێنێ.
* وشە کورتە بالآیە، نموونە (امثال) مێردەزمەیە.
* ئەوەی بە ڕۆژ نابریسکێتەوە، بە شەو دەبریسکێتەوە.
* پێویستە هەمیشە پارچە نان بە سەگی شەڕ فرۆش بدەی.
* قسە وەك مێشهەنگ وایە، هەنگوینی هەیە و دەرزیشی هەیە.
* (گا) بە شاخەکانی دەگیرێت و پیاو بە قسە و ژن بە کراسەکەی.
* ئەو ژنەی حەزی لە جل شۆرینە، هیچی کەم نییە تەنها ئاو نەبێت.

# لە وتەکانی (سۆماڵ)

* بە یەك دەس گوریس با نادرێت.

* شەڕ لە نێوان خێزاندا دووکەڵ دەکا، بەڵام هەرگیز ئاگر ناکاتەوە.

* (با) داری بچووك ناشکێنێ.

* بەختیاری هەموو خەڵك، هەمیشە تاڵیشی تێدا دەبێ.

* چاو تەماشا دەکات، بەڵام نابات.

* هیچ شتێ لە ماڵی مرۆڤ جوانتر نییە.

* هەرگیز بە تەمای پارەیەك مەبە لە گیرفانی یەکێکی ترا بێ.

* هیچ کەس بزن لە ئەرزی پڵنگ بەخێو ناکات.

* ئەگەر بە تەنها بڕۆیت کێ پێشت دەکەوێ.

* ئەوەی سکی گەورەی هەبوو، برادەری نابێ.

* ئەوی لەگەڵ سەگدا بخەوێ لەگەڵ کێچدا هەڵدەسێ.

* ئەگەر کراسە کۆنەت بە کەڵك نەهات، کراسی تازەتیش نابێ.

* حوشترمل (نعامە) دەفڕێ دەڵێ من حوشترم، ئەگەر شتێکیش هەڵگرێ دەڵێ: من چۆلەکەم.

* ئەسپ لە برسا دەتۆپێ، ئەگەر سایس زۆر بوو.

* پیاو، ئەوەی لە دوایدا دەمرێ دڵێتی، بەڵام ژن زمانێتی.

* لە شێر ڕزگارت بوو، تەماع کردنی ڕاوی مەکە.

# لە وتەکانی ( چین )

- بیری پیس و بۆگەن، دەگەنێ تاکو دەبێتە ئیشی پیس و بۆگەن.
- یەك هەڵەیەك دوور نییە، هەموو ژیان بە زنجیرەیە خەفەت بکات.
- ئەگەر ئەمڕۆ کورتە ساڵ وانیە.
- بە پرسیار مرۆڤ فێر دەبێ.
- لەو ماڵەی مریشك دەوری کەڵەشێر دەبینێ، بەرەو خراپە دەڕوات.
- لە خەفەتەکانت رزگاربە بیخەرە گیرفانە دڕاوەکەتەوە.
- پێویستی رێپیشاندەرێکی باشە.
- خۆشەویستی رووەکێکی ماڵە هەموو رۆژێ پێویستی بە ئاودانە.
- رێوی خەوتوو، لە خەویدا مریشکەکان دەژمێرێ.
- خواردنەوە دڵۆپە وەرگرە، زانیستیش کەم کەم.
- باشترین ئاوێنە کە خۆتی تێدا دەبینی، ئیشەکانتە.
- لێگەڕێ با سەد گوڵ بکرێتەوە.
- مێش بەدەمی داخراوەوە ناڕوات.
- جوانی پیاو ئەدەبەکەیەتی، جوانی ژنیش زیرەکیەتی.
- میوانی رۆژانە، دزی چێشتخانەیە.
- رۆژێك بە بێ خەفەت بە سەر بەرە، ئەو رۆژە رۆژێکی هەمیشەییە.
- پارە قسەی کرد هەموو شتێ بێدەنگ دەبێ.
- خوێندنەو بە بێ بیرکردنەوە، وەکو خواردنێك هەزم نەکرێت وایە.
- پێش ئەوەی داوا بکەیت وەزعی جیهان بگۆڕیت، سێ جار تەماشای ماڵەکەت بکە.
- درۆ نەخۆشییە، راست گۆیی چاك بوونەوەیە.

- چۆن لە سەر شاخ ناوەستێ، رق و کینە لە دڵی گەورەدا ناوەستێ.
- زۆر چار ژنان بیرۆکەی باشمان دەدەنێ، بەڵام ناهێڵن جێبەجێی بکەین.
- ماسیم مەدەرێ، بەڵام فێرم بکە چۆن راوی بکەم.
- دانەکانت دەرمەخە، ئەو کاتە نەبێ کە توانای قەپاڵ گرتنت هەیە.
- ژنان لە قسە کردن ناوەستن، ئەو کاتە نەبی کە دەگرین.
- زمانی ژنان شمشێریانە، لەبەر ئەوە هەمیشە بەکاری دەهێنن نەوەك ژەنگ بگرێ.
- هەموو گوڵێك میوەی نیە.
- هیچ زنێك دانی خێر بە ژنێکی تردا نانێت.
- زانست کانگایە، دوای هاورێکەی دەکەوێت بۆ کوێ بڕوات.
- ئەوەی بتوانێ تیر بهاوێ، کەواتە بە توندی رایکێشە.
- ئەوی سوار پشتی پڵنگ بوو، دۆش دادەمێنێ چۆن دابەزێ.
- ئەوی پیتێکم فێربکا باوکمە تا کۆتایی ژیانم.
- ئەوی (با) بنێژێ زریان دەدورێتەوە.
- ئەوەی گوێ بە سبەی نەدا، خەفەت بەرانگیری دەبێ.
- منداڵەکەت فێربکە لە ژووری دانیشتن چۆن دابنیشێ وژنەکەت لە سەر سەرین.
- زێڕ ماڵی رەزیل نییە، رەزیل ماڵی زێڕە.
- ئەوەی نان بە سەگ نەدات بەدز دەدات.
- هەر کاتێ چێشت لێنەرەکان دەستیان بە بگرە و بەردەکرد چێشتەکان دەسوتێن.
- حوکم بە سەر ئەسپەکە مەدە بەزینەکەی.
- ئەگەر ماسیت بە کورەکەت دا یەك رۆژ بیدەرێ، ئەگەر فێری راوەماسیت کرد، بەدرێژایی تەمەنی نانی بدەری٧.

- هەموو کانزاکانی جیهان ناگاتە ئافرەتێکی داوێن پاك.
- مۆمێکی بچوك داگیرسێنە لەوە باشترە نەفرەت لە تاریکی بکەیت.
- بەخشەندە لە خاوەنەکەی دەکا.
- چۆن جۆگەلەکان بۆ دەریا دەڕۆن، بەخشەندەش بۆ خاوەنی دەگەڕێتەوە.
- لە کاتی بەختیاریت داماوەکانت بە بیر بێتەوە.
- حەسوودی دەنکە قوم لە چاویایەتی.
- ئاقڵ لە سەر بیروباوەڕی قسە دەکا، ژیر لە سەر ئیشەکانی، بازاریی لە سەر خواردنی.
- ئەگەر ئاسمان خورمای باران دەمت بکەرەوە.
- کەوانەکەت ئامادە بکە، بەڵام تیرەکەت دوواخە.
- بە ئاگر زێڕ تاقی دەکرێتەوە و پیاویش بە زێڕ.
- ناتوانین هەڵەکانمان ببینین ن تەنها بە چاوی خەڵکی نەبیٚ.
- بە ئاسانی بە مرۆڤ دەبین، بەڵام بە گران بە پیاو دەبین.
- تینوو خەو بە ئاوەوە دەبینیٚ.
- دوو زین بە یەکجار لە سەر ئەسپ دانانرێت.
- تفەنگ هەڵمەگرە بۆ ئەوەی پەپولەیەك بکوژی.
- ئەو کەسەی ماڵ بدزیٚ دادطا دةکریَ، نةوةی وولآتی بطریَ دةیخةنة سةر تةخت.

# لە وتەکانی ( فەرەنسا )

- منداڵەکانت بە دڵت خۆشیانت بوێ، فێریانکە بە دەستت.
- خۆر کە دەرچوو مانگە شەو ئیشی نامێنێ.
- ئەگەر پەتێکت دایە دەستی کوڕەکەت، لۆمەی مەکە ئەگەر دەستی بەستەوە.
- ئەگەر لە بەد بەختی دەترسی، بەختەوەریت دەست ناکەوێ.
- قازانج ناژی بەبێ خەسارە.
- لە هاوسێکانت بپرسە ئەوسا خانوو بکڕە.
- پرس بە خەڵکی بکەو خۆت کۆتایی بە ئیشەکە بهێنە.
- زۆر ئاسانە بیست سەگ تێر بکەی نەك دوو چاو.
- دوژمنی دوژمنەکەم، دۆستمە.
- رێوی وا تێدەگا خەڵکیش وەکو ئەو مریشك دەخوا.
- خزمەتکاری ئەمین، سامانێکە بۆ ئەو کەسەی لە لایەتی.
- باش وایە دووای خەیت نەك لە بیرت بچێ.
- لە درۆزن بگەڕێ با درۆ بکا، تاکو دێتە سەر راست ووتن.
- تام هەنگوین لە دەم نەخۆشا تاڵە.
- چاوی کز چاوی تیژە.
- چاوی برسی دوور دەبینێ.
- بۆ ژن بگەڕێ.
- ماسییەك وتی: شتی زۆرم پێیە، بەڵام دەمم پڕە لە ئاو.
- هەموو مرۆڤێك ئەو دارەی خۆش دەوێ کە سێبەری بۆ بکا.
- جێی خەوتنت چۆن بوو وا دەخەویت.
- سێوێك ئەگەر کاڵ بوو مەی بڕە، کە گەیشت خۆی دەکەوێتە خوارەوە.
- لە راست وتن جوانتر نیە.

- هەژار ئەو كەسەیە داوی زیاتر دەكا.
- كیسەی بەتاڵ بازاری نیە.
- ژنان حەفتاو حەوت رایان هەیە لە یەك كاتدا.
- ئەوی چاو نابینێ دڵ ئارەزووی لە سەر نیە.
- ئەوەی هەمووان دەیڵێن بێگومان ئەوە راستە.
- پارێزەری زیرەك هاوسێیەكی خراپە.
- ئەوەی زۆری هەیە، یا فێڵی لێت كردووە، یا دەیەوێ فێڵت لێ بكا.
- خەڵك بەرد فڕێ نادا، تەنها بە سەر ئەو دارە نەبێ كە بەر دەگرێ.
- رەحم كردن لە عەدالەت باشترە.
- دوو كەڵەشێر بە ئاشتی دەژیان تا كو مریشكێك دەركەوت.
- گوێ، رێگەیەكە بۆ دڵ.
- پیاوان لە دڵداریدا دەمرن، ژنان زیندوو دەبنەوە.
- سەر بە دیواردا بدەین تەنها سەر ئێشەمان توش دەبێ.
- باوكی دەست رۆ كوڕێكی خەرج كەری دەبێ.
- ئەوەی هەمیشە كار دەكات تاجر نیە.
- پیاو هەمیشە بۆ دڵداری یەكەم دەگەڕێتەوە.
- گرانی تەنها لە هەنگاوی یەكەم دایە.
- كچی جوان مارەییەكەی لە ناوچەوانیدایە.
- نهێنی سێ كەس، نهێنی هەموانە.
- مەرج نییە هەموو راستیەك بوترێ.
- هیچ شتێك وەك ئیشی خێر زوو پیر نابێ.
- ناخۆشي لێقەومانی هەندێك، خۆشی بە هەندێكی تر دەدات.

- برادەرێکی نزیك، لە خەزوورێکی دوور باشترە.
- ئەوەی بە هەمووکەس دەدا، ئەوە بەکەس نادا.
- ئەوەی بەرداخ بشکێنیّ دەبیّ پارەکەی بدات.
- بە تۆپینی گورگ، ژیانی مەڕ ئاسوودەیە.
- برسێتی، گورگ لە دارستان دەردەکا.
- هەژاریی عەیب نیە.
- نەزانی دایکی هەموو خراپەیەکە.
- ئەوی هیچ نازانیّ گومانیش لە هیچ ناکات.
- پێویستە بادەم بشکێنی تا ناوەکەی بخۆی.
- ئیسراحەت کردن دز دروست دەکا.
- تەنهایی باشترە لە هاوڕێی خراپ.
- پیرێتی دۆزەخی ژنە.
- پوشێك لە دوای پوشێك، پاساری هێلانەکەی دروست دەکات.
- پیاو کە لاواز بو ژن بەهێز دەبیّ.
- هیچ دەرمانێك نیە دژی مردن.
- سکی بەتالّ گوێچکەی نیە.
- کەمێك باشترە لەوەی هیچ نەبیّ.
- قسە پێدان ئاسانترە لە ئیش.
- ئەگەر هێزمان هەبوو، جێگەی ئەقلّ نیە.
- ئەوەی پاشا دەیەوێت، یاساش دەیەوێت.
- پێویستە پێش ئەوەی قسە بکەی، حەوت جار زمانت بجولێنی.
- رێککەوتنێکی خراپ بگرە و بەردەیەکی دوورو درێژ دروست دەکات.
- پشت بەکەرەکەت ببەستە لە ئەسپی هاوسێکەت باشترە.

- یارمەتی خۆت بدە خوا یارمەتیت دەدا.
- خۆشەویستی دڵداری چرکەیە، بەڵام رەش بینی خۆشەویستی بە درێژایی تەمەنە.
- کاتێ برسێتی لە دەرگات دەدا، خۆشەویستی لە پەنجەرەکەوە دەردەچێ.
- راستی لە دەمی منداڵەوە دەردەچێ.
- بۆشایی مە ڕۆ ئەگەر بانگ نەکراوی.
- گوێ نەدانێکی کەم و بچووك، ئازارێکی زۆر دروست دەکات.
- هەوەڵ دەست پێکردنێکی باش، کۆتاییەکی باشی دەبێ.
- بگرە و بەردە نییە لە زەوق ولە رەنگدا.
- ئەوی لە منداڵییەوە فێری دبین، تا مردن لە بیرمان ناچێ.
- پەلە پەل سوودی نیە گرنگ ئەوەیە لە کاتی خۆیدا برۆی.

# لە وتەکانی (کەنەدا)

- دوو کەس یەك ئیشیان هەبێت هەرگیز ڕێك ناکەون.
- زۆر ئاواز لە سەر کەمانێکی کۆن لێدەدرێت.
- ئەوەی خەڵکی دەیکا تۆش بیکە، ئەو کاتە خەڵکی بە باشی باست دەکەن.
- منداڵ وبێئەقڵ هەمیشە ڕاست گۆن.
- ئەوەی زانا بێت لە موجامەلە کردندا، زیرەك دەبێت لە هەڵخەڵەتاندا.
- درەوی خراپ هەرگیز داسی باشی نەدیوە.
- گیای خراپ زوو دەڕوێ.
- ئەگەر بەرد لە جەڕەی دا، یا جەڕە لە بەدی دا، ئیشەکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا خراپە بۆ جەڕەکە.
- جنێو وەکو مریشکە بۆ جێی خۆی دەگەڕێتەوە.
- شوورەی باش هاوسێیەکی باش دروست دەکات.
- ناودارێتی باش زوو لە ناو دەچێ، لەوەی کە پەیدا دەبێ.
- میوانێکی هەمیشەیی، سێبەرێکی قورسە.
- ئاشەکانی خوا لەسەر خۆی دەهاڕێ.
- کەمی بەردەوام جزدان پڕ پارە دەکات.
- هەموو پشیلەیەك لە تارێکیدا ڕەشە.
- هەموو ئەسپێك وا هەست دەکا، ئەو بارەی رایدەکێشی گرانە.
- ماڵەکەت مەسووتێنە لە بەر ئەوەی مشکەکە دەربکەی.
- تا ئازارت پێ نەگەیشت هاوار مەکە.
- ناتوانی سەگی پیر فێر فێڵی تازە بکەی.
- ئەوەی لە کونی دەرگا کوڵ بگرێ، دوور نییە توشی شتێ بێ پێی رازی نەبێ.
- ئەوەی دەست بەقیرەوە بدات دەستی پیس دەبێت.

# لە وتەكانی (مالیزیا)

- ئەوەی لە جزدانەكەیدا پارەی نەبوو، بازمانی وەكو ئاورێشم بێ.
- یەكێك هەڵەیەك بكا وادەزانێ هەمووكەسێ باسی ئەو هەڵەیە دەكەن.
- شاری گەورە جیاوازییەكی گەورەیە.
- نوكتەی دەوڵەمەند هەمیشە پێكەنینە.
- ئەوانەی یارمەتی خۆیان دەدەن خواش یارمەتیان دەدات.
- ئەگەر ناتوانی بزەت هەبێ لە كۆگادا مەبە فرۆشیار.
- باوكی بەرەحم چرایە بۆ نەوەكان.
- ئەگەر شەڕ وازی لێت نەهێنا وازی لێ بێنە.
- ژیان نرخی لە مردنەوە وەردەگرێ.
- خوێن بە خوێن ناشۆردرێت، بەڵكو بە ئاو دەشۆردرێت.
- ئەگەر براكان بەیەكەوە ئیش بكەن، كێوەكان بەزێڕ دەبن.
- بەخشین لە گەڵ بزەدا دوو جار بەخشینە.
- لە نرخدا فێڵی لێ كردم بەڵام لە قوماشەكەدا ناتوانێ.
- هەموو هەورێكی رەش ناوەوەی سپییە.
- زمان لە بەر ئەوەی نەرمە بەرگری دەكا، دانیش لە بەر ئەوەی رەقە دەشكێ.
- ئەوەی هەوڵدەدا تۆڵە وەرگرێ لەبەر ئیهانەیەكی بچووك، توشی ئیهانەیەكی گەورەتر دەبێ.
- حەسوود هەموو شتێك دەبینێ لە لایەنی خەڵكەوە بەباشی بزانێ بەڵام لە لای خۆیەوە بەڕەشی.
- ئەرزەكە بكێڵە نامووست دەپارێزێ.
- تفەنگی بێ فیشەك دوو كەس دەترسێنێ.
- شێری مردوو دەدۆشێ.

- بێوەژن ماینێکە سوارەکەی بە سەر ئەرز خستووە.
- لە ڕۆژی تەنگانەداو ناخۆشیدا شیر تاڵە.
- دار هەرچەندە ڕەگەکانی زۆربێ و بە هێزبێت، زریان دەیجوڵێنێ.
- لە کوێ دەریا هەبوو، قورسان (القرصان) هەیە.
- لە هەر جێگایەك شەکر هەبوو، مێرووله هەیە.
- پاڵتۆی کەس لەبەر مەکە، بۆ پێوەری لەشت.
- لە خەڵکیەوە خراپەی خۆمان دەزانین.

# لە وتەکانی (نەیجیریا)

- ئەگەر سەگ برسی بوو چاو چۆن دەخەوێ.
- کەڕ ئەگەر گوێی لە دەنگی هەورە تریشقە نەبێ، بەڵام تنۆکێ باران دەبینێ.
- ئەگەر بەڵێنیان دایتێ بۆ دیاریەك، مەڕۆ بۆ وەرگرگرتنی بە جانتایەکی گەورەوە.
- ئەوی لە دایك بوو بە سکە خشکێبڕوات، ناتوانێ بفرێ.
- کۆنترین دار، خۆشترین میوەت دەداتێ.
- مرۆڤ بەزیرەکی لە دایك نابێ، بەزیرەك دەبێت ئەگەر گوێ لە ئامۆژگاری خەڵکی بگرێت
- ئەو گەڵایانەی کە لە دار دەکەون، بۆ دارەکە ناگەڕێنەوە.
- دەتوانی پەڵەیەك لە لەشتا بشاریتەوە، بەڵام ناتوانی عەیبێك لە رەوشتا بشاریتەوە.
- تەنانەت ئەگەر مەیمون پێست ئاسکی لە بەر کرد بە مەیمونی دەمرێت.
- میوانی ژێر چاوی دەکاتەوە نەك دەمی.
- زەمان وەکو پاسارییە، بەدەست نەیگری دەفڕێ.
- شتی دزراو خۆشی بە دڵ نادات.
- شەیتانێکی ناسراو، لەقەشەیەکی نەناسراو باشترە.
- یەك فلس بە کەس مەدە، ئەگەر نەیزانی چۆنی خەرج دەکا.
- گران نییە تۆش وەکو خەڵکی بکەی، چونکە خوا تۆشی وەکو ئەوان خولقاندووە.
- هەر کاتێ بینیت سەگ دەوڵەمەندە، پێی بڵێ شێری گەورەم.
- لە بەلەمێکی یەکێ ترا بوویت، گۆرانی بە دڵی خاوەنەکەی بڵێ.
- ئەوی مار پێوەی بدا لە کرمیش دەترسی.
- ئەوەی بۆ ماڵێ ڕۆیشت، پێویستە عەیبەکانی لە بەر دەرگا بەجێ بهێڵێت.

- کێ زوو بە کانیەکە گەیشت، ئاوی پاك دەخواتەوە.
- قەلە رەش حەز لە هەنجیر دەکات، بەڵام خۆی ماندوو ناکات بە ناشتنی.
- ئەوی ئیشێك دەزانی، قەڵایەکی هەیە.
- تیکە (پاروو) لە ناو بەردا دەردەکا.

# لە وتەکانی (هند)

- هەموو ڕۆژێك چاوت بە دوو کەسەوە بێت، ژنەکەت و قفڵی دەرگاکەت.
- دواترین شت مرۆڤ وونی دەکا میوایە.
- ئەگەر کوڕەکەت باڵا کورت بوو، با هەنگاوێ پێشت بکەوێ.
- زۆر گوێ بگرە و کەم قسە بکە.
- ئەگەر بە سواڵکەر هیچت نەدا، هیچ شتێکی مەدڕە.
- دوو کەس بە تۆی ووت کوێری، هەردوو چاوت بنوقێنە.
- تەماشاکەری دوور، دوورە لە خەتەر.
- تەماع نەما بەختیار دەبی.
- ڕێوی بە ڕێوی ڕاو دەکرێ.
- جوانە مرۆڤ لە پێناو نیشتما نەکەیدا بمرێ. بەڵام جوانترین ئەوەیە لە پێناویدا بژی.
- تەنانەت هەتاو (خۆر) پەڵەی تێدایە.
- تەنانەت لە ناو قوڕدا زێڕ بریقەی هەیە.
- ئاگادار بوونی زۆر، سەر لە ترسناك ڕزگار دەکا.
- ئاگاداری ئەو دەرگایانە بەکە کلیلیان زۆرە.
- باش وایە بە کەوچکی شکاو خواردن بخۆی، نەوەك چاوەڕێی کەوچکی ساغ بکەیت.
- لە نیوەی ڕێگا بگەڕێتەوە باشترە لەوەی ڕێگا ون بکەیت.
- سرکەی پاك تامی خۆشترە لە هەنگوینی ترشاو.
- کەڵەشێر سوود لە برادەری ڕێوی وەرناگرێ.
- دوور نیە ئەگەر وتت فیلێکم کوشتووە، بەڵام ڕاست ناکەیت ئەگەر وتت لە سەر شانم هەڵم گرتووە.

- چاو پەنجەرەیە لەوێوە تەماشای دڵ دەکا.
- ئیش کردن وەسفی خۆی دەکا.
- کتێبی باش برادەری باشە.
- تەمەڵ، تەنانەت لە ئیسراحەتیش ماندووە.
- هیچ شتێك وەکو زەمان نییە لە تۆڵە سەندنەوە.
- ئەوەی وەسفی رابردوو دەکا ، زەمی ئێستا دەکا.
- ئەوەی بە چاوی خەڵکی تەماشا بکا، هەڵخەڵەتاوە.
- ئەوەی دەرزییەك بدزێ بزمارێکیش دەدزێ.
- پێویستە وەڵامی شەیتان وەك شەیتان بدەیتەوە.
- نە خوێ و نە ئامۆژگاری پێشکەش مەکە ئەگەر داوات لێ نەکرا.
- دووپشك لە ئاگر دەربکەی پێتەوە دەدا.
- ئەوی بە رێگای راستا بروا وون نابێ.
- خوا یەکەو بەڵام ناوی زۆرە.
- بە گوێرەی هەموو دایکێك، خۆر بۆ منداڵەکەی ئەو دەدرەوشێتەوە.
- هەموو شتێك دەکڕدرێ، تەنها دایك و باوك نەبێ.
- لە یەك خشان ئافرەت و مراوی لوس دەکا.
- دەوڵەمەندی رەزیل بۆ دزو پادشاکان دەگەڕێتەوە.
- ژن دەرگای سەرەکییە بۆ دۆزەخ.
- هەر کەسێ فووی لە شەیپوور کرد مەرج نییە راوچی بێت.

# لە وتەكانی ( هۆڵەندا )

- ئەگەر پشیلەت بەند كرد بە شێر دەبێت.
- زمانت گرێ بدە ئەگینا، گرێ دەدرێی.
- درۆ قاچی كورتە، پاشان برادەرەكەت پێشی دەكەوێ.
- رزگار بوونت لە پێڵاوی كۆن ئاسانە، بەڵام رەوشتی كۆن زەحمەتە.
- گەڕانەوە بە پەلە باشترە، لە سەركەوتن لێدان.
- خۆشەویستی برادەرێكە ئاگری تێ بەربووە.
- تەنانەت پێڵاوی تازەش كۆن دەبێ.
- هاوڕێتی، رێگا كورت دەكاتەوە.
- ژن هێنان پێویستە، دووەم جار بێ ئەقڵییە، سێیەم جار شێتییە.
- بچكۆلە بە درێژایی زەمان گەورە دەبێ.
- ئەوی چاوی لە زێڕ بێت، چاوی لە دەس دەدات.
- ئەوەی دیارییەكی بەدەستەوە بوو، دەرگا دەبینێ كراوەیە.
- ئەوەی چاكەی هەیە، خراپەشی هەیە.
- باشترین ئاسنگەر جارو بار لە پەنجەی خۆی دەدا.
- رێوی كە پیر بوو، قەلە ڕەش تووكەكانی لێدەكاتەوە.
- خەسوو لە بیری چووە، رۆژێك خۆشی بووك بووە.
- كاتێ باران وەستایەوە، چەترمان لە بیر نەچێ.

# لە وتەکانی (یابان)

- حەوت ساڵ بگەڕێ ئەوسا باوڕ بکە.
- ئەگەر کوێرێ دەستی کوێرێکی کەی گرت، بێ گومان هەردووکیان پێکەوە دەکەونە چاڵەوە.
- درۆ دەڕوا بەڵام بە یەك قاچ.
- کێڵگەی گەورە وەسف بکە، کێڵگەیەك بچووك دروست بکە.
- ڕۆژان سجیلاتی تەمەنە، سجیلاتەکان بە باشترین ئیش پڕ بکەرەوە.
- دووری جوانی بە دیمەن دەدا.
- گەش بین بە باشترین شت، بەڵام ئامادەش بە بۆ خراپی.
- میوەی گەییو چاوەڕێی ئەوە ناکا سبەی بیکەیتەوە.
- هەموو لە پاش چاك بوونەوە پزیشکە.
- جوان ئەوەیە کردارەکانی جوان بێت.
- تەنانەت گەورەکان، گەورەیان هەیە، ئەویش خوایە.
- هەواڵی خراپ بە پەلە بلاو دەبێتەوە.
- دونیا مامۆستایەکی راستە، بەڵام کرێکەی زۆرە.
- ئەو دارەی بەر ئەگرێ بەردی تێناگیرێ.
- ساڵێ بیر بکەرەوە، لە چرکەیەدا قسە بکە.
- چەند دڵۆپە یەکی ئاوی کەم، دوور نییە جۆگەلەیەك دروست بکات.
- هەڕەشە مەدە، بەوەی کە نەتوانی جێیەجێی بکەی.
- (با) چیی، بە چیا دەکا.
- ئەوەی ژنی هێنابێ خەفەتی زۆرە، گەنجیش زیاتر.
- ئەوی لە خوارەوە بێت لە کەوتن ناترسێ.
- ئەوەی (بندق) بخوات، دەبێ تۆکڵەکەی بشکێنێ.

- ژنان پیاوان دەناسن، بەڵام کەس ژنان ناناسیٚ، تەنها ژن ژن دەناسیٚ.
- هەڵبژاردنی ئاواز نابیٚ، تەنها ئەو کەسانە نەبیٚ کە پارە بە کەمان ژەن دەدەن.
- ئەسپ لە ماڵی دەوڵەمەند بکڕە و ژنیش و لە ماڵی هەژار بهێنە.
- خۆشەویستی گاڵتەی بە وەستای قفلٚ دروست کەر دێت.
- هیچ سوودی نییە، دەس بە گیرفانی بەتاڵ بخەیت.
- ئەگەر لە سەر چاوەی ئاوی (بۆستینۆ) دەگەڕێی، بە تنۆکە لە سەر قەوزە دەیۆزیتەوە.
- کاری نەکردەیە راست بوەستێت، ئەگەر جار جار نەچەمێتەوە.
- کاتیٚ باران وەستایەوە، چەتریان لە بیر دەچێتەوە.
- وەسف کردن سەرەتای جنیودانتە.
- بەختیاری تەندروستیەکی باشە، بیرکردنەوەیەکی خراپە.
- گەورەترین شاخ پێی لە ناو شیودایە.
- ئەو ئیشەی بە سەرەتا دەدریٚ، لە پەرێك سوکترە، بەلام لە شاخیٚ قورس ترە.
- ژنی ناشرین لە ژن دەترسیٚ.
- گوڵەکان زۆرن، میوەکان کەمن.
- ژیرەکان هەندیٚ جار دەچەمێنەوە، وەکو ئاو

# لە وتەکانی (یۆنان)

- لە پرسیار کردنی حوکم بدە نەك لە وەڵامەکەی.
- ئەگەر ئاوت لە گەڵ خۆڵدا تێکەڵ کرد، هیچ شتێك نادۆزێتەوە بیخۆیتەوە.
- ئەگەر ناتەوێ پەنجەت ببڕێتەوە، پەنجەت لە بەردەم داس دامەنێ.
- بەرز ترین پلەی بێ ئەقڵی، ئەوەیە وا باوڕ بکەی کە ئاقڵی.
- ئەگەر بە قسەی دایکت نەکەی، بە قسەی باوە ژنت دەکەی.
- سك پڕ بوو حەزی لە ئیش نیە.
- هێلکەی پیس لە مریشکی نەخۆشەوەیە.
- ئەگەر هەموو شتێك بگری هەموو شتێکت لە دەست دەچێ.
- برسێتی هیچ شتێك لە یەك ناکاتەوە.
- تەنانەت دەرگای بەردین ژێر دەیکاتەوە.
- لە کوێ هەنگ نەبێ لەوێ هەنگوین نیە.
- گورگ تاوان بارە، ئەگەر تاوان بار بێ یان نا.
- بێ بەخت ئەو کەسەیە بە هیوا بژی.
- هەنگوینی زۆر تاڵە.
- جارو بار لە ناو قوڕدا مرواری دەدۆزیتەوە.
- برادەریەك رووی هەیە، درۆزن هەزار رووی هەیە.
- جیاوازی جییە لە نێوان برادەرێکتا کە ئازارت دەداو لە نێوان دوژمنێکتا.
- ئەوەی برسی بوو رێگای لێ مەگرە.
- دادوەر خۆی بە هەڵە نازانێ مادام لە حوکم دایە.
- ژن یا دەبێ حکوم بکا یان دەبێ خزمەت بکرێ.
- لە نینۆکەکانی، شێر دەناسرێ.
- کورسی پێشەوەی کەشتی ترسناکە.

- نەفسی خۆت دوور نییە گەورەترین دوژمنت و خێر بێت بۆ برادەرەکانت.
- چاوێ سوور بوو ئاوسا، رووناکی سوودی بۆی نییە.
- ئەوەی ئازارمان بدات لێی خۆش دەبین، بەلام لە بیرمان ناچێتەوە.
- هیوا، خواردنی دوور خراوەکانە.
- دەستێك دەستەکەی تر دەشوا، هەردوو دەستەکە دەم وچاو دەشۆن.
- ئەو خەفەتەی هۆی ئازاری یەکێ ترە، لایە لایە یە.
- بەشی خراپ، ئەوە زۆرە.
- حەسوودی لەوە باشترە خەلکی دلی پێت بسوتێ.
- شێرە کە لە قەفەسدایە، بەلام نابێتە کۆیلەی ئەوەی کە خواردنی دەداتێ.
- زانیینی گوێ گرتن، هونەرە.
- پاکی نیوەی دەولەمەندییە.
- خۆت بناسە شتێکی چاکە، یەکێکی کە بناسی باشتر.
- ریش، بە فەیلەسوفت ناکات.
- زۆر بخەوی، ماندوو دەبێ.
- ژن ئازارێکی هەمیشەییە.
- لە لێوی ئافرەتەوە قسەی چاك دەردەچێ.
- قسەی زۆر بەلگەی هەژاریە.
- ئەوەی باوەڕ بە ئافرەت دەکا، باوەڕ بە دزدەکا.
- قسە، دیوار دروست ناکات.
- هەر مۆم کوژایەوە، هەموو ژنان باوێشك دەدەن.
- سروشت دوو گوێ و یەك زمانی داوە پێمان، بۆ زیاتر بیستن و کەمتر قسە کردن.
- خوا لەگەلێ ئەو کەسەدایە کە ئیش دەکات.

- سەركەوتن جوانە، لەوە جوانتر، بزانی چۆن بە كاری بێنی.
- كەچەڵ بە شەپقەكەیەوە دەنازێ شێتیش بە هێزی.
- ژن بە بێ مێرد ئەسپێكە بە بێ لغاو.
- روداوێك ناخۆشی گشتی بێت، بە ئاسانی خەڵكی ئەو ناخۆشییە هەڵدەگرن.
- ئەرز كێڵان لە وڵاتەكەتدا باشترە لە پارە ژماردن لە هەندەران.

# لە وتەکانی (عەرەب)

- نیوەڕۆ دەیخۆم، پێش ئەوەی ئەو ئێوارە بمخوات.
- کرێی بەرگ دوورو لە لای خۆیەتی.
- ئێمە دوو بووین سێیەم لە کوێ وە هات.
- ئیشیان بە یهودییەك کەوت، ووتی: ئەمڕۆ جەژنمانە.
- ئێمە کوڕی ئەمڕۆین.
- ئەمڕۆ زیندووم بکەرەوە سبەی بکوژە.
- وەرگرتن خۆشە پێوان ناخۆشە.
- لە شارەزا بپرسە لە پزیشك مەبرسە.
- فرێی بدە سەربان، ئەگەر قسمەتت بێ ناڕوات.
- لێرەوە گوێ بگرە، لە گوی یەکەی ترەوە دەری بکە.
- هاوسێکەت پێش خانۆکەت بکڕە.
- لە کێ بپرسم، هەموو خەڵکی بریندارن.
- سەبر بکە لە سەر هاوسێ خراپەکەت، یا بار دەکاو دەڕوا یا تووش بەڵایەك دەبێ وتۆش رزگار دەبێ.
- ئەوانەی ئاقڵن، بە ئاسوودەیی دەژین.
- ئەسڵی شەڕ لە کاری خێرەوەیە.
- ئیشەکەم بە دەستی خۆم دەکەم، بە سەگ ناڵێم گەورەم.
- کوێرێ بە کوێرێکی ووت: بەرداخی کوێر تاڵە، کوێرەکەی کە ووتی: دەقە (نص) کەی لای منە.
- کوێر دەڵێ: بە چاوی خۆم بینیم.
- نهێنی خۆت بپارێزە هەموو شتێك دەپارێزی.
- بە پارە کچی باشا بووکتە.

- نه مریشكی قەڵەوم بدەرێ، نەخەفەتم بدەرێ شەو نەخەوم.
- تاجر كه ئیفلاسی كرد دەفتەری كۆن دەگەڕێ.
- له پشیله بدەی چرنووكت لێ دەگرێ.
- دۆزخ باوەشێنی تێدانییه.
- مێردی دووژنه هەموو شەوێ زاوایه.
- هەستت بەزەرەر كردن كرد قازانجته.
- قالۆنچەیەك،بەچكەكەی له سەر دیوارێك بینی، ووتی ئەوه مرواریيه.
- نهێنی لـه نێـوان دوو كەسـدا لـه نـاو دۆڵابدایـه، لـه نێـوان سـێ كەسـدا دەرگـای كردەوه دەرچوو.
- زیرەك به دەست خۆی ئیشەكانی دەكا، تەمەڵیش داوا له هاوسێكەی دەكا، ئیشەكەی بۆ جێبەجێ بكات.
- ئەوی داوای سامان و ماڵ دەكا و نییەتی، وەكو ئەوه وایه داوای ئاو له بیر بكا.
- لێدانی مردوو حەرامه.
- دووپشك خوشكی ماره.
- جەژنی بچكۆڵه پیش جەژنی گەوره.
- دەوڵەمەنددركێ بەدەستیا چوو ووتیان: خەتەره، هەزار مار پێوەی دا ووتیان: بێدەنگ به ئەوه چیه.
- گسك و قابقاب بوونه گەورەی ئێمه.
- نزیكی ئاسنگەر بیت پرشنگی ئاگرت بەر دەكەوێ.
- مەڕی سەر براو پێستەكەی لێكەیتەوه ئازاری نادات.
- ئەوی له تاریكیدا سەما دەكا، كێ هەستی پێ دەكا.
- كەچەڵەو شانەی هەڵگرتووه.
- عەرەبی بەدو، پاش چل ساڵ تۆڵه وەردەگرێ دەڵێ: پەلەم كرد.

- کوونی دەرزی هیچ ناگرێت تەنها دەزوو نەبێت.
- ڕۆژوو بگرە و نوێژبکە، رزقت لە سەر خوا.
- ژنەکەم لە گەڵمدا بێت، هەموو جیهان بە پەنجەم دەسوڕێنم.
- پاش خراپ بوونی بەسڕە حەسرەت سوودی چیە.
- کەفالەت کردن، یەکەم یان پیاوەتییە، دووەمیان پەشیمانیە، سێیەمیان غەرامەیە.
- ئەوەی هاتە ماڵەکەت پێویستە خزمەتیان بکەیت.
- جگەرە کێشان لە سەرەتاوە (بسم الله) ی لێ ناکەی، لە کۆتایشدا (الحمد لله)ی لێ دەکەی.
- دیواری نزم هەموو کەس بە سەریدا باز دەدا.
- ئەی ئەو کەسەی لە سەفەر هاتیتەوە، ئەگەر بەردێکیش بوو بیهێنە.
- ڕۆژوو بە بێ نوێژ، وەکو شوان وایە بە بێ دار.
- هاوسێکەت حەجی کرد، دەرگای ماڵەکەت بڕازێنەوە.
- ئەگەر گەورە بوویت، لە کەس زوڵم مەکە.
- گۆزەیەك ئاو، ئاگرێك ناکوژێنێتەوە.
- من میر و تۆ میر، کێ کەرەکە لێ بخوڕێ.
- ئەگەر فیل مرد، ئێسکەکەی بە پەیکەر دەکەن.
- ئەوەی لە برایەکی بێ عەیب بگەڕێ، بە بێ برا دەمێنێ.
- تەماع کاری زەرەرو سوودی نیە.
- ئەوی گورگ نەبێ گورگ دەیخوا.
- رەخنە، سابوونی دڵە.

# لە وتەکانی ( ئەرمنی )

- خزمەکاری ڕەزیل دەوڵەمەند دەبێ.
- ئەو کەسەی بخنکێ، بە پوشێکدا خۆی هەڵدەواسێ.
- کڕین و فرۆشتن، باوکیان ناناسن.
- ئاکاری باش خۆی ڕازاندوەتەوە بە مرواری.
- ئارەزوو ئەو زەرگەشە زێڕینەیە لە ژیاندا.
- ئاگر بەر بوون بەتف ناکوژێتەوە.
- دەنگی گەل لە دەنگی تۆپ بەهێزترە.
- تەنهایی تەنها بۆ خوایە.
- سەگەکان لە گەڵ یەکدا شەڕ دەکەن، بەڵام بەرامبەر بە گورگ یەکدەگرن.
- گورگ هێرش دەباتە سەر ئەو سەگەی کە ناوەڕێ.
- یاسا بۆ دەوڵەمەند دانراوە و سزاش بۆ هەژار.
- سامان، سامان ڕادەکێشێ.
- سامان پێ بە شەلەکان دەدات و جوانی بە ناشرینەکان و فرمێسک گرنگ نیە.
- هەموو کەس دار دێنێ بۆ ژێر قازانەکەی.
- خوا لە بەرزای، سامان لە ئەرز.
- برادەری بپارێزە، ئەگەر لە ناو ئاگریش بیت.
- ئەوەی ڕێزی خۆی نەگرێ، ڕێزی ناگیرێ.
- مشك، هەر مشکی دەبێ.
- ئەوەی خۆی بە گەورە بزانێ، سەگ دەیخوا.
- جولانەوە بەرەکەتە.
- منداڵ میوەی دڵە.
- هەموو خۆرێك ئاوا بوونی هەیە.

- گلەیی کردن لە برا، لەوە باشترە وونی بکەی.
- هەندێ برا هەیە لە دایك تۆ نەبووە.
- لە پیاوی کەر بترسە ئەگەر شمشێری بە دەستەوە بوو.
- گەورەی میللەتێك خزمەتکاریانە.
- خۆشەویستت بۆ شتێك کوێرو کەڕت دەکا.
- ئەمڕۆ مەیە سبەی ئیشە.
- بێدەنگی برای رەزابوونە.
- ئازاد ئازادە هەرچەندە زەرەری کردبێ.
- هاوسێکەم فرۆشت بەڵام خانۆکەم نەفرۆشت.
- ژن، وەکومانگ وایە، جارێ رەنگی زیوە جارێ رەنگی زێڕ.
- چێشتخانەی بچووك، ماڵێکی گەورە دروست دەکات.
- ژنەکەت بە چاوی پیر هەڵبژێرە و ئەسپەکەت بە چاوی گەنجێك.
- ئەگەر سینگم تەنگ بوو، چی سوودی هەیە بە گەورەیی جیهان.
- دزەکە لە یەك دزی زیاتری نەکردووە، ماڵ دزراو سەد دزی کردووە.
- دوور نییە دایك سزای منداڵەکەی بدات و لێی بدات، بەڵام ئەوەنـەی پێناچـێ زۆر ماچی دەکات.
- هەر لەو گوڵە مێشهەنگ، هەنگوین دروست دەکات و ماریش ژەهر.
- گوڵی شاخەکان جێگای خۆیان جێناهێڵن بۆ گەڵی باخچەکان.
- بەردی لوس لە سەر ئەرز نامێنێ.
- هەتیوو فێری گریان مەکە.
- ئەوی دڕك بنێژێ، ترێی دەست ناکەوێ.
- سەخاوەت عەیبەکان دادەپۆشێ.
- هەموو باڵندەیەك بە گوێرەی رەنگی خۆی دەبێ.

- هەندێ شەڕ لە هەندێ شەڕ باشترە.
- ئاگاداری ئەو کەسەبە چاکەت لە گەڵیدا کردووە.
- لێدانی زمان وەکو لێدانی رمحە.
- خۆشترین شت بۆ مرۆڤ ئەوەیە کەلێی قەدەغە دەکرێ.
- هەڵە خواردنی نارەحەتە.

# لە وتەكانی (ئەفریقی)

- ئەوەی لەشی باش بێت، بۆ پزیشك ناگەڕێ.
- بزن لە كوێ بەسترایەوە دەبێ لە وێ بلەوەڕێ.
- ئەوەی سەری مار ببڕێ لە شەكەی وەكو پەت دەبێ.
- مەڕی هەژار قەڵەو نابێ.
- ژیر بە كراسەكی ناناسرێ بەڵكو بە پیشەكانی.
- ئەوەی هەمیشە دەیڵێ كەچی نایكات.
- قسەی زۆر گوێ كەڕ دەكات.
- جێگەی قەمچی دەرواو نامێنێ، بەڵام ئاساواری جنێو دەمێنێ.
- لە هەموو وڵاتان بریسی تر، وورگی مرۆڤە.
- ئەو چۆلەكەیەی زۆر دەخوێنێ، نازانێ هێلانەكەی دروست بكا.
- ناوی منداڵ پێش لە دایك بوونی مەنێ.
- كە پیر بووین، ئەو دارەی لە گەنجیمادا كۆمان كردەوە، ئێستاكە خۆمانی پێ گەرم دەكەینەوە.
- ئێش بكە وەكو كۆیلە، بخۆ وەكو پیاوی گەورە.
- ئەوەی لە خوا بترسێ، لە مرۆڤ ناترسێ.
- خۆین بە ئاو نابێ.
- خۆشەویست گرانە، مردن گرانترە.
- ئەوەی پاڵبداتە دارێكی گەورەوە، خۆی هەمیشە لە سێبەریدا دەبێ.

# لە وتەکانی (ئەنتیلیە)

- ئەگەر دەبینی مراوی چی دەخوا، هەرگیز گۆشتیت نەدەخوارد.
- چەندە دار ئازاری هەیە، بزماریش ئەوەندە.
- دەریا خۆی هەڵناکێشێ لە بەر ئەوەی ئاوەکەی شوێرە.
- ماسییەکی بچووکت هەبێ باشترە لە کەڵەشێرێکی حەبەشی قەڵەو لە لای یەکێکی کە.
- پێش ئەوەی دەنکە شخاتەکەت بکوژێنیتەوە، بزانە مۆمەکەت داگیرساوە.
- ئەگەر پشیلە نەبوو، مشکان ئاهەنگێکی سەما دادەمەرزێنن.
- دەتوانی بە زۆر کەر لە ئاو بپەڕێنیتەوە، بەڵام ناتوانی بە زۆر ئاوی بدەیتێ.

# لە وتەکانی (ئێرلەندە)

- هەور نەبووایە، خۆشی خۆرمان نەدەزانی.
- شێرێك لە بەر دەمتا باشترە لە سەگێکی خایەن لە پشتەوە.
- هێلانەی بچووك لە هی گەورە باشترە.
- مردن هەرگیز دووا ناکەوێ.
- مانگا بکە کۆشکێکەوە، بەرەو تەویلە رادەکا.
- خۆشەویستیت بە ژنەکەت بدە، نهێنییش بە دایك و باوکت.
- ئاگرێکی هێمنی و لە سەر خۆ گەرمت دەکاتەوە، باشترە لە ئاگرێکی گەورە و بەهێز بتسوتێنێ.
- سێ شت، هەرگیز دەست ناکەون، شیعر وتن، پیاوەتی، دەنگی خۆش.
- مریشکی ڕەش، هێلکەی سپی دەکا.
- هەموو سەگێك لە بەردەم ماڵەکەیدا ئازایە.
- دەوڵەمەند کات دەکوژێ، کاتیش هەژار دەکوژێ.
- بزن بزنە ئەگەر ئاورێشم لە بەرکا.
- سکی برسی بارێکی قورس هەڵدەگرێ.
- ئیشێك بەبێ پارە پیاو تەمەڵ دەکات.
- قەرزی کۆن باشترە لە ڕق و کینەی کۆن.

# لە وتەکانی (باسیکە)[١]

- پێویستە دەزووکە لە دەرزییەکە درێژتربێت.
- دەرزی کراسی هەمووان دەدوریّ خۆی رووتە.
- دیاری بەرد ورد و خاش دەکات.
- هیوا سەبری نابووتەکانە.
- هێرش بردن بەزەرەرەوە، نیوەی سەرکەوتنە.
- کێو پێویستی بە کێو نییە، مرۆڤ پێویست بە مرۆڤە.
- ئەوەی تف لە ئاسمان بکا بۆ دەم چاوی دەگەڕێتەوە.
- ئەگەر نهێنی لە سیّ گوێچکە تێپەڕیی، بڵاو دەبێتەوە.
- غورووری پەرە دەسێنیّ، بەڵام بەرناگریّ.
- باوە ژن تاڵە ئەگەر هەنگوین بێت.
- ئەو دەم و چاوەی هەرگیز پێناکەنیّ، ئەمە شاهیدی دڵێکی خراپە.
- ئەو دەوڵەمەندەی دەژی و برادەری نییە، وەکو ئەو پیاوەیە کە سەفەر دەکاو خەوتبیّ لە لێواری کەوتنێك.
- لە پاش چاك بوونەوە هەموو نەخۆشێك پزیشکە.
- ئەگەر خویّ نەبوو بۆ چێشت، بەهارات سوودی نیە.

---

(١) باسك: ناوچەیەکی فەرەنساو ئەسپانییە، لە سەر بەرە خوارەکەی شاخی (بیرنیە)ی باکور.

# لە وتەکانی (ئیسلەندی)

- لە مردنی یەکێك خێری یەکێکی تری تێدایە.
- ئەگەر خۆشەویست نەبوو، خۆشیش نیە.
- منداڵ لە سامان باشترە.
- نەفسی خۆت باشترین هاوسێی خۆتە.
- هەموو باڵندەکان هەڵۆ نین.
- ئاشتی نان دەدا، شەڕ سەفەر دەکا.
- تاوان تاوانێکی تر دادەپۆشێ، شانی بۆ شۆڕ دەکەین.
- جەماوەر دڕندەیەکە هەزار سەری هەیە.

# لە وتەکانی (مالغاشی)[١]

- دەوڵەمەندی ڕەزیل کۆڵێ هەڵگری دەست ناکەوێ، پاش مردنی نەبێ.
- باری مێرولەیەك یەك دەنکە برنجە.
- تیمساحی برسی خواردنەکەی هەڵنابژێ.
- خۆشەویست وەکو بنجی برنجە، لێرە هەڵیکێشە لە جێیەك دیکە بینێژە سەوز دەبێت.
- شەڕانی حەزی لە تارییکیەو تارییکایی کوێری دەکا.
- ماڵ کە گەرم دەبێ گەرمایییەکەی نییە، بەڵکو خۆشەویستی ژن و مێردەکەیەتی.
- بەردی خلەوە بوو ناوەستێتەوە، تەنها لە خوارەوە نەبێ.

---

(١) مالغاش: دوورگەیەکە لە (محیط الهندی) لە باشووری خۆرهەڵاتی ئەفەریقا سەربەستی وەدەس هێنا لە فەرەنسا لە ساڵی ١٩٦١پایتەختەکەی (ئەنتاناناتاریغۆ) زمانی ڕەسمی فەرەنسی و مالغاشییە.

## لە وتەکانی (مەجەڕ)

- ئەوەی دیارییەك قبوڵ بکا، سەربەرزییەکەی دەفرۆشێ.
- هەموو کەڵەشێرێك لە سەر زبڵ گەورەیە.
- ئەوەی زوو هەڵسێ زێڕ دەدۆزێتەوە.
- ماڵی حەرام لە کوێوە هاتووە دەڕواتەوە.
- لە خۆشەویستی ولە خەودا، هیچ شتێك کاری نەکردە نیە.
- مامە حەمەیی (المتملق) دوژمنێکی شاردراوەیە.
- لە چاو خەڵکیدا تاوانبار بێت باشترە نەك لە چاوی خودا.
- لە سەر خۆ بڕۆ بە دوور دەگەی.
- پاساری بە پەڕی دەناسرێ پیاویش بە برا دەرەکانی.
- منداڵی خۆشەویست ناوی زۆرە.
- ڕۆژەکەت پیرۆز مەکە تا خۆر ئاوا نەبێ.

## لە وتەكانی (مەدغەشقەڕ)

- وەڕینی سەگ نیشانەی ئازایەتی نییە، بەڵكو لە ترسدایە.
- دادوەر وەكو ئاگر وایە، لێی دوور بكەویتەوە ساردە، لێی نزیك بیتەوە گەرمە.
- قەرزاری دز دروست دەكات.
- ئەگەر ڕێنماییكەرت كوێر بوو، كۆتاییەكەت ناو چاڵە.
- پاشاو و وڵاتەكەی دەست دەكەوێ، میللەت سوخرەی پێ دەكرێ.

## لە وتەكانی (مەنغولیا)

- ئەو كەسەی دەرگاكەی باش داخات گەورەیماڵی خۆیەتی.
- بۆ ئەوەی بەرز دروست بكەیت، پێویستە تەمەڵەكەی قووڵ بێت.
- گورگ گورگە، ئەگەر مەڕەكانتی نەخواردووە.
- تەنانەت بە ئاوی لێڵیش ئاگر دەكوژێتەوە.

## لە وتەكانی (فلندیە)

- باران لە ئاسمان نامێنێ.
- داسێك لە زیو، گوڵی زێڕ دەبڕێتەوە.
- خخخۆشەویستی، باخچەیەكە لە گوڵ.
- دەوڵەمەند غەرامە بە پارە دەدات، هەژار بە پێست و پشتی.
- منداڵێك بە بێ باوك نیو هەتیوە، بەبێ دایك هەتیوی تەواوە.

## لە وتەکانی (ڤیێتنام)

- مرۆڤ سامانی دروست کردووە، سامان مرۆڤی دروست نەکردووە.
- (گا) ی بەستراوە حەزی لە (گا) یەك نیە کە دەلەوەڕێ.
- هەموو قازانێك سەرقاپی خۆی هەیە.

## لە وتەکانی (کەتەلۆنیە)[1]

- نانی مالّ باشترین نانە.
- هیچ نانێك لە کاتی برسێتیدا ڕەق نیە.
- میوەی زۆر لقی دارەکە دەشکێنێ.
- ئەوەی نوێژ نەکا خوا گوێی لێ ناگرێ.
- کاتی گونێمان دەبێ، گەنم نییە، کە گەنمان دەبێ گوینێمان نییە.

## لە وتەکانی (چیکوسلۆفاکیا)

- مالّی باش خۆی خۆی دەفرۆشێ.
- ئەگەر نەمسا نەبووایە، پێویست بوو لە سەرمان دروستی بکەین.
- ئەگەر مانگا نەبوو رێز لە بزن دەگیردرێت.
- بە گوێت مەکەرە، بە چاوت بکرە.
- یاداشتە خۆشەکان دەوام دەکەن، ناخۆشەکان زیاتر.
- ئازارو خۆشی لە یەك جێگادا دەخەون.

---

(١) کەتۆلۆنییە: ناوچەیەکە لە باکوری رۆژهەلاتی ئەسپانیا، قاعیدەیەکی (بەرشلۆنە)یە

- لاوێکی تەمەڵ، پیرە مێردێکی سواڵکەرە.
- بیری چاك و باش لە کاتی نەبوونەدا ئاوت دەداتێ، برادەرەکەیش لە کاتی پێویستدا دەیناسی.
- ئەو شوێنەی هەتاوی نەگاتێ، پزیشك دەیگاتێ.
- کراسەکەت لە شتەوە لە پاڵتۆکەت نزیك ترە.
- خۆ کراسەکەی لە ئاسنە.
- مانگێك چاوەڕێ بکە و شانازی بە ئەسپەکەتەوە بکە، ساڵێك چاوەڕێ بکە تا شانازی بە ژنەکەتەوە بکەیت.

# لە وتەکانی (بەلجیکا)

- قەفەسی جوان دان بە باڵندەکان نادات.
- پیاو ئەوە ژنەی یەدڵە کە خێری تێدایە، وەکو ئەو کەسەی هەر هیچی نیە.
- لە گرەودا لەویَ دووشت هەیە، شتێك و دزێك.
- بێدەنگی پیاو دەکوژێ، بەبێ ئەوەی دانی پێدا بنێ.
- هەموو بێزراوێك، شایەستەی لە سێدارە دان نیە.
- باش وایە خەڵکی ئاگاردار بکەیتەوە، نەك خەڵکی تۆ ئاگادار بکاتەوە.
- بەرد بە تەنها ناکەوێت.

# لە وتەکانی (حەبەشە)

- نیشتمانی ژن مێردەکەیتی.
- ئەستێرە بچکۆلەکان هەمیشە دەدرەو شێتەوە، لە کاتێکدا هەتاو بەو گەورییە جار جار دەگیرێ.
- ئەگەر دار دەسمەوەیە، بەڵام راستی لە دەممدایە.
- گوێ بگرە پێش ئەوەی قسە بکەیت، تیکەش بجوو پێش ئەوەی قوتی بدەیت.
- ژنێکی بەبێ مێرد ئەرزێکە بەبێ تۆو.
- خزمان و دەرمان لە کاتی تەنگانەدا پێویستت پێی دەبێ.
- ئەو قسەیەی لە دەممانەوە دەردەچێ، وەکو ئەوە وایە هێلکەیەك لە دەسمانەوە بەربێتەوە.

# لە وتەكانی ( سەنسكریتی )

- ئەو ژنەی مێردەكەی لە كیس چوو تەنانەت ناوی پیاویش ناهێنێ.
- سواڵكەر لە بەد بەختی ناترسێ.
- ئەو كەسەی گوڵ بچنێت، درك بە دەستیا دەچێ.
- خۆشەویستی تیمساحێكە لە ئاوی شەهوەتدا.
- ڕاستی یەك ڕەنگی هەیە، درۆ چەندەها ڕەنگی هەیە.
- ئەو شێتەی هەست بە شێتییەكەی دەكا، تا رادەیەك شێتە، بەڵام ئەو شێتەی خۆی بە ئاقڵ دەزانێ، ئەوە شێتی ڕاستییە.
- ژیانی پیاو تەماعە، ژیانی ژن پیاوە.
- بۆن، لەگەڵدایە، ڕۆن لە كەنجیدایە، ئاگریش بۆ دارە، بەم جۆرە زاناكان كەرۆح لە لەشدایە.
- ژنێكی منداڵ ئەوەماینە، پیرە مێردەكەی بەرەو قەبر دەبا.
- ئەو پیرە مێردەی ژنی منداڵ دەخوازێ، ژار دەنۆشێ.
- بێدەنگی نەزان و دانیشتنی لە نێوان ئاقڵاندا، جوانییەتی.

# لە وتەکانی ( لاتینی )

- بێ ئیشی دایکی هەموو رەزالەتێکە.
- زۆر جار ماف دەخەوێ بەڵام نامرێ.
- ئەو رق و کینەیەی ئاشکرا دەبێ تۆڵە سەندنەوەی نابێ.
- کاتی لێقەومان برادەر دەناسی.
- چەند حەزدەکەم لە دێیەکدا یەکەم بم ولە رۆما دووەم.
- هەر کەسێ یارمەتی تاوانبارێکی دا ئەویش تاوانبارە.
- ئەگەر برادەرت زۆر بوو، واتە تۆ دەوڵەمەندی.
- ژن، دەرگای دۆزخە.
- جل قەشە دروست ناکات.
- مردن هەموو خراپەکارییەکان دەسرێتەوە.
- ئازاری دەروونی، گرانترە لە هی لەش.
- درێژترین رێگا لە سەفەردا ئەوەیە کە لە دەرگاوە دەرچی.
- ئەگەر دەتەوێ ببیتە گەورە، پێویستە خزمەتکاریی بکەیت.
- خۆشەویست تێکەڵاوە لە هەنگوین و تاڵی.
- ماڵ و سامان، یا کۆیلەیە یا گەورەیە.
- ترس لە خراپی وامان لێ دەکا لە خراپترین شێوە.
- سەگ دەوەرێ، لە باتی ئەوەی گاز بگرێت.

## لە وتەکانی (کەمبۆدیە)

- زانست جێگەی زانایە، دارستان جێگەی پڵنگە.
- دوو دەستی ئازا سکێ تێریان هەیە.
- پێویستە دار نەبڕێتەوە چونکە میوەکەی دەخۆی.
- ژنی جوانی سەرنج راکێش مەیەڵە لە دواتەوە بڕوا، دوایی پێتەوە دەدات.

## لە وتەکانی (کۆرسێکی)

- ژنی جوان خەفەتی زیادە.
- ژن پیاو دروست دەکات، پاشان دەیخوات.
- لە سەر پێ ڕۆیشتن دوور دەخاتەوە.
- گەورەیەك لەدێیەکدا نەك کلکێك لە شاردا.
- هەموو کەسێ ئاوەکە بۆ ئاشەکەی خۆی دەبا.
- ئەوەی لە شوێنی سەمادابوو، پێویستە سەما بکا.

## لە وتەکانی (کۆری)

- ڕەخنە گری باش کرێکارێکی خراپە.
- لە کاتی درەوی زۆردا، هەژار شکاتی زۆر دەبێ.
- کاتێ پڵنگ نەما، کەروێشك پاشایە.
- شمشێرەکەت هەڵمەکێشە بۆ ئەوەی مێشوولەیەك بکوژی.
- ئەو (گا) یەی کە خۆر ئازاری داوە، کە مانگ ببینێ دەلەرزێ.
- ئەو شتە باشانەی کە هەمانە دەڵێن: هی خۆمانە، شتە خراپەکان دەڵێن: هی باپیرانمانە
- ڕەزیل، لە پاش مردنی خێری بۆ دەکرێ.

## لە وتەکانی (نەرویج)

- قسەی باش برسێتی تێرناکات.
- چەندە زانیاریمان کەم بکات، زۆر شتیش لە بیر ناکەین.
- لە خۆشەویستیدا هەڵبژاردن نیە.
- پیاوێکی ئازاد لە کویلەیەکدا، باشترە لە کۆیلەیەك لە کۆشکدا.
- لە ژێر شەپقە کۆنەکەتدا، ئەقڵێکی کراوە دەدۆزیتەوە.

## لە وتەکانی (نەغریسیا)[١]

- ئەو قەناعەتەی هەمانە بەشێکە لە بەختیاریی.
- مار هەر چەندە گەورەبێت بە دایکییەوە نادات.
- هەستی ئافرەت لە هەردوو مەمکی زیاتر بەرز نابێتەوە.
- ئافرەت ئاوێکی خۆشە، دەکوژێ و ئاوێکی قووڵە دەخنکێنێ.
- ئەو ماسییەی بە تۆڕەوە دەکەوێ، ئەو کاتە یاد دەکاتەوە.

## لە وتەکانی (یۆگۆسلافیا)

- ئەوەی ئیهانەی دەکەی لێی ئاگاداربە.
- خێزانەکەت لە کاتی دەرەوەدا هەڵبژێرە، نەك لە کاتی سەمادا.
- ژن هێنانی یەکەم هەنگوینە، دووەم مەیە، سێیەم کوپێ ژارە.
- ئاو زۆر شت دەشوات، تەنها زمانی پیس نەبێت.
- ئەسپی چاك عەیبی زۆرە، ئەسپی خراپ یەك عەیبی هەیە.

---

(١) نەغرۆس: دوورگەیەکە لە فیلیپین، دەکەوێتە باکوری رۆژئاوای (میندناو)

# نووسەر لە چەند دێڕێکدا

* محمد عبدالرحمن محی الدین زەنگنە.

* لە ساڵی ١٩٤٠ لە شاری کەرکوك لە دایك بوە.

* لە ساڵی ١٩٥٩ وازی لە خوێندن هێناوە، لەبەر ئەوەی میری ویستی بە هۆی رامیارییەوە بەندی بکات.

* لە ساڵی ١٩٥٩ یەکەم نووسینی لە گۆڤاری (هەتاو) ژمارە (١٦١) لە ١٩٥٩/٨/٣١ بە ناوی (کارمان ئەویَ نەك قسە)، بڵاوکردۆتەوە.

* لە ساڵی ١٩٧١وە تاکو ئێستاکە بەردەوامە لە نووسین و چاپ کردنی کتێبەکانی.

* لە ساڵی ١٩٨٢ دا خانەنشین کراوە، کە فەرمانبەر بوو لە (بانق)ی بەغا.

* لە ١٩٩٥/١/٦ لە کەرکوك بۆ هەولێر دەرکراوە.

* لە ١٩٩٥/٥/١ لە هەولێر بووەتەوە بە فەرمانبەر بەناونیشانی بەڕێوەبەری کارگێڕی و دارایی (مدیر الادارە و المالیە) لە بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری هەولێر و لە ٢٠٠/١٠/١٥ خانەنشین کراوە.

* خاوەنی دوو کوڕ و سێ کچە.

* دوو ساڵێك لە تەلەفزیۆنی کەرکوك بەرنامەی هەبووە بەناوی (لەگەڵ ڕۆشنبیراندا) لە ساڵی ١٩٨٦ تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٧.

* لە ساڵی ١٩٨٧ تاوەکو ١٩٩٥/١/٦ بەرنامەی هەبووە لە ئێزگەی ڕادیۆی کوردی بەغا.

* لـــه ســـاڵی ١٩٧٩– ١٩٨٠ بەڕێوەبـــەری لاپـــەڕەی (وەرزش و لاوان) بـــووە لـــە ڕۆژنامەی (هاوکاری) بەغا.

* له ١٩٩٣ تا ساڵی ١٩٩٥ پەیامنێری ڕۆژنامەی (العراق) بووە بە عارەبی و کوردی.

* ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کورد بووە لە بەغا.

* ئەندامی ڕۆژنامەنووسانی عێراقە.

* ئەندامی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کورد بووە لە بەغا.

# لە بڵاوکراوکانی نووسەر:

١- شانۆگەری (مان گرتن) ساڵی ١٩٧٩چاپی یەکەم، چاپخانەی (السندباد) بەغا، لە هەمان ساڵدا چاپی دووەم چاپخانەی (علاو)، بەغا، لە سەر شانۆ نمایش کراوە، لە هەڵەبجە و سلێمانی، هەرچەندە رەزامەندی سەندیکای کرێکارانی هەولێری هەبووە لە بەر ئەوەی رامیاری بوو تەلەفزیۆنی کەرکوك رەزامەندی نەدا بۆ تۆمارکردنی.

٢- مێژووی عەشیرەتی زەنگنە، ساڵی ١٩٨٠چاپخانەی (الاندلس) بەغا.

٣- شانۆگەری (وەلی دێوانەو شەم) ساڵی ١٩٨١چاپی یەکەم چاپخانە (دار القادسیة للطباعة) بەغا، چاپی دووەم، لە چاپخانەی (الحسام) بەغا، لە ئیزگەی کوردی بەغا بە (١٧) زنجیرە تەمسیلی تۆمار کراوە، لە دەرهێنانی (سەعید زەنگنە) بەندەش دەوری (مەلا یوسف) ی هەبوو، لە لایەن مامۆستا محەمەد سابیر ەوە وەرگێردراوەتە سەر زمانی عەرەبی و چاپکراوە بە ناوی (الدرویش وەلی وشم).

٤- وتەکانی ژیان – بەشی یەکەم، وەرگێران و ئامادەکردن لە گەڵ عەبدەللا عەبدولرەحمان زەنگنە، ساڵی ١٩٨٢چاپخانەی (دار القادسیة للطباعة) بەغا،

٥- وتەکانی ژیان بەشی دووەم، وەرگێران و ئامادەکردن، ساڵی ١٩٨٥چاپخانەی (مطبعة دار الجاحظ) بەغا.

٦- نەورۆزنامە، بەشی یەکەم، ساڵی ١٩٨٥چاپخانەی (مطبعة دار الجاحظ) بەغا

٧- شانۆگەری (باوەڕ) ساڵی ١٩٨٥چاپخانەی (مطبعة دار الجاحظ) بەغا.

٨- سنووقی پۆستە، دوو چیرۆکی جەلیل محەمەد قلی زادە، وەرگێڕان، ساڵی ١٩٨٥چاپخانەی (دار الجاحظ) بەغا.

٩- چیرۆك و ئەفسانە لە ئەدەبی کوردیدا، ساڵی ١٩٨٨چاپخانەی (الصقر) بەغا

١٠- شانۆگەری دایە من بووکە شووشە نیم، ساڵی ١٩٨٩چاپخانەی (دار الحریە للطباعة) بەغا لە رادیۆی کوردی بەغا بە (١٩) زنجیرە تەمسیلی ۆتۆمارکراوە، بەندە دەوری ئەحمەدی بینیوە.

١١- وتەکانی ژیان بەشی سێیەم، وەرگێڕان و ئامادەکردنی، ساڵی ١٩٩٠چاپخانەی (شرکه السندباد للطباعة)بەغا

١٢- وتەکانی ژیان بەشی چوارەم، وەرگێڕان و ئامادەکردن، ساڵی ١٩٩٧چاپخانەی (ماردین) هەولێر.

١٣- لە قسە خۆشەکانی کاك ئەحمەد خەتاب، ساڵی ٢٠٠٣چاپخانەی (الادیب) کەرکوك، چاپی دووەم ساڵی ٢٠٠٥ لە هەولێر چاپخانەی. شەهاب).

١٤- شانۆگەری (ماندانا وستافرۆب) نووسین (محی الدین زەنگنە) وەرگێڕان بۆ زمانی کوردی، مامۆستا (محی الدین زەنگنە) لە ساڵی ١٩٩٩بە عەربی بە چاپی گەیاندووە، لە لاپەڕە (٥) دا نووسیویەتی دەڵی (قدمتها اذاعة بغداد – القسم الکوردی – کدراما کوردیة مسلسلة فی اربعة عشر حلقة من ١٩٩٤/٨/٣-١٩٩٤/٨/١٥من ترجمة الآدیب محمد عبد الرحمن زنگنه – اخرج الفنانة انتصار جمال)

١٥- وتەکانی ژیان بەشی پێنجەم، ساڵی ٢٠٠٤چاپخانەی (الآدیب) کەرکوك.

١٦- وتەکانی ژیان هەر پێنج بەشەکەی، چاپی دووەم سالّی ٢٠٠٣چاپخانەی شەهاب، هەولێر. چاپی سێیەم، سالّی ٢٠٠٦چاپخانەی - ئۆفستنی گەنج - سلێمانی.

١٧- شانۆگەری (فەرهاد و شیرین) نووسینی نازم حیکمت، وەرگێڕان، سالّی ٢٠٠٦ چاپخانەی (شەهاب) هەولێر.

١٨- شانۆگەری (کوللە) محی الدین زەنگنە وەرگێڕان، سالّی ٢٠٠٦ چاپخانەی ئارابخا کەرکوك

١٩- شانۆگەری سنووقی پۆستە، لە دوو شانۆگەری پێکهاتووە، شانۆگەری سنوقی پۆستە و بەرخ، سالّی ٢٠٠٦چاپخانەی شەهاب، هەولێر.

٢٠- وتەکانی ژیان، بەشی شەشەم، وەرگێڕان و ئامادەکردن چاپخانەی شەهاب، سالّی ٢٠٠٧هەولێر.

٢١- گولّواژە، کۆمەلّێ شاعیر، چاپخانەی (ئەربخا) سالّی ٢٠٠٧ کەرکوك.

٢٢- ووتەکانی ژیان بەشی حەوتەم.

٢٣- نەورۆز نامە چاپی دووەم و زیاد کردنی (٢٥) شاعیری تازە.

٢٤- ووتەکانی ژیان هەر حەوت بەشەکەی.

٢٥- چیرۆك و ئەفسانە لە ئەدەبی کوردی دا سالّی ١٩٨٦.

٢٦- ووتەکانی ژیان -بەشی پێنجەم -سالّی ١٩٩٦.

٢٧- شانۆگەری (مانداناو ستافرۆب)نووسینی، محی الدین زەنگنە وەرگێڕان ئەم شانۆگەرییە لە سالّی ١٩٩٣ وەرم گێڕاوەتە کوردی - مامۆستا محی الدین زەنگنە،

لــە ســاڵی ١٩٩٩ دا بــە عــەرەبی بــە چــاپی گەیانــدووە لــە لاپــەڕەی (٥)پێــنج دا نووسیویەتی و دەڵێ: (قدمتها اذاعة بغداد —القسم الكردي —كدارما كردية مسلسة في اربع عشرة حلقة من ١٩٩٤/٨/٢ — ١٩٩٤/٨/١٥ من ترجمة الاديب محمد عبدالرحمن زەمكنە اخراج الفنانە (انتصار جمال).

## چاپکراوەکانی وەزارەت ساڵی ١٩٩٦

١- میکانزمە بنەڕەتی یەکانی ڕستە سازی.............. د.شێرکۆ بابان.
٢- سەعید زەبۆکی لای خۆمان.... ڕۆمان............. کەماڵ سەعدی
٣- البعد القومي للتغيرات في الحدود الادارية لمحافظة كركوك.. د.خليل اسماعيل.

## چاپکراوەکانی وەزارەت ساڵی ١٩٩٧

١- کاولاش.... ڕۆمان............................ عبدالله سراج
٢- مەم و زین.................................. علی فتاح دزەیی
٣- پشکۆو خۆڵە مێش............................. ئازاد عبدالواحد
٤- دەردە کورد.................................. محمود زامدار
٥-باڵەبان...................................... وریا احمد
٦- چیرۆکی فولکلۆری............................ محمد رشدی دزەیی
٧- کوردستانی خوارووی ڕۆژهەلات.................. د.ڕەشاد میران
٨- ووشەو زاراوەکانی بابا تاهیر..................... د. محمد نوری عارف
٩- حەمە دۆك.................................... یشار کمال
١٠- کورتیەك ژدیروکا نقیانووسا..................... د.بێوار خسنی
١١- ڕۆمانی درز.................................. کاکە مام بۆتانی
١٢-ارض الاجداد. شیعر سریانی..................... گۆرگیس یوسف
١٣- کورسی کورسی................................ نجات ڕەفیق حلمی
١٤- ئول و فەلسەفەیا زەردەشت...................... میرال زیلانی
١٥- ئەفسانەی تۆفانی سۆمەری........................ نجم خالد
١٦-دەروێشی عبدی.............................. شاکر محمد امین ڕۆژبەیانی
١٧- مەولود نامەی کوردی........................... ڕەشاد محمد موفتی
١٨- ووتەکانی ژیان. بەشی چوارەم.................... محمد عبدالرحمن زەنگنە

# ناوەرۆك

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |